# دیوان



خاڵە سێوە
لە دۆسیەی (دیوان)دا

گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی گشتییە، ناوەندی هەولێری مەکتەبی ڕاگەیاندنی ی.ن.ک دەریدەکات
ژمارە (٣١) - کانوونی یەکەمی ٢٠٢٣ی زایینی - بەفرانباری ٢٧٢٣ی کوردی

- گفتوگۆی ئەمجارە، لەبارەی دەروونشیکاریی و فرۆیدزمەوە لە نێوان سمکۆ محەمەد و محەمەد تەها حوسێن
- ڕۆڵی قوتابخانە ئایینییەکان و سیستەمی خوێندنی فەرمی لەکوردستانی باشوور
- عەبدوڵڵا پەشێو و دکتۆر نەجمەدین جەباری، لە دوو دیداردا
- نمایشی میوانێکی دوور، لەبەر ڕۆشنایی تیۆری وەرگرتندا
- عەلی سەیدۆ گەورانی، یەکێکە لە کەسایەتییە ناودارەکانی کوردانی ئوردن



## جەلیل کاکەوەیس:

هەموو مرۆڤێک، ئەگەر تۆزێ فام بکا، هەستێکی چەپایەتی هەیە

# خالید دلێر

١٩٣٣– ١٦–٢٠١١/١٢/١٧



## ئەی قومری

ئەی قومری بۆ ئەگری؟
سەرم سوورماوە قومری بۆ ئەگری؟
بێباک دێیت و هەڵئەفڕی - بۆ ئەگری؟
*****
دووری لە ئازاری دەس - بۆ ئەگری؟
دووری لە داو و قەفەس - بۆ ئەگری؟
لەگەڵ گوڵ هاوڕێنە و کەس
فرمێسکی چاوی ئەسڕی
بۆ ئەگری؟ بۆ ئەگری؟ بۆ ئەگری؟
****
من کە دەم پڕ لە سکاڵام - بۆ ئەگری؟
لەم ژیانەی لە ناوام - بۆ ئەگری؟
بەڵام بڕوا و هیوام
ڕێگەی بێزاری ئەبڕی
بۆ ئەگری؟ بۆ ئەگری؟ بۆ ئەگری؟
*****
گریان چاری دەرد نیە - بۆ ئەگری؟
چەکی ڕێی نەبەرد نییە - بۆ ئەگری؟
دوور لە خەوش و گەرد نییە
ڕێی ورە بەردان بگریی
بۆ ئەگری؟ بۆ ئەگری؟ بۆ ئەگری؟

**ئەو ئێوارەیە چوومە دەرەوە، بەرەو باخچە و باخی (ئومرەبیعەین) ڕێگەم گرتەبەر، مانگە شەوێکی خۆشبوو، نیگایەکم لەسەر وەزنی ڕۆیشتنەکەم وەرگرت، دەستم بە دانانی ئاوازی شیعری (ئەی قومری) کرد، تا گەیشتمە بەنزینخانەکەی سەرووی (تەپەی مەلا عەولا) لەوێ شیعر و ئاوازەکە تەواوبوو، بۆ ئەوەی شیعر و ئاوازەکەم بیر نەچێتەوە، هەر لەبەر خۆم دەمگوتەوە.**
**بۆ یەکەمجاریش لە ساڵی 1958 لە رادیۆی کوردی لە بەغدا تۆماری کراوە و لە نەورۆزی هەمان ساڵ بۆ یەکەمجار پەخش کراوە.**

**خالید دلێر**

# دیوان

سەرنووسەر
سمکۆ عەبدولکەریم

گۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی گشتییە
ناوەندی هەولێری مەکتەبی ڕاگەیاندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان دەریدەکات

خاوەن ئیمتیاز
مەسعودی مەلا هەمزە

بەڕێوەبەری نووسین
محەمەد گۆران

ژمارە (٣١) کانوونی یەکەمی ٢٠٢٣ زایینی - بەفرانباری ٢٧٢٣ کوردی


## گۆڤاری دیوان بەردەوامە

لەگەڵ کۆتایی هاتنی ساڵی ٢٠٢٣ ژمارە ٣١ی گۆڤاری دیوان-یش دەردەچێت. لەوماوەیەدا بە پشتبەستن بە هەموو ئەوانەی گۆڤاری دیوان-یان بەهی خۆیان زانیوە، توانیومانە بەردەوام بین.
ئێمە کاتێک شانمان دایەبەر، میدیای کاغەز لەپاشەگەردانی دابوو، ڕۆژبەڕۆژ بێ هیوایی زیاتر دەبوو، لەبەر ئەوەی تەکنەلۆژیا بەشێوەیەک باڵی بەسەر بیر و زەین و تواناکانی مرۆڤدا کێشابوو، هی ئەوە نەبوو، لەبەرانبەریدا جۆش دانەمێنێ.
ئێستەش ڕۆژ نییە، لە بوارە جۆراوجۆرەکانی تەکنەلۆژیادا، داهێنان و ئەزموونێکی نوێ نەخرێتە ڕوو، کە دواهەمینیان زیرەکی دەستکردە، کە لە ساڵی ٢٠١٧وە هێواش هێواش تەکان دەدا و هەموولایەکی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردووە و هەمووانی خستووەتە بەردەم تێگەیشتن و بیرکردنەوەیەک، کە پێدەچێ دواجار ببێتە هۆی گۆڕانکارییەکی گەورە لە پەیوەندیی مرۆڤ بە شارستانییەت، مەعریفە و سیاسەتەوە، ئەمەش وادەکات جیهان پێبنێتە قۆناغێکی نوێ و تەواوی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بگۆڕێت.
لەم سۆنگەیەوە، ئێمە چۆن دەتوانین بەردەوام بین؟ چۆن وابکەین نەکەوینە ژێر ئەوکاریگەرییە خێرایەی تەکنەلۆژیا، بە پێچەوانەوە وابکەین تەکنەلۆژیا بخەینە ژێر ڕکێفی خۆمان.
بە ئاوڕدانەوە لە ڕابردوو دەرکەوتووە هیچ شتێک شوێنی ئەوشتەی پێش خۆی ناگرێتەوە، هێندە هەیە بۆ ماوەیەک مرۆڤ مەست دەبێ و بیر لە ئایندەی خۆی دەکاتەوە، بیر لەوە دەکاتەوە چۆن ئەو تەکنەلۆژیایە بکاتە پاڵنەرێک بۆ پێشخستن و گەشەپێدانی تێگەیشتن و دونیابینی خۆی، وەک ئەوەی دەبینین، ئێستە زۆر ئاسان و خێراتر دەستمان بەسەرچاوەکانی مەعریفە دەگات، بۆ ئەوەی بەپێی پێویست هەڵسووکەتی لەگەڵدا بکەین و بتوانین جارێکی دی ڕۆح وەبەر ئەو تەکنەلۆژیا بێ گیانە بێنینەوە، کە خەریکە هەموومان بێ گیان دەکات.
چونکە وەک دەرکەوت، تەکنەلۆژیا نەیتوانی ئەو چێژەی مرۆڤ لەبەرەبەیانی مێژووەوە عەودالیەتی پێی ببەخشێتەوە، بەومانایەی لایەنێکی گرنگی مەعریفە چێژبینینە لە هەموو شتێکی داهێنراو، وەک چۆن ئێستەش زۆر لە خوێنەواران ئەو چێژەی لە خوێندنەوەی کاغەزیی دەیبینن لە خوێندنەوەی ئەلیکترۆنی نایبینن.
ئەمە پاڵنەرێکی زۆرباشە بۆ ئەوانەی هێشتە دەستبەرداری مەعریفەی کاغەزیی نەبوونە و سەرسەختانە بەرگری لە مانەوەی میدیای کاغەزیی دەکەن.
ئێمە ئەگەر لەو زیرەکییە دەستکردەی، کە بەرهەمهێنراوی زیرەکی سرووشتیی مرۆڤە کەڵک وەربگرین، دەتوانین ئایندەی مرۆڤایەتی لەوەها ڕووداوێک قورتار بکەین، کە لە سەدەکانی پێشوو، هەندێک لە شارستانییەتەکان دووچاری هاتوون و بەوهۆیەوە بۆ دەیان و سەدان ساڵ کەوتوونەتە نێو تاریکایی مەعریفە و شارستانییەت و لەمێژووشدا بە سەدەی تاریکی تۆمارکراوە.
بەهیوای ساڵێکی نوێی پڕ خێر و بەرکەت

سەرنووسەر


هەولێر - شەقامی ١٠٠ مەتری نزیک کۆلێژی دەرمانسازی
govaridiwan@gmail.com
(گۆڤاری دیوان) لەتیلیگرام
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
دیزاین: ئاسۆ حەسەن ئەحمەد (٠٧٥٠٤٤٧١٨٢١)
سەرپەرشتیاری چاپ: مەهدی ئەحمەد حوسێن (٠٧٥٠٤٥٥٠٢١٣)
چاپخانەی ڕۆژهەڵات - هەولێر (٠٧٥٠٤٤٩٥٦٥٤ - ٠٧٧٠٤٤٩٥٦٥٤)

## لەم ژمارەیەدا

# دۆسیە

# سێوە

# ١٩٦٤/١٢/٩ - ١٨٩١

سێوە مەقامبێژێکی هونەرمەندی کورد بوو، لە مەقام گوتندا، خاوەنی ڕێبازێکی هونەریی تایبەتی بوو، هەستێکی مۆسیقای ناسکی هەبوو، لەکاتی گۆرانی گوتندا، بە چاکی لەگەڵ مۆسیقادا دەڕۆیشت و دەیزانی لە کوێوە دەست پێ بکا و لە کوێش بوەستێ. دەقی ئەدەبی و ئاوازی مەقامەکانی لە سەرچاوەیەکی پاک و سازگاری کوردەوارییەوە هەڵقوڵاون.

کەریم شارەزا



# ئەوەڵ سەحەرە

سەحەر سەدای منی غەریبە ماری
وەزی هەر گێڕم
ئەگەر فەقێیان لە مەدرەسان دەخوێنن
ئەمن بەبێ برین خوێنێ دەڕێژم
گەلی برادەرینە ئەمن هەرچەندی دەکەم
لەوێ کۆنە دنیایێ
قاسیدەکی بە متمانیم بەدەست ناکەوێ
بینێرمە کن بەژنێ باریک و دوو چاوی بەرەک
ڕاستی درێ خۆمی لەبۆ ببێژم
وەیلێ سەحەرە

* * *

دەرکی وان شانشینان دوو دەرییان
پەنجەرە و حەسارگان هەرەنگێون
تاکوو چارێگە شەعاتەکی لنی بێتن عەکسی بخوورێ
ئەگەر شەمس موغابرا
چرا دادەگیسێتن لەسێبارەکی نوورێ
گەلی برادەرینە
ئەمن دەست لەسەر بەژنی باریک و
دوو چاوی بەرەک هەڵناگرم
هەتا حەزرەتی ئیسرافیل نەداتن لە
نەفخی سوورێ
مەنسووری هەلاج تەقەی دێ لە
کەوانی
حەزرەتی مووسا هەزار و یەک
کەلیمەی دەکاتن
لەگەڵ باری تەعالا لەسەر
کێوی توورێ
وەیلێ سەحەرە

*** ئەمە چەند کۆپلەیەکی ئەو مەقامەیە، کە لە کتێبەکەی کەریم شارەزا وەرگیراو.**

گۆرانییەکە لەسەر ئاوازی مەقامی عەجەم دەگوترێ. مەقامێکی شارستانییە و لە ژیان و هاتوباتی ناو شار و بازرگانێتی سەردەمێکی زوو دەکات. دانەری دەقی مەقامەکە تا ڕادەیەک ڕۆشنبیر بووە و ئاگاداری کەلەپوری ئیسلامەتی و نەتەوایەتی کورد بووە.
تابلۆی شیعری جوان و وێنەی هونەریی ناسکی تێدا کێشراوە- کەریم شارەزا



# چەند سەرنجێک لە بارەی ژیان و کەسایەتی سێوەی هونەرمەند



د. هاوژین صلیوە

مرۆڤ جگە لە توانایی و بەهرەی زگماک کەشوهەوا و دەورووبەر کاریگەرییەکی زۆری دەبێت بۆ پێشکەوتن و گەشەکردنی بەهرەکانی. شاری کۆیە بەدرێژایی مێژوو لانکەی شارستانیەت و شوێنی مەدرەسەی ئایینی، بە مەسیحی و موسوڵمان و ئایینەکانی تریش بووە، لەڕووی هونەرییەوە پێشینەیەکی لەمێژینەی هەیە، بەتایبەتی لە سەردەمی ئەمیناغەی ئەختەر (١٨٨٧.١٨٣٩) کە کەسێکی ئەدەب دۆست و هونەر دۆست بووە، دیوەخانەکەی مەڵبەندی پێگەیشتنی چەندان هونەرمەند بووە و مەقام و گۆرانییان لێ گوتووە، بەحوکمی ئەوەی کۆیە سەرەڕێی بازرگانی بووە، بۆیە لە زۆر شوێن ڕوویان تێکردووە و تێیدا ماونەتەوە و گۆرانیی و مەقامات لە دیوەخانەکان گوتراوە، ئەو جموجۆڵە هونەرییە هەبووە. مەربینی مەقامبێژ هاوتەمەنی ئەمیناغای ئەختەر بووە و لە دیوەخانەکەی مەقامی چڕیووە، دوای مەربین، حەنیل، کە ناسراوە بە (حەنیلە خڕە) جێی مەربینی گرتۆتەوە، ئەویش کەسێکی بەتوانای ئوستادی مەقامات بووە، لەسەردەمی حەنیل، سێوە دەنگ و ڕەنگی هەبووە، بەڵام دوای مردنی حەنیل و تۆمارکرنی پێنج لە قامەکانی لە بەغدا زیاتر ناوبانگی سێوە بەدەرکەوت. واتا: مەبین، حەنیل و سێوە سێکوچکەی ئوستادی مەقاماتن لە نێو مەسیحییەکانی کۆیە، دیارە ئەو سێ کەسەش کاریگەریی کۆمەڵی کەسی دیکەیان بەسەرەوە بووە، لە دوای خۆشیان کاریگەریی زۆریان بەسەر، میناسی مەربین، مەربینی قەشە گورگیز، میخەی یووسفی هەرمۆتەیی، شەماشە شەعیا، مەربین صلیوە، سەلاح محەمەد کۆیی و چەندانی دی هەبووە.

ڕەوانشاد کەریم شارەزا، ڕۆڵێکی گەورەی هەبووە لە پاراستن و ئەرشیفکردنی زۆر زانیاریی لەبارەی سێوەی هونەرمەند، ناوبراو لە ساڵی ١٩٨٢ کتێبێکی ٩٦ لاپەڕەیی بەناوی (مەقامەکانی سێوەی هونەرمەندی کورد لە تەرازووی ڕەسەنایەتی) چاپ کردووە، کە ئەوکات هەمووی هەژدە ساڵ بووە سێوەی هونەرمەند کۆچی دوایی کردووە.

مامۆستا کەریم شارەزا چاوپێکەوتنی لەگەڵ دەیان کەس کردووە و زانیارییەکانی تۆمارکردوون، خۆشی سێوەی هونەرمەند و تەنانەت جارێکیان پێی گوتم کە لە ساڵی ١٩٤٥ حەنیلە خڕەشی بینیوە، بۆیە زۆر شارەزایانە و جوان کتێبەکەی نووسیوەتەوە. من نامەوێ زانیاری نێو ئەو کتێبە بخەمەوە ڕوو، بەڵکوو دەمەوێت لەچەند گۆشەنیگایەکی خۆمەوە زانیاریی ببەخشم، هەڵبەتە زۆرجار بە پشتبەستن بە وتەکانی نێو کتێبەکەی شارەزا، کە بۆتە بنەوانگەی من بۆئەوەی بتوانم زانیاریی دیکەی لێ هەڵێنجم.

> لەسەردەمی حەنیل، سێوە دەنگ و ڕەنگی هەبووە، بەڵام دوای مردنی حەنیل و تۆمارکرنی پێنج لە قامەکانی لە بەغدا زیاتر ناوبانگی سێوە بەدەرکەوت

مامۆستا کەریم شارەزا لە کتێبەکەی ئاماژەی بەوە کردووە، کە لە خۆشەویستییان، بەسێوە بانگیان کردووە، کە خۆی ناوی صلیوە بووە. تەنانەت لەسەردەمی سێوە شەماشە سێوەیەک هەبووە لە کڵێسەی کۆیە خزمەتی کردووە، ڕایەکەی مامۆستا بە پەسەند دەزانم، بەڵام بۆچوونێکی دیکەشم هەیە، پێش سێوەی هونەرمەندیش، چەند صلیوە ناوێک هەبوونە، بەسێوە بانگ کراون، ناوی صلیوە ناوێکی سریانییە بە واتای (صلیب)ی عەرەبیی و خاچی کوردیی دێت. ناوەکە بۆ کوردزمانێک لەسەر زاران قورسە، بۆیە ناوی صلیوە گۆڕاوە بۆ سێوە، چونکە زۆر جار صلیوە دەکەنە سڵێوە بۆیە دەنگی (ڵ)لەبەین چووە و سێوە ماوەتەوە و لەسەر ئاوازی صلیوەیە. تەنانەت دوای سێوەش لە هەرمۆتە و نێو کۆیەش صلیوە ناو هەبووە، بەسێوە بانگیان کردوون، بۆنموونە (صلیوە سلێمان)ی هەرمۆتە، بەسێوە



بانگیان دەکرد.

مامۆستا کەریم شارەزا دەڵێت: سێوە لە ساڵی ١٨٩١ لە دایکبووە، لە سجلی ناوەمۆری (تعمید)ی کڵێسەی کۆیە و هەرمۆتە گەڕام، چونکە هەموو مەسیحییەک، کە لە کڵێسە تەعمید دەکرێ ناوی لە پەڕاوی ناوەمۆر دەنووسرێ، بەڵام ئەو پەڕاوە مۆرانەی لە کڵێسەی هەرمۆتە ماون لە ساڵی ١٩١٩ دەست پێدەکات، هی کۆنترمان نییە، ساڵی ١٩٦٣ بەهاتنی حەرەس قەومییەکان کەنیسەی هەرمۆتەیان تاڵان کردووە و دەستنووس و زۆر شتی بەکەڵکی تێدابووە بردوویانە، بۆیە سجلی مۆری قەدیم نەماوە.

سێوە لە تەمەنی منداڵییەوە خراوەتە بەرخوێندن و لە کڵێسە خوێندوویەتی و بووە بە شەماس، شەماسی کڵێسە دەنگی خۆش بێ یان ناخۆش بێ، کۆمەڵێ ئەرکی بەڕێوەبردنی قوداسی یەکشەمان و بۆنەکان و جێژنەکانی دەکەوێتە ئەستۆ، بەتایبەتی خوێندنەوەی ئینجیل و چرینی کۆمەڵێ تەرتیلەبیاییینی بە مەقام، سێوەش دەنگی خۆش بووە، کڵێسە ئەم ڕۆڵە مەزنەی هەبووە، کە وای کردووە سێوە شەرمی بشکێت و دەنگی زیاتر تاقی بکاتەوە و تەمرین بە قورگی بکات و مەقامەکان بچڕێت، کاتێک کە سێوە عاشقی واری دەبێت و نایدەنێ ئێدی ئەو بەهرە و دەنگە خۆشەی هەیبووە لە چوارچێوەی کڵێسە هێناویەتییە دەری و گۆرانیی چڕیوە و سوودی لە ئاوازەکانی نێو کڵێسە بینیوە، وەکو گوتمان شاری کۆیەش لەبار بووە، بۆ پێشکەوتنی ئەم بەهرەیەی، بەهۆی بوونی حەزی هونەریی و کۆمەڵێ دیوەخان و دواتریش دامەزراندنی تیپی مۆسیقای باواجی لەساڵی ١٩٥٧ لەلایەن مامۆستا ئەندراوس خەمۆ (باکووریی) ئەمانە زۆر هاندەری سێوە بووینە.

مامۆستا کەریم شارەزا ئاماژەی بەوە کردووە، کە سێوە مەقامی زۆری زانیوە لە کتێبەکەشی نووسیویەتییەوە، بەڵام کاتێک سێوە ساڵی ١٩٥٢ چۆتە بەغدا تەنیا پێنج مەقامی تۆمار کردوون، کە قەوانێکیان لەکارکەوتووە، کەواتە تەنیا چوار مەقامی تۆمارکراوی هەنە.

**"صلیوە ناوێکی سریانییە بە واتای (صلیب)ی عەرەبیی و خاچی کوردیی دێت. ناوەکە بۆ کوردزمانێک لەسەر زاران قورسە، بۆیە ناوی صلیوە گۆڕاوە بۆ سێوە"**

مامۆستا کەریم شارەزا جارێکیان لە دانیشتنێکدا گوتی: ((ئێستەش ئەو قەوانە لەبەغدا ماوە و پارێزراوە)) هەڵبەتە ئەگەر ئەم قەوانە مابێ دەکرێ لەڕێی وەزارەتی ڕۆشنبیرییەوە بەدواداچوونی بۆ بکەن و بیهێنرنە وڵاتانی دەرەوە، بەڵکوو ئەوان بتوانن دەنگە تۆمارکراوی سەر قەوانەکە زیندوو بکەنەوە.

هەر سەبارەت بەم چوار مەقامەی لەبەردەستمانە دەتوانم چەند سەرنجێک بخەمەڕوو لەوانە: مەقامەکانی سێوە لەڕەسەنایەتییەوە هەڵقوڵاون بە دەنگێکی خۆش گوتراون، دەقەکان دەقی بەرز و ئاست قوولن، ئەگەرچی تەکنەلۆژیای ئەوکاتە بەم شێوەیە نەبووە.

سێوە لەساڵی ١٩٥٢ ئەم مەقامانەی گوتووە، واتا ئەوکات تەمەنی شێست و یەک ساڵ بووە، ئەی ئەگەر لە تەمەنی سی ساڵی، یان چل ساڵی بیگوتایە چۆن دەبوو؟ سێوە بە پاسی تەختە و بە قوربەسەری یەک جار دەچێتە بەغدا و ئەو چەند مەقامە تۆمار دەکات، ئەی ئەگەر چوار پێنج جاری دی بچووبوایە و بیست سی مەقامی تۆمار بکردایە دەبووە چ مەدرەسەیەکی گەورەتر؟ چونکە کاتێک حەسەن زیرەک لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی بیست لە بەغدا بووە، بۆی هەبووە هەفتەی دوو گۆرانیی تۆمار بکات، بۆیە دەتوانم بڵێم ئەوکاتانەی حەسەن زیرەک لە ئێران و لە عێراق کە لە ڕادیۆ ئیشی کردووە توانیویەتی بەسەدان گۆرانیی تۆمار بکات، بەهەمووی نزیکەی دەساڵ بە بەردەوامی گۆرانیی لە ڕادیۆکان تۆمار کردووە. بۆیە هەلی تۆمارکردن لەوکات زۆر گرنگ بووە. کە ئەم هەلەش بەر هەموو هونەرمەندێک نەکەوتووە.

ئاوازی مەقامی سەحەرە ڕێک ئاوازی تەرتیلەی (قوم شەپیرە) کە لە کڵێسەی کۆیە و هەرمۆتە دەگوترێ، ڕەنگە مەسیحییەک باشتر درک بەمە بکات، چونکە لە کڵێسە گوێی لە مەقامەکان دەبێت، بۆیە گومانی تێدانییە، سێوە ئەو ئاوازەی لە کڵێسەوە بردۆتە دەرەوە و ئەم تێکستەی پێ گوتووە، یان پێش ئەو مەربێن، یان حەنیلە خرە ئاوازەکەی بەکارهێناوە و سێوە گوتوویەتییەوە، چونکە ئەوەی ماوەتەوە لەزاری سێوە تۆمار

## مەبێن، حەنیل و سێوە سیکوچکەی ئوستادی مەقاماتن لە نێو مەسیحییەکانی کۆیە

کراوە، سەردەمی مەربێن و حەنیل تۆمارکردن نەبووە، یان هەبووە، بەڵام دەستی وانی پێ نەگەیشتووە.

چەند ڕاستییەکی مێژوویی لە ساڵی ٢٠٢١ مامۆستا گوریل شەعیە، بۆی گێڕامەوە و گوتی: ((لەساڵانی کۆتایی چلەکان و سەرەتای پەنجاکان، سێوە دەرسی ئایینی و تەرتیلەی ئایینی پێ گوتووین، کە نزیکەی بیست و پێنج فێرخواز بووین کچیشمان لەگەڵ بوو، ساڵانی پێش ئێمەش، وەک بۆیان گێڕاومەتەوە، واتا لە ساڵانی سییەکانیش سێوە دەرسی لە کڵێسا گوتۆتەوە)) لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە سێوە، نەک تەنیا شەماس و مەقامبێژ بووە، بەڵکو مامۆستا و پەروەردەکاریش بووە، بەشێوەیەکی زانستیی وانەی گوتۆتەوە و دوای ئەوەی، کە فێرخوازەکان وانەیەکیان خوێندووە لە حەوشەی کلێسە یاریان کردووە، مامۆستا گەوریل پێی گوتم: ((سێوە میزراحی گەورەی پەیدا کردبوو، داوەکەی لە مووی بزن دروست کردبوو، چونکە سێوە لە منداڵییەوە پیشەی مورێسی کردووە، میزراحەکانی لە پەت دەکردەوە و لە ساحەکە بەرەڵای دەکردن زۆر پێی دڵ خۆش دەبووین، کەیفمان پێدەهات، ئەو ڕۆژانە سەیری نینۆکی دەکردین و حەزی دەکرد پاک و خاوێن بین))

سێوە حەزی لێبووە ڕستە بەڕستە فێرخوازەکانی تەرتیلە دینییەکانی لە دووی بڵێنەوە دوای لەبەرکردنیش هەر فێرخوازە و بەجودا بیڵێتەوە، مامۆستا گوریل لە مبارەیەوە پێی گوتم: ((کاتێک سێوە دەرسی پێ دەگوتین داوای لێ دەکردین بۆ نوێژی عەسر بێینە کەنیسە، چونکە لەوێ ئێمەش بەشدار دەبووین و بەشێوەی پراکتیکی لەنێو خەڵک تەرتیلەکانمان دەگوتەوە)) ئەمەش سەرنجی ئێمە بۆ ئەوە ڕادەکێشێ، کە سێوە لەساڵانی ١٩٤٠کانەوە دەرسی بە کوڕ و کچ



گوتووە، ئەی دەبێت لە سەردەمی سێوە، کە لە کڵێسەی کۆیە خوێندوویەتی چۆن بووبێ؟ دەبێ کچ لە گەڵ کوڕان خوێندبێتی؟ هەرچەندە زانیارییەکی وامان لەبەردەست نییە، چونکە تۆمار نەکراوە، ئەوکاتیش بیر لەوە نەکراوەتەوە چاوپێکەتن لەگەڵ هونەرمەندان بکرێ، بۆئەوەی زۆر نهێنی هەیە ئاشکرا بکرێ.

کاتێک ساڵی ١٩٥٧ سێوە دەچێتە سلێمانی لەوێ بەشداری ئاهەنگێک دەکات، دواتر لە سلێمانییەوە بەپاس بەڕێ دەکەون بۆ هەولێر، مامۆستا کەریم شارەزا ئاماژە بەوە دەکات، کە تا هەولێر سێوە گۆرانیی گوتووە.

لەمەوە سەرنجمان بۆئەوە دەچێت، بەپاسی تەختەی





جاران لە سلێمانییەوە بچنە هەولێر پێنج شەش کاتژمێرێکی خایاندووە، کەواتە سێوە توانای گوتنی بەستە و گۆرانیی مەقامی هەبووە خەزنەکەی پڕبووە و زۆری زانیوە، بەڵام تەنیا ئەوەندەی بۆتۆمار کراوە.

لەساڵی ٢٠١٦ درەختی بنەماڵەی سێوەم دروست کردووە، سێوە کوڕێک و کچێکی هەبووە، کوڕەکەی ناوی: پۆلس بووە، کچەکەی ناوی هەنیسە بووە. هەنیسە کوڕێک و شەش کچی هەبووە. پۆلس: کوڕەکانی بەناوی: یەلدا، فایق، حەنا، تۆما، کچەکانی: بەفرین وەردێ. نەوەکانی یەلدا: کوڕ: یوسف، کچ: مریەم. فایق: کوڕەکانی: غەسان، غەزوان، ویسام. کچەکەی: هیبە.

حەنا: هیچ منداڵێکی نەبووە. تۆما، کوڕەکانی: ڕانی، فادی. دیارە ئەوە تەنیا بنەگەی درەختی بنەماڵەی سێوە بوو خستمە ڕوو، هەمووی نییە، بەڵام دەتوانم بڵێم تا ساڵی ٢٠١٦ تەنیا بیست و دوو کەس هەڵگری ناوی سێوەن. وەک باوک، باپیرە، باوکی باپیرە بۆنموونە: ویسا، غەسان، فایق، پۆڵس، سێوە(صلیوە) واتا ویسا بە چوار پشت دەگاتەوە سێوەی هونەرمەند.

مامۆستا گوریل شەعیا لە شوباتی ٢٠٢١ پێی گوتم: ((کاتێک، کە سێوە لە بەغدا هاتەوە سێوەم بینی و بەسەرهاتێکی بۆ باوکم گێڕایەوە و گوتی: کاتێک، کە چوومە بەغدایێ ڕۆژی جومعەی ئازارەکان بوو، گوتی: ((منیش چووم دانیشتم قەشە و شەماشەم بینی کتێبیان بەدەستەوەیە و هەڵەش دەکەن، منیش بە دەنگی بڵند لە شوێنی خۆم بێ کتێب دەمگوتەوە، خەڵکەکە زۆریان پێ سەیر بوو، یەکێکیان گوتی: تەماشای ئەو کوردە بکە بە جلکی کوردی جەمەدانییەوە چۆن هەمووی لەبەرە، سێوەش وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ: تۆ لە زگی دایکت بوویی من ئەوانەم لەبەربووە)) لەم گوتەیەی مامۆستا گوریل شەعیا چەند شتێک هەڵدەهێنجین لەوانە: سێوە و شەعیا پێکەوە شەماسی کڵێسەی ماریووسفی کۆیە بووین و جیرانیش بووینە. سێوە کەسێکی زەینڕوون و زیرەک بووە و زۆربەی شتەکانی لەبەربووە. لە چاوپێکەتنێکم لە بەهاری ساڵی ٢٠٢١ لەگەڵ

❝

سێوە ساڵی ١٩٥٢ چۆتە بەغدا تەنیا پێنج مەقامی تۆمار کردوون، کە قەوانیگیان لەکارکەوتووە، کەواتە تەنیا چوار مەقامی تۆمارکراوی هەنە

❞

مامۆستا ئیسحاق جەرجیس لە دایکبووی ساڵی ١٩٣٩ شاری کۆیە. ئاماژەی بەوە کرد، کە لە ئاهەنگی ژن گواستنەوەکەی سێوە گۆرانیی گوتووە، گوتی: ((سێوە لە قەزایەی دینی زۆر زیرەک بووە، حەزی بکردایە دەیانکردە قەشە، بەس خۆی نەبۆتە قەشە)) هەروەها ئەوەی مامۆستا کەریم شارەزا تۆماری کردووە، تەنیا دەڵێ ساڵی ١٩٥٢ مەقامەکانی لە بەغدا تۆمارکردوون، بەڵام ئێمە ئێستە بۆمان دەردەکەوێت، کە لە ١٠ تا ١٥ نیسانی ساڵی ١٩٥٢ واتا لەوەرزی بەهار تۆماری کردوون، چونکە جەژنی ڕابوون (قیامە) دەکەوێتە ئەو ڕێکەوتەی، کە دیاریم کردووە.

ئەگەر لەڕووی پێکەوە ژیانی ئایینییەوە لە سێوە بڕوانین دەتوانین چەند شتێک بخەینەڕوو لەوانە:

لە ساڵی ١٩٣٥ سەید هادی مدیری ئەوقافی کۆیە بووە، کۆمەڵێ پڕۆژە و ئیشی بۆ کۆیە کردووە، یەک لەوانە مزگەوتی گەورەی کۆیەی نۆژەن کردۆتەوە، ئەوکاتی مەلای گەورەی کۆیە لە ژیاندابووە، لەکاتی تەواوبوونی نۆژەنکردنەوەکە، خەڵکێکی زۆر کۆبوونەتەوە، سێوەی هونەرمەندیش چووە، لەوکاتەدا مەقامێکی دینی گوتووە لە مەتحی خوا و پێغەمبەران، مەلاکان و خەڵک هەموو سەرسام بووینە و چەپڵەیان بۆلێداوە ئینجا چوونەتە نێو مزگەوتەکە، فارووقی کوڕی مەلای گەورەی کۆیە لە ٢٠١٢/٦/١٠ پێی گوتم: ((مەلا و خەڵکەکە هێندە سەرسام بوونە بەو تەرتیلەیە، نە تۆمار کرا، نە جارێکی دی گوترایەوە)) کەواتە سێوە زۆر شتی زانیووە، بەڵام تۆمار نەکراون، لە هەمان کاتیش بەڵگەیەکی گرنگە لەسەر مێژووی پێکەوەژیان لە کوردستان.

سێوە و مەلا ئەسعەد پێکەوە گۆرانییان گوتووە، تەنانەت کاسێتی هاوبەشیشیان هەیە و ماوە. هەرچەندە مامۆسیقاکەی تەواو نییە و دەنگەکان شێواون و کاسێتەکە لە ڕووی هونەرییەوە لاوازە، بەڵام پەیامێکی گەورە لە دووتوێی ئەم کاسێتە هەیە، ئەویش ئەوەیە، سێوە شەماسی کڵێسە بووە و ڕۆژانە نوێژەکانی لە کڵێسە کردووە و پەیوەست بووە بەئایینی مەسیحییەوە، مەلا ئەسعەدیش مەلا بووە و پابەند بووە بە دینی

**سیوە لە تەمەنی منداڵییەوە خراوەتە بەرخوێندن و لە کڵێسە خوێندوویەتی و بووە بە شەماس**

ئیسلام، بەڵام لە کۆڕ و کۆبوونەوە و مەجلیس لەگەڵ سیوە دانیشتووە و دۆستی یەکتر بووینە و پێکەوەش مەقامیان چڕیوە.

سیوە و شەعیە مەربین کاری مورێسیان کردووە و جوانترین بەرماڵی بەنەخشیان دروستکردووە، ئەوکات دەرمان ڕەنگەکانیان لە بەغدا هێناوە، لەبەر دەست ڕەنگینییان، خەڵک سەرەی بۆگرتوون، واتا مەسیحییەک بەرماڵی بۆ موسوڵمانێک چنیوە.

گۆرانیی سەحەر فەقێیەک نووسیویەتی، کە عاشقی کچێکی جوولەکە بووە، کچە جوولەکەکە بە بەردەم مزگەوتدا ڕۆیشتووە، چونکە ئەوکات زۆربەی خەڵکی کۆیە لە حەمامۆکەوە ئاویان هێناوە و حەمام و شوێنی خۆشووشتن هەر لەوێ بووە، لە لاپەڕە ٣٣ کتێبەکەی مامۆستا شارەزا تەنیا دەقەکە خراوەتە ڕوو کە بەم شێوەیە دەست پێدەکات:

***ئەوەل سەحەرە***
***سەحەر سەدای منی غەریبە ماری***
***وەزی وەرگێڕم***
***ئەگەر فەقێیان لە مەدرەسان دەخوێنن***
***ئەمن بەبێ برین خوێنێ دەڕێژم***
***گەلی برادەرینە ئەمن هەرچەندی دەکەم***
***لەوێ کۆنە دنیایێ***
***قاسدێکی بە متمانەم بەدەست ناکەوێ***
***بینێرمە کن بەژنی باریک و دوو چاوی بەرەک***
***ڕاستی دری خۆمی لەبۆ بێژم***
***وەیلێ سەحەرە***
***ئەمن دەست لەسەر بەژنێ باریک و***
***دوو چاوی بەرەک هەڵناگرم***
***هەتا حەزرەتی ئیسرافیل نەداتن لە نەفخی***
***سووری***
***مەنسووری هەلاج تەقەی دێ لە کەوانی***



**حەزرەتی موسا هەزار و یەک کەلیمەی دەکاتن لەگەڵ باری تەعالا لەسەر کێوی توورێ وەیلێ سەحەرە!**

سیوە، بەکاریگەری ئاوازی کڵێسە مەقامەکەی چڕیوە، لەم مەقامەدا هەرسێ ئایینەکە وجوودیان هەیە، تێکستەکە گەنجێکی مسوڵمان نووسیویەتی، ئیلهامی تێکستەکە کچێکی جوانی جوولەکە بووە، مەسیحییەک، کە سیوەی هونەرمەندە چڕیویەتی.

لە ٢٠٢٣ /٣/١٩ سەلاحی خزری ڕای خۆی بەو شێوەیە لەبارەی سیوە دەربڕی: ((وەک ئەوەی ئاگادار بم، ئەوەندەی لەبەردەستم دایە، بە غەیرەز ئەو گوڵێی مامۆستا سیوە، بیست و یەک گوڵی هەیە، هەمووشیان هی ناوچەی موکریانن، هەموو گوڵێکان لە بەیاتی کوردی دان، وەلێ ئەوەی مامۆستا سیوە لە حیجاز دایە. بەڵام بەهەمان بەند و تێکستەوە)) پێم وایە تێکستەکان دەگۆڕێن دەقاودەق یەک شت نین، تا ئەندازەیەک دەگۆڕێن. دواتر سەلاحی خزری گوتی: ((سیوە دەنگێکی شاز و تایبەت بەخۆیەتی لە گوتنی مەقامی کوردیی شێواز و شوێن پەنجەی دیارە)) لە هەمان دانیشتن هونەرمەند عەزیز شارۆخی گوتی: ((سیوە پەیوەستە بە فۆلکلۆرەوە، وەلێ شێوەیەکی خۆی هەیە لە گوتن)) سەلاح شێخ شەرەف، لە٢٠٢٣/٣/١٥ گوتی:

((من سیوەم دیوە، بەس لەگەڵی دانەنیشتووم، دایکم دەیگێڕاوە، کە کۆشکێک هەبووە لەماڵی مامم شێخ عیسام، لە تەنیشت تەکیە لە کۆیە، سەرەکەی دار بوو، بەڵام دەیگوت مەسیحییەکانی هەرمۆتە لەگەڵ سیوە سەرەکەیان قامیش بەند دەکرد، سیوە گۆرانیی و مەقامی خۆشی دەگوت)) بۆیە سیوە کەسێکی خۆشەویست و ڕێزلێگیراو بووە.

کۆمەڵێ چاوپێکەوتن و زانیاری دیکەی تۆمارکراوم هەیە لەبارەی سیوەی هونەرمەند و لێرە باسم نەکردوون و نەپرژام تایپیان بکەم و بیانخەمە ڕوو، بۆ ئەم جارە هەر ئەوەندەم پێکرا خوازیارم لە کات و دەرفەتێکی دی ئەوانیش بنووسمەوە و سەرنجەکانی خۆمیان لەسەر بڵێم.

> **"ئاوازی مەقای سەحەرە ڕێک ئاوازی تەرتیلەی (قوم شەپیرە) کە لە کڵێسەی کۆیە و هەرمۆتە دەگوترێ"**



# سێوەی هونەرمەند
# لە تەرازووی ڕەسەنایەتی دا

ئامادەکردنی: محەمەد گەردان

**سێوەی هونەرمەند چۆن ژیا؟**

سێوە ناوی تەواوی (صلیوە)ی کوڕی خواجە (یەلدە)ی کوڕی (صلیوە)یە، ساڵی ١٨٩١ لەشاری کۆیە هاتوتە دنیاوە و چاوی ژیانی بەجوانیی باخ و سەیرانگاکانی هەرمۆتە و ئاشان و ئۆمەرخوچان کراوەتەوە و گوێی بەئاوازی سوێسکە و کەوی قەدپاڵی چیای باواجی و هەیبە سوڵتان و چریکەی بولبولانی شیوەڕەزانی گۆش بووە. سێوە ساڵی ١٩٠٢ بۆ یەکەمجار لەلای (قەشە حەننا) خراوەتە بەرخوێندن و لە ساڵەکانی ١٩٠٢- ١٩٠٤یشدا دەرسی زمانی کلدانیی و بنچینەکانی (ئایینی مەسیحی)ی لەلای قەشە گورگیسی ڕەبەن خوێندووە و لەساڵی ١٩٠٥دا بەماوەی دووساڵ لای (قەشە پۆلسی عوجمایا)ی ناودار بە (قەشە سوورە) خوێندنەکەی تەواو کردووە. لەبەر زیرەکی و زەین ڕوونی بەماوەی پێنج ساڵ بەچاکی زمانی کلدانیی و سەرەتایەک لە زمانی فەرەنسیی فێر دەبێت و لەخوێندنەکەیدا دەگاتە پلەی (شەماسە) لەو لاوەش بەیارمەتی هەندێک لە دۆستە خوێندەوارەکانی بە باشی فێری خوێندنەوە و نووسینی کوردیی، عارەبیی و فارسیی دەبێت، ئاگادارییەکی باش لە شیعر بەو زمانانە دەبێت، بۆیە بەدەیان چامە و هۆنراوەی کوردیی و فارسیی لەبەربوونە و بە مەقام و بەستە دەیگوتن، وەک شیعرەکانی قاصد، ئەختەر، حاجی قادری کۆیی، وەفایی، عەبدوڵلا بەگی مصباح الدیوان، صافی و دڵدار. (کەریم شارەزا، ١٩٨٢: ١٧- ١٨)

ساڵی ١٩٠٣ خواجە (یەلدە)ی باوکی بەنەخۆشی ڕشانەوە (کۆلێرا) کۆچی دوایی دەکات و سێوەی دەستە کوڕیش بۆ گوزەران و بەڕێوەچوون دەبێتە شاگردی (خواجە یوسف)ی مووریس و جوڵای دۆستی نزیک و دڵسۆزی باوکی و لەماڵەوە لەگەڵیاندا دەژی، کە دەگاتە تەمەنی هەرزەکاریی، دەکەوێتە داوی دڵداریی کچە جوان و نەشمیلانەکەی وەستاکەی، کە ناوی (واریێ) بووە، ئەو ئەڤینداربییەشی لەگەڵ (واریێ)ی ناسک و نازدار، بووە بەمایەی تەقینەوەی بەهرەی هونەری مەقامبێژییەکەی، بەتایبەتی، کە هەستی کردووە (واریێ)ی دلڕفێنیشی ئەو حەز و دڵدارییەی لەگەڵدا ئاڵوگۆڕ دەکات بۆیە بە شەو و ڕۆژ گورانی دڵداری لەدەمدا نەبڕاوە و سەرتاپای ئاوازی گورانییەکانی هەر سۆز و عیشقە نەمرەکەی بووە، بۆ یارە خۆشەویستەکەی، کەچی لە ئەنجامدا، کە وەستاکەی هەستی بەوە کردووە، کچەکەی پێ نەداوە و نەیهێشتووە بۆ یەکتری بن و داویە بە (صلیوەی قەشە ئەلیاس)ی خزمی خۆی و دوای کەمتر لەساڵێک (واریێ)ی ئاشقی دڵسووتاو بەدەردی وەرەم (سیل) سەردەنێتەوە و سێوەی بەدبەختیش دوای چەند ساڵێک کچێکی خزمی خۆی بەنابەدڵی پێدراوە (کەریم شارەزا، ١٩٨٢: ١٨- ١٩)

سێوە لەکاتی گەنجێتیدا، بۆ گوزەران و ماڵ بەڕێوەبردن پشتی بە پیشەی مووریسی و جوڵایی بەستووە، لەدواییدا لەکلیسا بچووکەکەی کۆیەدا بووە بە (شەماسە) و بەزۆری بەڕێوەبردنی ئەو کلیسایە هەر لە ئەستۆی ئەودا بووە. لەهەمانکاتیشدا دەبوو بەنووسەر و میرزا و حیسابگری بازرگان و خاوەن زەویوزار و تووتنچییەکانی کۆیە (کەریم شارەزا، ١٩٨٢: ١٩)

سێوە پیاوەکی کەلەگەتی مەیلەو قەڵەوی چاو گەورەی لووت خڕ، زۆر دڵتەڕ، زەوقانی، نوکتەزان، قسەخۆش و وەرام لەمست بوو. زۆر حەزی لە کۆڕ و دانیشتنەکانی خواردنەوە دەکرد، بە زۆری دۆست و برادەر و هاونشینەکانی ژیانی لە دەستەی گەنج و جاحێڵەکانی شارەکەی

بوون، نەیدەویست پێی بگوترێ پیر بووی، بۆیە هەستان و دانیشتنی لەگەڵ نەوەی نوێ و ئەهلی زەوق بووە و ئەوەندەی هاومەشرەبی دۆستە لاوەکانی وەک تایەر تۆفیق، باکووریی، ئارتینی بەرگدروو، حەویز عەبدولوەهاب، سابیر عەبدوڵلا جەراح، محەمەد عەلی مستەفا و عەبدولواحید سەعید بووە، ئەوەندە هاونشینی دۆستە هاوتەمەنەکانی خۆی نەبووە. هەردەم سەرچۆپی کێشی شایی ڕۆینەی کوردی و مەقامبێژی شایی و ئاهەنگەکانی نەورۆز و سەیرانەکانی شارەکەی بووە، هەر ئاهەنگێکی سێوە بەشداریی تێدا نەکردبێ، وەک بەهارێکی بێ گوڵ بووە و تام و خۆشی لێ وەرنەگیراوە. (کەریم شارەزا، ١٩٨٢: ١٩- ٢٠)

سێوەی هونەرمەند تا دوا هەناسە لە ژیانیدا هەر لەخزمەتی هونەری مەقام و گۆرانیی کوردیدا بووە، تا لە ڕۆژێکی ساردی مانگی کانوونی دووەمی ١٩٦٤ دا و لەتەمەنی ٧٣ ساڵیدا لەکۆیە ماڵئاوایی لەهونەری کوردیی و دۆست و یارانی کرد. هەر ئەو ڕۆژەش تەرمەکەی بەشان و بازووی دۆست و هونەرپەروەرانی ئەو شارە بردراوە بۆ گۆڕستانی (هەرمۆتە) و لەوێ بەخاکی نیشتمانەکەی سپێردراوە، مەیدانی هونەری ئاواز و گۆرانی ڕەسەنی کوردی بۆ هونەرمەندە لاوەکان چۆڵ کردووە، لەدوای خۆشیدا، کوڕێک (پۆلس) و کچێکی (ئەنیسە)ی لەپاش بەجێماوە (کەریم شارەزا، ١٩٨٢: ٢٠)



## «مەڕبێن»ی مامۆستای بلیمەتی مەقامی کوردی

پێش ئەوەی «خاڵە سێوە«ی بناسین و باس لە هونەر و دەنگەکەی بکەین، دەبێ سەرەتا لە «مەڕبێن» دەست پێبکەین! چونکە بەبێ تێگەیشتن و ناسینی مەڕبێن، تێگەیشتن و ناسینی «خاڵە سێوە« ئاسان نییە.

مەڕبێن لەدیانەکانی شاری کۆیە بووە و کوڕی (قەشە شابیل)ی مامی باوکی (یاقوبەی باسێ)ی مووریس بووە. ئەو بەیت و گۆرانییە کوردییە خۆشانەی، کە تا ئەم دواییە بەسەر زار و زمانی گۆرانیبێژە هەڵکەوتووەکانی ئەو شاری کۆیەوە بوون، هەموویان هەر خوڵقاو و زادەی دارشتن، یان نوێکردنەوە و ڕێکخستنی سەردەمی ئەمین ئاغای ئەختەر و مەڕبێنی مەقامبێژی بلیمەت بوون. ئەو مەقامانەی (نیوەشەو، سەحەر، بەهار، پایز، گوڵێ، عایشە گوڵ، شەنگ مێرەم، مەکەن مەنعی عاشقان، جەبارە، شلە و خانان)ی شایی ڕۆینەی کوردی، کە لەلایەن گۆرانیبێژە هونەرمەندەکانی وەک «نەشئەی ڕەشید ئاغا» و «حەنیل» و «حەبەی چایەچی» و «پووتی» و «سێوە« و «مەلا ئەسعەد» تا دوا دوای پەنجاکان دەگوتران، ئەگەر هەمووشیان لە شاری کۆیە نەهاتبن، بێگومان هەندێکیان خوڵقاوی ئاووهەوا هونەرییەکەی بوون، بەتێکراش لە بواری کۆڕ و دانیشتنەکانی ئەمین ئاغلو (مەڕبێن)ی هونەرمەند ڕێکوپێکتر کراون و خراونەتە نێو قالبی مۆسیقا و ئاوازی ڕەسەنی




**"سێوە لە کاتی گەنجێتیدا، بۆ گوزەران و ماڵ بەڕێوەبردن پشتی بە پیشەی مووریسی و جۆلایی بەستووە"**



کوردییەوە. (کەریم شارەزا، ١٩٨٢: ١١- ١٢)

مەڕبین دەنگێکی خۆشی سیحراوی بووە، کە شەو رادەشکا و بای شەماڵ شەوانی هاوینی کۆیەی فێنک دەکردەوە، ئەو مەقامبێژە بلیمەتە بەدەنگە دڵکێش و خۆشەکەی مەقامی (نیوە شەو) و (سەحەر)ی لەدیوەخانی ئەختەری شەیدای هونەری کوردی دەگوت، هەموو دانیشتوانی شاری کۆیە لەخەو راست دەبوونەوە و گوێیان لەو دەنگە خۆشەی مەربینی هونەرمەند رادەگرت. مەڕبین برایەکی لە تافی لاویدا جوانەمەرگ دەبێ، خەڵکی کۆیە بە دوکاندارەوە دەست لەکار هەڵدەگرن و دوکانەکانیان دادەخەن و لەدوای تەرمی ئەو جوانەمەرگە تاکو گۆڕستانی گوندی هەرمۆتە دەڕۆن (مەڕبین)ی کۆست کەوتووش هەموو جلوبەرگی خۆی لەخەم هەڵدەکێشێ و بەپێش تەرمەکەی دەکەوێ، کە دەنێژرێ، ڕوو دەکاتە خەڵکەکە و پێیان دەڵێ: «خەڵکینە من ئەمڕۆ بۆ دواجار لەژیانمدا گۆرانی دەڵێم، جا فورسەتە هەر گۆرانییەکی ئارەزووی دەکەن، داوام لێ بکەن بۆتان بڵێم، چونکە لە ئەمڕۆ زیاتر گوێتان لەدەنگی من نابێ، لەدوای جوانەمەرگبوونی برای شیرینم دڵم ناپشکوێ، تا جارەکی دیکە گۆرانی بڵێم، جا تکایە لە ئەمڕۆ بەدەر نە ئێوە و نە ئەمین ئاغای ئەختەر ئەو داوایەم لێ نەکەن. ئیدی لەدوای ئەو کارەساتە مەڕبین لەخوێندن کەوت و چیتر گۆرانی نەگوت و مەیدانی ئەو هونەرە جوانەی بۆ (حەنیل) و (پووتێ) و (عەبەی چایەچی) و لەدواییشدا بۆ (سێوە)ی مەقامبێژ چۆڵ کرد. مەڕبین هاوتەمەنی ئاغای ئەختەری شاعیری مەقامزانی کوردی بووە، لە دەوروبەری ساڵی ١٨٣٥ی زایینی لە کۆیە لە دایکبووە، هەر لەوێش لەدەوروبەری ١٨٩٥ کۆچی دوایی کردووە و لەگۆڕستانی هەرمۆتە بەخاک سپێردراوە. (کەریم شارەزا، ١٩٨٢: ١٣)

### سێوەی مەقامبێژی هونەرمەند

سێوە لە مەقام گوتندا خاوەنی ڕێبازێکی هونەریی تایبەت بووە، دەنگێکی خۆشی قەبەی گونجاو و لەباری هەبووە بۆ گوتنی ئەو جۆرە گۆرانییانە. هەستێکی مۆسیقایی ناسکی هەبووە، بە هەوڵدانێکی کەم توانی خۆی بکات بەئاشنای هەموو جۆرە مۆسیقایەکی خۆرهەڵاتی، لەکاتی گۆرانی گوتندا، بەچاکی لەگەڵ مۆسیقا دەڕۆیشت، دەیزانی لە کوێوە دەست پێبکا و لە کوێوەش بوەستێ، دەقی ئەدەبی و ئاوازی مەقامەکانی لە سەرچاوەیەکی پاک و سازگاری کوردەوارییەوە هەڵقووڵاون، بەزۆری لە گیروگرفتەکانی لاوان، ئەڤین، ڕاستگۆیی، وەفاداری و سرووشتی خاکی کوردستانەوە دەدوێن، ڕەگێکی قووڵ و قایمیان هەیە و بەنێو ویژدان و دەروونی میللەتدا چۆتە خوارەوە، لەزۆر شوێن لەبازنەی تەسکی کات و ڕۆژگار دەچنە دەرەوە، بۆ ئەوەی بۆ هەموو دەور و سەردەمێکی مرۆڤی کورد دەست بدەن، بۆیە بەگۆرانی و مەقامی ڕەسەنی کوردی دەدرێنە قەڵەم. هەرچەندە ئەو مەقامانەش بە دەقی ئەدەبی و ئاوازەکانیانەوە، ڕەگ و شادەماریان دەچێتەوە سەر مەقامەکانی سەدەی نۆزدەهەم، بۆ سەردەمی ئەمین ئاغای (ئەختەر)ی شاعیری هونەرمەند و (مەڕبین)ی مامۆستای مەقامی کوردی، بەڵام ئەو ڕاستییە ئەوە ناگەیەنێت، کە ئاواز و مەقام و گۆرانییەکانی (سێوە) کتومت هەر هەمان مەقامی ئەو سەردەمەی پێشوو بووبن و هیچ گۆرانکارییەکیان بەسەردا نەهاتبێ! (کەریم شارەزا، ١٩٨٢: ١٤- ١٥)

سێوە خۆی مەقامبێژێکی هونەرمەندی بە دەسەڵات بووە، بەزیاد کردنی شتی تازە و لابردنی نەغمەی سواو و نەگونجاو لەگەڵ بابەتی مەقامەکەدا، توانای داهێنانی ئاوازی نوێ و تازە کردنەوەی ئاوازی کۆنی فۆلکلۆری کۆنی هەبووە. بۆیە لەکاتی گۆرانی گوتندا، بە توانستی هونەریی خۆی، هەمیشە زاڵ بووە بەسەر ئاوازی مەقامەکانیدا، دەستکاری تێدا دەکردن بەبێ ئەوەی لە سنووری گشتی و لە بنچینە سەرەکییەکانی ئەو مەقامانە بچێتە دەرەوە. (کەریم شارەزا، ١٩٨٢: ١٥)

سێوە لە سەرەتادا، هونەری مەقامی کوردی لە (نەشئەتی ڕەشید ئاغای حەوێزی)یەوە فێربووە و لە دواییدا لە سەدەی نۆزدەهەم، بۆ ماوەی ساڵێک چۆتە لای (حەننا تۆما)ی ناسراو بە (حەنیل)ی شاگردی (مەڕبین)ی ئوستادی مەقامی

> **"سێوە کاتێک دەگاتە تەمەنی هەرزەکاریی، دەکەوێتە داوی دڵداریی کچە جوان و نەشمیلانەکەی وەستاکەی کە ناوی (وارێ) بوو"**

کوردی لە مەڵبەندی کۆیە. لە ماوەی ئەو ساڵەدا هەموو دەستوور و بنچینەکانی مەقامی کوردی بەدەقی ئەدەبی و ئاوازەکانییەوە بە نووسین و لەبەرکردنەوە فێربووە و بووە بە مەقامبێژێکی هونەرمەندی لێهاتووی کورد.

بەزۆری لەگەڵ گۆرانیبێژەکانی ئەو سەردەمەی کۆیەی وەک: عەبەی چایەچی، پووتێ، میناس مەربین، مەربینی قەشە گۆرگیس ١٨٩٢- ١٩٧٩، مەلا ئەسعەد ١٨٩٠- ١٩٥٨ و ئەحمەدی حەمە مەلا ١٩١٣- ١٩٧٩ی هونەرمەند، مەقامی خۆش و دڵکێش و هەندێک جاریش بەدوو قۆڵی لەگەڵ (میخەی یوسفی هەرمۆتەیی)دا (بەیتی مەم و زین) و (ناسر و ماڵ ماڵ) یان بەشێوە موکریانییەکەیان دەگوت. تا وای لێهات لەو شارەدا بوو بەمیراتگری لێهاتووی (حەنیل) و (نەشئەتی ڕەشید ئاغا) و (مەربێن) لە هونەری مەقامی کوردیدا، هیچ کۆڕ و ئاهەنگێکی ئەو شارە بەبێ دەنگی (سێوە) و مەقامە خۆشەکانی ئەو، شەوق و شادی تێدا نەدەگەڕا و هەستی هونەریی هونەرپەروەرانی پێ مەست و مەدهۆش نەدەبوو، هیچ شایی و ئاهەنگی نەورۆز و سەیرانی بەهارانیش بەبێ ئاوازی گۆرانی (جەبارەوە جەبارە) و (شلەو خانان)ی خاڵە سێوە، هەوای عیشق و دڵداری نەدەخستە کەللەی سەرچۆپی کێشی سەرگەرمی ئەڤینی یارە نازدارەکەی و مەستی خۆشی بەهەشتی گوڵزاری بەهاری نیشتمانە خۆشەویستەکەی (کەریم شارەزا، ١٩٨٢: ١٥- ١٦)

## سێوە، لە کاروانی گۆرانی کوردیدا

سێوە لەسەردەمی گەنجێتیدا، هونەرەکەی لە چوارچێوەی دیوەخان و کۆڕ و دانیشتنی دۆست و یارانی نەدەچووە دەرەوە. تاکوو چڵەکان، لەگەڵ هەڵچوونی نیشتمانپەروەریی میللەت، ئینجا هونەرەکەی کەوتە سەر شانۆی ئاهەنگەکانی نەورۆزی کورد و دەنگی دایەوە و سەرلەنوو گۆرانی (جەبارە) و (شلەو خانان)ی شایی ڕۆینەی زیندوو کردەوە و گۆرانی (لەبەر خاتری چاوبازان)ی وەفایی کرد بە مەقامی تایبەت بە بووک گواستنەوە و (مەقامی بەقامەت خەرامان)ی صافی هیرانی و (زوڵف و ئەگریجەی یار)ی یونس دڵداری شاعیری نیشتمانپەروەری کرد بەگۆرانی بە ڕەواجی ناو کۆمەڵی هونەرپەروەرانی شاری کۆیە.



سێوە لەساڵی ١٩٥٢دا پێنج مەقامی لەمەقامە ڕەسەنەکانی خۆی لەئێستگەی ڕادیۆی عێراق- بەشی کوردیدا تۆمار کردووە کە ئەمانەن: (عەجەم: سەحەر) و (حیجاز: گوڕلێ) و (بەیات: عایشە گوڵ) و (حیجاز: بەهار) لەگەڵ مەقامی (شەنگ مێرەم)دا (کەریم شارەزا، ١٩٨٢: ٢١)

## سێوە لە کڵێسای کۆیە دا

سێوە لە کەنیسەکەی کۆیە شەماس بووە (قەشە سامان) دەڵێ: لەئایینی مەسیحیدا (شەماس) دەتوانی وەک «خزمەتکاری کەنیسە» یا «هەڵسوڕاوی کاروبارەکانی کەنیسە» یاخود «یاریدەدەری قەشە» سەیر بکرێت. سێوە لەدەنگ و ئاوازی مەقامەکانیدا، دوو شارستانییەت، ئایین، نەتەوە و کولتووری تێکەڵاو کردبوو و هارمۆنیایەکی سیحراوی لێ دروست کردبوو.

«شەماسە سێوەی هونەرمەند لە کڵێسا بچووکەکەی کۆیەدا، شوێنێکی تایبەتی دیاری هەبوو لەهەڵسوڕاندنی کاروباری ئایینی دیانەکانی ئەو شارە. لەکاتی نوێژکردن و قوداسەکاندا، هەر دەنگ و ئاوازەکانی ئەو بوون لە گوێی نوێژکەراندا دەزرنگانەوە. خەڵکەکە تاموچێژێکی زۆریان لە تەوشیح و مەزموور و گۆرانییە ئایینییەکانی وەردەگرت، کە هەموو ئێوارەیەکی یەکشەمموان و لەجەژنی موناسەبەتە ئایینییەکانیاندا بەدەنگە پڕ جۆش و خرۆشەکەی دەیگوتن و دنیای دەهێنایە جووڵە و هەژان. خەڵکەکەی دەبردە دنیایەکی دیکە و دەیفڕاندن بۆ ئاسمانێکی پڕ لە ڕۆشنایی و گیانی پاکی پێغەمبەر و پیاوچاکان. هەندێک لەو برادەرە دیانانەی، کە لەو کڵێسایەی کۆیە لەگەڵ سێوەدا نوێژیان کردووە، دەگێڕنەوە و دەڵێن: یەکێک لە هەرە بەناوبانگترین گۆرانییە ئایینییەکانی، کە لە موناسەبەتی تایبەتی دەیگوتن، گۆرانییەک بوو بەناوونیشانی (نقوم شەبیر) کە ماناکەی بەکوردی واتا (با هەستین تەسبیحات بۆ خودا بکەین) لەسەر ئاوازی مەقامی حیجاز و لەسەر شێوەی مەقامی (بەهار)ی دەگوت، بەجۆرێکی وا،

«ئەو ئەڤینداریيەی سێوە لەگەڵ (وارێ)ی ناسک و نازدار، بووە بەمایەی تەقینەوەی بەهرەی هونەری مەقامبێژییەکەی»



که شارەزاترین کەس لە هونەری مەقامات نەتوانێ وەکو ئەو بڵێ، نەدەزانرا چۆن دەستی پێ دەکرد و چۆنیش کۆتایی بەو ئاوازە خەمناکە دەهێنا؟! بەو دەنگە پڕ سۆزەی نوێژکەرانی ناو کڵێسای بەجارێ دەهێنایە جۆشـــی گریان و فرمێسکی لە چاواندا نەدەهێشتن (کەریم شارەزان، ١٩٨٢: ٢٤)

## دەقە ئەدەبییەکانی مەقامەکانی سێوە کێ دایناون؟

هەرکەسێک، کەمێک شارەزایی لە هونەری گۆرانی و مەقامی کوردیدا هەبێ و گوێی لەگۆرانییەکانی سێوەی هونەرمەند رابگرێ و کەمێک لە پەند و بابەتەکانی وردبێتەوە، پرسیارێکی بەمێشکدا دێ و حەزیش دەکا بزانێ وەڵامی ئەو پرسیارە چییە؟! پرسیارەکەش بەمجۆرە سەر هەڵدەدا و دەکەوێتە سەر زمان: «دەبێ کێ دەقی بەندەکانی ئەو مەقامانەی سێوەی دانابێ؟!»

بەتێڕوانینێکی ورد و هەڵسەنگاندنێکی مەقام و گۆرانییەکانی ئەو مەقامبێژە، ئەو راستییەمان بۆ دەردەکەوێ:

١- ئەو کەسانەی دایانناون زانیارییەکی باشیان بووە لە کاروباری ژیان و دنیادا و تا رادەیەک شارەزای هونەر و رۆشنبیریی کوردی بوون.

٢- ئاگاداری چیرۆک و بەسەرهاتی پێغەمبەرانی خودا و ئایەتەکانی قورئان بوون.

٣- ئاگاداری کەلەپووری نەتەوایەتی کورد و عەرەب و فارس و تورک بوون.

٤- بەوردی و راستگۆیانە، ژیانی کۆمەڵایەتی و ئابووری کۆمەڵگەی کوردەواری قۆناغی دەرەبەگایەتی و سەردەمی سەرهەڵدانی سەرمایەداری بازرگانی لەشارەکانی کوردستانیان دەربڕیوە.

٥- تابلۆی شیعری جوان و پۆستەری هونەرییان، سەرکەوتووانە لەناو هەیکەلی هۆنراوەکانیاندا چەسپاندووە و پێیان رازاندۆتەوە (کەریم شارەزا، ١٩٨٢: ٦٧- ٦٨)

> ***مەقامەکانی سێوە، رەنگ و شادەماریان دەچێتەوە سەر مەقامەکانی سەردەمی ئەمین ئاغای (ئەختەر)ی شاعیر و هونەرمەند و (مەربێن)ی مامۆستای مەقامی کوردی***



بەلام لەگەڵ ئەوەشدا، دەبێ بوترێت، کە «دەقی مەقام و گۆرانییە فۆلکلۆرییەکانی سێوە هیچ کامێکیان بەیتی تەواو نین و داستانێکی جووت رەگەزی ئاشق و ماشق، یا دوو پاڵەوانی دژ بەیەکیان بۆ تۆمار نەکردووین، بەڵکو هەر یەکە بەزمانی پاڵەوانێکەوە دەدوێ بەبێ ئەوەی پاڵەوانی ئەڤیندار یا دژ بەیەک جارێک بێنە جەواب. لەهەندێک مەقامیدا لاوی دڵدار بە جوانی و شۆخ و شەنگیی یارە دڵرفێنەکەی خۆیدا هەڵدەڵێ و خۆی بۆ هەموو جۆرە سەر لە پێناوی و فیداکارییەک ئامادە دەکات بەبێ ئەوەی یارەکەی چ دەورێک ببینێ وەک لە مەقامەکانی (گوڵێ) و (سەحەر) و (پایز)دا هاتووە. لە هەندێکیشیاندا یاری ناسک و نازدار، شێت و شەیدای لاوە دڵدارەکەیەتی بەبێ ئەوەی لاوژەکەی دەنگێکی لێوەبێ»(کەریم شارەزا، ١٩٨٢: ٦٦)

جا بۆیە من گەیشتوومەتە ئەو قەناعەتەی، کە بڵێم زۆربەی دەقی مەقامەکانی (سێوە) هەریەکە پارچە و بەشی بەیتێکی ئەڤین و دڵداریی رێکوپێک بوون و لە ئەنجامی گێڕانەوەی دەمـاودەم لە یەکتری وەرگرتنەوە لێک داپچڕان و هەیکەلە داستانییەکەیان نەماوە و هەر پارچە و بەشە بوون بەمەقامێکی جیاواز و سەربەخۆ، زۆر رێی تێدەچێ مەقامی (گوڵێ) کە لەسەر زمانی لاوێکی ئاشقی شێت و شەیدای کچێکی شۆخ و شەنگی پەری شێوە هەڵبەستراوە، لەگەڵ مەقامی (عایشە گوڵ)دا کە لەسەر زمانی کچێکی ئەڤینداری سوارە چووکەلانەکەیەوە گوتراوە، هەردوو مەقامەکە یەک بەیت بووبن، چونکە هەریەکە و مانا و هەیکەلی ئەوی دیکەیان تەواو دەکات، لەباری کێش و مۆسیقای شیعرەکانیشەوە هەردوو مەقامەکە دەچنەوە سەر هەمان کێش و ئیقاع. (کەریم شارەزا، ١٩٨٢: ٦٦- ٦٧)

**سەرچاوە:**

**کەریم شارەزا (مەقامەکانی سێوەی هونەرمەندی کورد لە تـەرازووی رەسەنایەتی دا) ١٩٨٢، بەغداد، چاپخانەی (حسام)**

# سێوەی هونەرمەند

دیارە لەشاری کۆیە هەر لەدێرزەمانەوە وەستای شارەزای گوتن و مەقام و غەزەل هەبوونە، بەتایبەتی لەسەردەمی (ئەمین ئاغای ئەختەر ١٨٣٩- ١٨٨٧) دیوەخانی ئەختەر شەوانە جێگەی کۆبوونەوەی دەنگخۆش و مەقامزان و ئاوازدانەران بوونە، بگرە شوێنی گوتن و شیکردنەوەی مەقام و گوتنەڕەسەنەکان بووە، دەڵێن: کۆرسێکی تایبەتی بەدیوەخانەکەی هەبووە، ژمارەیان (بیست دەنگخۆش، یان زیاتر بوونە و ئەندامی ژن، یان کچیش لەنێو ئەو کۆرسەدا هەبوونە، جلوبەرگی ئەندامانی کۆرس و خواردنی ئێواران، یان شەوانییان لەسەر ئەختەر بووە، هەرە دەنگخۆش و مەقام وغەزەل خوێنی پلەیەکی دیوەخانی ئەمین ئاغای ئەختەر ئوستادێکی کەموێنەی گوتن و مەقام بەناوی (مەڕبینی قەشە) بووە، شاگردەکانی ئەو ئوستادە دەنگخۆش و مەقام و غەزەل خوێنە نەمرە زۆرن، لەوانە: (پووتێ)ی مامی سێوە، نەشئەتی ڕەشیدئاغا، حاجییەگەورە، شێخ نەجمەدینی شێخ کەریمی بەرزنجی، حەنیلەخرە، عەبەی چایەچی، ئەمینی سەمەنی، ڕەفیقی چارچاو و هیتریش.

سەردەمی منداڵی خۆم لە (شاری کۆیە) باش لە بیرە، سێوەی هونەرمەندی گەورەی نەمرم لەبەرچاوە، کەسێکی قەبە و چوارشانەبوو، جلوبەرگی وەک هەندێک لەبەتەمەنەکانی ئەوسای دیانەکانی کۆیەی دەپۆشی، مەبەستم لەسەرەوە جگە لەجەمەدانی لە بەشی سەرەوەی جەستەی، لەسەرکراسەوە کورتەکێکی ناوبەلۆکەی لەبەردەکرد و لەخوارەوەش شەڵوارێکی سپی ئاودامەنی لە پێدابوو، دۆخینەکەی بەسەر شەڵوارە سپییەکەدا هەتا خوارچۆکی شۆڕببووەوە، بەوپێیەی بابم (ئەحمەدی حەمە مەلا ١٩١٣- ١٩٦٩) لەشاری کۆیە یەکێک بووە لە دەنگخۆش ومەقامزان و هەم ئاوازدانەرانی شارەکە، بۆیە بەندە، کە کوڕی تاقانەی بووم، هەندێکجار بۆ کۆڕەکانی مەینۆشی خۆی و برادەرانی لەنێو ڕەزوباخەکانی کۆیە بردوومی، کۆڕەکان جگە لە باسی کوردایەتی و نیشتمانپەروەری، گوتن ئامێزیش بوون، ڕێکەوتووە مەلا ئەسعەد و مامە سێوەش ئامادەی دانیشتنەکانیان بوونە و بە مەقام، غەزەل و گوتن لەگەڵ باوکم و هاوەڵانی بەشداربوونە، هەرکاتێک ئەوساتانەم وەبیر دێنەوە مووچرکی خۆشی دامدەگرێت و دەمهەژێنێت، بۆیە ئەمرۆ وەک دەڵێن: فرچکم بەو مەقام و گوتنە ڕەسەنانەوە گرتووە.



لەبیرمە بەهۆی دۆستایەتی نێوانییانەوە، مامەسێوە زۆرجار بۆلای بابم بۆ دووکانی کوتاڵفرۆشییەکەی هاتووە، ڕێکەوتووە هەندێک لەوجارانە بەندە لە دوکانی بابم بوومە، بابم یەکسەر گوتوویەتی: وریا، بڕۆ چایەکی خەست بۆ مامە سێوەت داوابکە، لە مەیدانی خوارێ چایخانەی شەهید (سلێمانی حەمە قاوەچی) بەرانبەر دووکانی بابم بوو، ئەوەبوو دەچووم و چایەکەم بۆ مامەسێوە داوادەکرد، دیارە بەندە ئەوسا منداڵ بوومە، ئەگینا چۆن جووڵەی سەیری لەم جۆرەم بەرانبەر ئەو هونەرمەندە گەورە و خۆشەویستە کردووە، جارێکییان مامە سێوە خەریکی خواردنەوەی چایەکەی بووە، بەندە چووبوومە پشتی مامەسێوە و



وریا ئەحمەد



سەیری دواوەی کولەجەکەیم دەکرد، سەرنجم دا لەلای چەپی پشتی مامەسیوە شتێکی گەورەی بەقەد (هێلکەیەک) لەبن کولەجەکەی بەرزبووەوە، بەندەش دەستم دا ئەوشتەیە و دیتم زۆرنەرمە، بۆیە گوتم: مامەسیوە ئەوە چییە؟ گوتی: کورِم ئەوە (لوو)ە.

بەندە هەر لەسەر دەمی منداڵییەوە بەهرەی موزیکم تیادا هەبووە و بەوهۆیەشەوە لەوساوە خۆشەویستیم بۆهونەری دەنگخۆشی و بۆدەنگخۆشەکان هەبووە، بۆیە زۆر نارەحەت دەبووم کاتێک دەمبیست خەڵکێکی بەناو موسوڵمان لەشاری کۆیە، لەوانەی گوتن بە (حەرام) دەزانن، دەمزانییەوە گاڵتەیان بەگوتن ودەنگخۆشی سیوەی نەمر کردووە.

> لەبیرمە بەهۆی دۆستایەتی نێوانییانەوە، مامەسێوە زۆرجار بۆلای بابم بۆ دوکانی کوتاڵ فرۆشییەکەی هاتووە، ڕێکەوتووە هەندێک لەوجارانە بەندە لە دوکانی بابم بوومە، بابم یەکسەر گوتوویەتی: وریا، برۆ چایەکی خەست بۆ مامە سێوەت داوابکە

گۆرانی مەزن ڕاستی فەرمووە:

***بەلێ دیارە لەناو قەومی بەسیتاقەدری سەنعەتکار***
***وەکوو عەکسی قەمەر وایە لەناو گۆمێکی لیخندا***

ئەگینا ئەوەتانێ زاتێکی وەکو (جەنابی مەلای گەورەی کۆیە) سیوەی گەورەهونەرمەندی کوردی بۆئاهەنگی دەرچوونی (فەقێیەکان) داوەت کردووە، ئەمە لەکاتێکدا ئاهەنگەکە لەنێو (مزگەوتی گەورەی کۆیە)دا بەڕێوەچووە.

داوەتیکردووە بۆئەوەی لەتەک (مەلا ئەسعەد)ی مەقام خوێنی دەنگخۆش (سیوەی غەیرەدین) وەک لە لایەن ئەوجۆرە کەسانەوە ناوی هاتووە، بانگهێشتی نێو مزگەوتی گەورە کراوە و لەگەڵ مەلا ئەسعەدا بەلام بەڕێزلێگرتنی زۆرەوە، بەگوتن و مەقام بەشدارییان لەوجۆرە ئاهەنگانەی نێو شاری کۆیە کردووە.

سیوە ساڵی (١٩٥٢) واتە لە تەمەنی گەورەوە ئینجا توانیویەتی بۆ ئێزگەی کوردی بەغدا بچێت، هەر لەو سەفەرەشدا ئەم مەقامانەی بۆ ئێزگەکە تۆمارکردووە: مەقامی (سەحەر) مەقامی (گوری ـ لەسەر مەقامی نیوەشەو یان حیجازە) مەقامی (بەیات ـ ئایشەگول) مەقامی (بەهار ـ بوهار ـ ئەمەشیان هەر لەسەر مەقامی نیوەشەوە) لەگەڵ مەقامی (کراسی شەنگ مێرەم) کەبەداخەوە ئەم مەقامەیان لەبەرئەوەی گوایە: ناوی (کچ یان ژن)ی ئاغایەکی کوردی سەرەک عەشیرەتی تیادا هاتووە مەقامەکە دزراوە و بزرکراوە؟!

زووتر لەشاری کۆیە و بەتایبەتی لەمانگی ڕەمەزاندا خاوەن چایخانە گەورەکان بۆسوود و هەم بۆ برەودان بەکارەکانییان، لە ناوەوە و لەدەرەوەی شاری کۆیەوە بانگهێشتی هونەرمەندانییان کردووە بۆئەوەی لەومانگەدا شەوان لە چایخانەکانیاندا ئاهەنگ سازبکەن، مامی کۆچکردووم (کەریمی حەمە مەلا ١٩٠٢ـ١٩٨٤) بۆی گێڕامەوە و گوتی: چایخانەکانی ئەوسای کۆیە وەک هۆڵە گەورەکانی ئاهەنگسازی ئەمڕۆ، لەمانگی ڕەمەزاندا شەوانە وەبەرنەکەوتوونە و جمەیان هاتووە، ئینجا یەکێک لەوهونەرمەندانەی بۆ ئەم مەبەستە چەند ساڵێک داوەتی شاری کۆیە کراوە، موزیکژەنی کۆچکردوو (عەبدولئەحەد جەردیسی قانونژەن)ی (ئێزگەی کوردی بەغدا) بووە، دیارە ئەوکاتانەی ئەو موزیکژەنە داوەتی شاری کۆیە کراوە و بەئامێری (قانوون) لەگەڵ گوتنەکانی سیوە بەشداری کردووە و ناسیویەتی، لەبەرئەوەی ئەوسا سیوەی نەمر دەنگی لە ئێستە مەبەستم ئەوکاتەی چۆتە بەغدا، دەنگی بەرزتر و جۆشدارتر بووە، بۆیە کاتێک سیوە بۆ ئێزگەی کوردی بەغدا چووە، ئەو قانونژەنە لەسەر هەمان چێنی پێشووی دەنگی بەرزی سیوەی جارانی بۆ ژەنیوە، سیوە پێی گوتووە: وەرە خوارەوە. دەی دەی عەبدولئەحەد چەندین پلەی دیکە وەرە خواری چونکە دەنگی بەرزی ئەوسای کۆیەم نەماوە! کەواتە، کاتێک سیوە لە ڕێکەوتی (١٩٥٢) بۆئێزگەی کوردی بۆ بەغدا چووە، دەنگی سەردەمی گەنجی جارانی نەمابووە، ئینجا لەگەڵ ئەوەشدا ئەمڕۆ، شارەزایانی گوتن و مەقام لە هەموولایەک شایەدی بۆ شێوەی گوتن و ئەدای مەقامەکانی و بۆ دەنگ و سەدای ڕەسەنی دەدەن، تۆبڵێی دەنگی ئەوسای سیوە واتە لەتەمەنی گەنجی چ جۆرێک بووبێت؟

سیوە بەوتەمەنەوە و بەودەنگە نزمەی

چەند مەقامێکی بۆ ئێزگەی کوردی بەغدا تۆمارکردووە، کەچی بەوچەند مەقامە کەمەی تۆماری کردوون (بەڵام چ جۆرە گوتن ومەقامێک؟ مەقامی ڕەسەنی ئەوتۆ کە تاموبۆی کوردییان لێدەتکێ) توانیویەتی بێتە ڕیزی دەنگخۆشانی پلەیەکەمی کورد.

بەندە هەر لەسەردەمی منداڵییەوە کاریگەری گوتن و مەقامەکانی ئەوسای سێوە، مەلا ئەسعەد، ئەحمەدی حەمەمەلای باوکم و گوتنە ڕەسەنەکانی دیکەم لەسەرە، لەهەمووشیان زۆرتر مەقامی (ئەوەل سەحەرە)کەی مامە سێوەیە، لەیادمە ئەندامانی (تیپی زیروبەم) ئەوە لە نەوەتەکان وەک هونەرمەندان: ئاراس کۆیی، زانا ئەنوەر تاهیر و ڕێبین جەمال ... هتد، چونکە بەرهەمە هونەرییەکانم واتە زۆرێک لە ئاوازەکانم لەسەر مەقامی (عەجەم ـ Major)ن، ناویان نابووم (مەلیکی عەجەم) دیارە مەبەستییان مەلیکی مەقامی عەجەم بووە.



سێوەی نەمر، هونەرمەندی کورد هەتا لە ژیاندا بووە، لەتەک کاری خۆی وەک (شەماس) لە (کڵێسا)ی کۆیە، خەریکی خزمەتی هونەری مەقام و گوتنی کوردی بووە.

**سەرچاوەکان:**

١) کەریم شارەزا، کتێبی (مەقامەکانی سێوەی هونەرمەندی کورد لەتەرازووی ڕەسەنایەتیدا)، ئەمینداریتی ڕۆشنبیری ولاوان، هەولێر ١٩٨٢.

٢) گۆڤاری (چلاواز)ی ژمارە (٣٤)ی کانوونی یەکەمی (٢٠٠٨) لاپەڕە (١٧). دەزگای موزیک و کەلەپووری کورد ـ هەولێر.

٣) وریا ئەحمەد، کتێبی (مێژووی گۆرانی و موزیکی ناوچەی کۆیە) ساڵی (٢٠٢٠) لەسەر ئەرکی زانکۆی سەلاحەدین چاپکراوە.



# شوناس و پێرفۆرمەنس لەنێو ڕەسەنێتی دەنگی سێوە دا

هەموو هونەرێکی مەزن بە پاڵپشتی کەلەپوورێکی زیندوو دەچێتە نێو مێژوویەکی پرشنگدار. ئێمە خوێندنەوەیەکی نوێگەریی کەلەپوورمان دەوێت، کە خۆی بە دوور دەگرێت لە کەوتنە نێو خوێندنەوەیەکی کەلەپووری بۆ ئەم سەردەمە، بە واتایەکی دی ئامانج لە پشت خوێندنەوەی خۆی وەک «خوێندنەوەیەکی هاوچەرخێتیی کەلەپوور» خۆ بەدوورگرتنە لە کەوتنە ژێر دەسەڵاتی کەلەپووری، بەڵام ئەمە مەترسیدارترین بابەتی هونەرییە، کە ئێمە بۆ (خوێندنەوەیەکی کەلەپووری ئەم سەردەمە) ڕادەکێشێت.

لەهەمانکاتیشدا درێژکردنەوەی ڕابردووشە بۆ ئەوەی لە جیاتی ئێستە و داهاتوو ڕەفتار بکات.

گۆرانیی یەکێکە لە کۆنترین جۆرەکانی ئەدەبی فۆلکلۆری گەلان. مۆرکی بە کۆمەڵ چڕینی گۆرانیی لەنێوان دوو واتای هونەریدا خۆی دەبینێتەوە، ژانرێک، کە تایبەتمەندی تاکە کەسیی پێوە دیارە و خۆی لە گۆرانیی کۆنباو دەبینێتەوە، ئەوەی دیکەیان بریتییە لە گۆرانیی چڕینی بە کۆمەڵ و گرووپی جۆراوجۆر، کە گوزارشت لە کایەکانی نێو کۆمەڵگادا دەکەن.

زۆربەی داستانەکانی کورد چ قارەمانانە و چ سۆزداری بێ، شەوانە بە گۆرانیی تاکە کەسی دەچڕدرێن. بۆیە با موزیکی کوردی بە کڕنووشەوە لەو دەرگایە بدات، کە زەمانێکە (حەسەن زیرەک، تایەر تۆفیق و سێوە) و ئەوانی دی لێوەی چوونەتە ژوورەوە، با موزیکی کوردیی تەنیا باگراوندێکی ئەو هەست و سۆزە ناسکە بێت، کە لە قورگی ناوبراوان دەردەچوو.


ئامانج غازی

کە باس لە دەنگەکان دەکەین داخی گرانمان لەو خاڵە هونەرییە دەست پێ دەکات، کە هەندێک لە گۆرانیبێژە ڕەسەنەکانمان دەرکیان بە ڕەسەنایەتی دەنگی خۆیان نەکردووە و نەیانتوانیوە حاڵەتە دەروونی و ناوەکی و دەرەکییەکانی خۆیانی پێ بخەنەبەر ڕۆشنایی لێکۆڵینەوە و دواندنی هونەری، بەمانایەکی دی بوارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیستەمی سیاسی ڕەنگدانەوەیەکی لاوەکی و سەرپێی هەبووە، لەنێو نەڕەی دەنگ و ترپەی ئیقاعی ماندووی ژیانی ڕۆژانەیان.

ئەگەر خاڵە (سێوە) بەو سرووت و سردووەوە دەقە نابینایە فرچکی کەوتبێ، کە لە کڵێساکانی (هەرمۆتە)ی بێناز دەکەوتنە بەر ڕەشەبای بێبەزەیی، ئەوکاتە دەتوانین سەرەتاییەک، یاخود ئەو هەنگاوە دەستنیشان بکەین، کە هەمیشە ئاوازی ڕەسەن دەبێ مێژوویەکی پڕ لە سەروەری و شانازی پاڵپشتی بێ، ئەدی خاڵە (سێوە) تۆزقاڵێک لەو ڕەوتە هونەرییە لانادات، کە دەنگ و خاڵە دەروونییەکانی ناوەوەی فەرمانی پێ دەکات لە دەربڕینی هونەری ئەو کاتە ترۆپکی داهێنانە، کە گۆرانیبێژ ڕاستەوخۆ مامەڵە لەگەڵ ژیانی واقیعیانەی خۆی بکات.

***(ئەری کوری کورە جوانی***

***سینگ سپین مەمک فنجانی)***

دەقێکی مردوو بووە، تا ئەو کاتەی بە ئاوازێکی ئەدلیب ( Adlib ) واتا ئاوازی بێ ڕیتم و ڕەزم گیانی بەبەرا کراوە، کە دەتوانین بە یەکەمین بەرهەمی کوردی لەقەڵەمی بدەین، کە هیچ کاریگەرییەکی دەرەکی و لاوەکی ئەم

و ئەوی بەسەرەوە نییە (مەبەست لێرەدا دەرو دراوسێی و جیران و دۆست و دوژمنە) مۆد مەقامی ئەو ئاوازە بێ ڕیتمە واتە مەقامی (حیجاز )ەو لەنێو میللەتە خۆرهەڵاتییەکان، کە بەزۆری و بۆری بەکارهاتووە، بەڵام ئەوەی، کە لێرەدا گرنگە و پێویستە ئاماژەی بۆ بکرێ ئەو خاڵانەی بێرەزمی (ئەرێ گورێ) دوو جەمسەری دژ بەیەک لەیەک کاتدا کۆبوونەتەوە، ئاوازی ئامێرەکانی موزیک، کە بە هیچ کلۆجێک ناچێتە خانەی ئاوازی ڕەسەن، تەنانەت (تەرجوومە)ی دەنگی ڕەسەنی خاڵە (سێوە)ش ناکات؟ واتە هیچ کات ئاوازی ئامێرەکان (ژەنینی باگراوندی ژەنیار و موزیسیانە غەیرە کوردەکان) نەیاتوانیوە خاڵە (سێوە) لەو ئازارە دەروونییە دابیرن، کە لەنێو عەقڵ و هەست و نەستیدا پەنگی خواردبۆوە، لە هەمان کاتدا ئەو ئاوازە ڕەسەنە بە هیچ لەو ژەنیارانە هەزم نەکراوە و نەیانتوانیوە مۆرک و ئەدای کوردی بەرجەستە بکەن و بیخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان، ئەمە سەرەتایەکە بۆ ئەوەی دەرک بەو حاڵەتە گرنگە بکەین، کە هەندێک ئاوازی ڕەسەنی ئاوازی کوردی هەن، کە مەحاڵن بەکەسێک بژەندرێن، کە هەڵگری گشت سیفەتەکانی ڕەسەنایەتی و مێژوویی و کولتووری دەوڵەمەندی کوردن. سێوەی هونەرمەند هونەرە خۆرسکەکەی لە خزمەت بابەتە هەنوکەییەکانی ئەوسا دابوو

پەروردەکردنی ئەم دەنگە هەمیشە لەبەردەم دادگای ڕۆحی هونەری (سێوە) دابووە، تایبەتمەندی هونەری (glesando) لەم دەنگەدا ئەو فۆرمە چڕینانەدا زۆر بە هەیبەت بەرچاو دەکەوێ، (Tempo) لە هەندێ شوێندا دەبێتە (poco a poco ritando).

## پانتایی مێژوویی و جوگرافی

گۆرانیی کوردیی، ئەمڕۆ زێتر پێویستی بە لێکۆڵینەوە و گەڕانی مەیدانی هەیە، بەواتایەکی دی گرێدانی کۆنگرەیەک، کە زۆر مەسەلەی هەڵایساو هەن پێویستییەکی هەنووکەیی زۆر گرنگە، تا کەف و کوڵی هونەرمەندان



دامرکێتەوە و دووبارە بابەتە گرنکەکانی گۆرانیی کەلەپووری کوردیی بەهاوچەرخێتی و ئەزموونی نەوە و پێشەنگەکانی هونەری ببەستێتەوە، ئەوەی، کە زۆر شت بە یەکەوە گرێ دەدا تەنیا و تەنیا هونەرە.

هونەرێک بتوانێت ببێتە بەدیلی زمان و بتوانێ ڕەوشی میللەتێک بەرەو کاروانی نەمری ببات، با هەنگاوەکانی ئەمڕۆ لەسەرخۆ بن، چونکە گرنگ ئەوەیە بنەما، کۆڵەکە، بناغە و دارشتنەکانمان پتەو و کوردییانە بن!





# سێوە و وارێ گوڕێی ژاکاو

لە بەرزایی لووتکەی موزیکی دۆڵی سماقوڵی، لە کۆتایی دەشتی کۆیە و بازنەی زێی زێڕین و بەستی شەرغە بەشاقوڵی، تا چوارچێوەی چیای گۆرقەرەج، باواجی، هەیبەسوڵتان، ئاوەگرد و کەکۆن، کانگاو پێگەی ئاوازی ڕەسەنی کوردییە بە ئاوازی ریتم و هارمۆن، ئەوەی ڕوونە، بۆ نموونە؛ ڕەشیدی حاجی عەبدوڵڵای میرزا عەزیز ناسراو بە (ڕەشۆڵ) دانا عەبدولجەبار، ڕەنج هەڵەبجەیی، ئاواز حەسەن، پەیمان عومەر، حەمە ڕانییەیی و ئەردەلان بەکر...ئەو هونەرمەندە ناودارانە خەڵکی شاری کۆیەن، لەنێو گڕی گەشاوەی ئەو پشکۆیەن، هونەرمەندی بزرو گومناو: وەسفیە مستەفا خۆشناو، یەکەم کچە، کە گۆرانیی سیاسی لە کۆیە کردە باو.

جاران کۆیە هۆڵی تاقیکردنەوەی خۆشخوان و گۆرانیبێژان بوو، یانەی ئەدەب و هونەر، سەکۆ و مەکۆی بوێژان بووە، ژووری کەیفی هەبووە لە پلەی پەسندیی و ڕاڵێبوون دەدرا بە هونەرمەندان، تاکتاک و بەگرووپ دەهاتنە کۆیە، وەک: سەید عەلی ئەسغەری، ئەحەی ناسر، کاوێس ئاغا، شەهاب هەولێری ... . ئەو هونەرمەندانە مەزن و دیارو لێهاتوو بوون، بە مەبەستی هونەر و بەزمورەزم بۆ ژووری کەیفی هاتوون، بنەمای سەرەکی ئاواز، مەقام و سروود لە کۆیە دەگەڕێتەوە بۆ ئاهەنگی مەولوود، کە هێلانەی نەغمە خوانان بووە، گوڵزاری پڕ هوزاری جوانان بووە، لەو هونەرمەندە گەورە و دەگمەنانە، کە سەرکاروانچی ڕەسەنانە (سێوە)ی هونەرمەندە، خواجە یەلدا صلیوە، کە ناسراوە بە(سێوە)

لە ساڵی ١٨٩١ لە شاری کۆیە لە گەڕەکی دیانان هاتۆتە ژیان و کەوتۆتە ڕێ، ساڵی ١٩٠٢ لای قەشە حەنا و قەشە گۆرگیس ڕەبەن بنچینەکانی ئایینی مەسیحی خوێندووە، زمانی کلدانی و عەرەبی و فەرەنسی، فارسی فێربووە، لەکن قەشە سوورە خوێندنی تەواو کردووە، لەپاشا بۆتە شەماشە، ساڵی ١٩٠٣ خواجە یەلدەی باوکی مردووە، بۆ بژێوی ژیان، پەنای بۆ کار بردووە، بۆتە شاگردی مووڕێسی جۆلایی لەکن وەستا خواجە یووسف، لەوێ عەشقی وارێ گوڕێی کچی خواجە یووسف بووە، خواجە یووسف وارێ بە سێوە نادات، ئەو عەشقە نەمرە، کە ناگات بە ئاوات، سەرئەنجام وارێ دەمرێ توشی سیل دەبێ، سێوەی عاشقی هیوابڕاو و سووتاو و زەلیل دەبێ.

***پیرۆزی نیانان مەریەن قەنیشە شیخی نیریشە و محەمەنیشە خاچی کەنیسەی خەڕەکی نیانان مەی و مووڕیسی گەڕەکی نیانان ئاگری پاییزە جەژنی مێلکە و خاچ ئیلۆخ بریخە بە باوەش و ماچ، کویەی شەرابی کۆنی (کەنیسە) می (میلان)یە و نەستی(مەنیسە)***

سێوە هونەرمەندێکی مەزن و مەقامبێژ، خاوەن ڕێبازێکی تایبەتی و بەهێز و بەچێژ، مەقامەکانی لەسەرچاوەیەکی قووڵ و قایمی کوردەوارییەوە هەڵقوڵاون، بۆیە لە ناخی دەروون و ویژدانی خەڵک چەسپاون، گۆرانیی و مەقامەکانی ڕەسەنن، خۆش زاراوە و شیرین و گوڵسەمەنن، پڕن لە کێشەی لاوان و ئەوین و ڕاستگۆیی و وەفاداریی، پڕن لە سروشتی کوردستان و مێژووی کوردەواری، ئەوەل سەحەرە، سیحری هونەرە، بەو دەنگە ئەفسوناوییە، بەو گەرووە ئاگراوییە، خارە سێوە پەڕپووت بوو و پەشێوە، هەژار و نەدار



ڕەهبەر سەید برایم

و بەرگ شڕ و دەست کورت، هەروابووە، گوزەران و چارەنووسی هونەرمەندانی کورد، هەرکەسانێکی شۆڕەسوارە مەزنەکەی من ناناسی، ئەوەتانێ ژیانی بردەسەر بەهەژاریی و قوربەسەری و کەساسی.

***سەد حەیف و سەد مەخابن لەوێ کەونە دنیایە هونەرمەندمکی وامەزن لەسەرلوتکەی هونەردایە حەیفە بمرێ بەهەژاری و نەداری قەدرزانی نەبوون بە کرپاری***

نەمر خارە سێوە، هەر شەکرەسێوە، شەکرەسێوێکی مێخەک ڕێژ، قەد کۆن نابێت درەوشاوەیە، وەک ئەستێرەی گەلاوێژ.

پووتێ مامی سێوە بووە، حەنیلەخرە لە مەقامات، ئوستازی سێوە بووە، دەنگی سێوە دەلەرییەوە وەک پۆلا دەنگی دەهات، وەستایانە لە ئوستازەکانی فێربووە، زۆر کەس بەسەدای سێوە خەوی لێکەوتووە.

***کلێیەمەشخەلانی گرە فێرگەی هونەرە، خۆشخوانی پرە مەربین و پووتێ حەنیلەخرە مەربین صلێوە و شەعیە و ئەبرەها***



***شاگردی سێوەن بە ژێ و جەمجەمە***

گۆرانیی و مەقامەکانی خارە سێوە لێوان ڕێژن لە ڕەسەنایەتی، تۆمار و سیمفۆنیایەکی ڕاستگۆییە لە ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی ڕەسەنن، مەقامەکانی گۆرانییە بەتامەکانی موڵکی کوردن، بۆ کورد گوتراون، وەستایانە بە کەرەستەی کەلەپووری کوردەواری داڕێژراون:

***ئەگەر جەلادان دەگرنەوە چوار گۆشەی مەیدانێ وارە گورێ بەکەم کەس دەگوترێ و کەس وەک ئەو ناتوانێ لە گورێ لە سوورە گورێ لە نارنجێ لە تورنجێ لە لیمۆیە***

هەرگیز وەک خارە سێوە پەیدانابێتەوە لەکۆیە

ئەم هونەرمەندە ڕەسەنە لەتەمەنی حەفتا و سێ ساڵی ١٩٦٤ بنە و بارەگای پێچایەوە و لە گۆڕستانی هەرمۆتە بە خاک سپێردراوە.

**نامرێ دەنگی دەمێنێ لەگەڵ زمنگی کەنیسا.**





# سێوەی هونەرمەند
# ١٨٩١ - ١٩٦٤/١٢/٩

سێوە یەکێکە لە هونەرمەندە ڕەسەنەکانی کورد، هەموو ئاوازی گۆرانییەکانی لەنێو کەنیسە هەڵێنجاوە.

ساڵی (١٨٩١) لەگەڕەکی بەفری قەندی لەشاری کۆیە هاتووتە دونیا. قۆناغەکانی خوێندنی لەنێو کەنیسەی (مار یووسف) لەکۆیە تەواو کردووە، زمانی کلدانی بە خوێندن و نووسین زۆر بەڕەوانی زانیوە. لەسەردەستی قەشە گۆرگیس پلەی شەماشە (شەماس)ی وەرگرتووە.

لە ساڵی (١٩٢٠) بۆ جاری دووەم و بۆ بەرزکردنەوەی پلەی (شەماس) لەلای قەشە (حەننا) خوێندوویەتی، بەم هۆیەوە زیاتر خولیای کەنیسە و ئاوازەکانی بووە، دەنگی سۆزێکی تایبەتمەندی هەبووە، کە سەرنجی خەڵکەکەی بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە، بەتایبەتی ئەوکاتەی لە هەڕەتی توانا و وزەی خۆی بووە، دەنگێکی زوڵاڵی هەبووە، ڕەنگە ئەو کیژەی، کە حەزی لێ کردووە زیاتر پاڵی بەسێوە نابێت، هەموو یەکشەممە و جەژنەکان دەنگی وەکو زەنگوڵە بلەرێنێتەوە.

لە کۆڕ و کۆبوونەوە و دیوەخانەکانی ناودارانی کۆیە بانگهێشت دەکرا و بە گۆرانییەکانی مەجلیسی گەرم دەکرد، هەربۆیە دەبێتە بنیشتە خۆشەی سەر زاری خەڵکی کۆیە.

ئەو مەقامانەی کە لەئێستگەی ڕادیۆی کوردی لەبەغدا تۆمارکراون ئەمانەن:

١. سەحەر
٢. شەنگ مێرەم
٣. بەهار
٤. گوڕێ
٥. عایشەگوڵ

زۆر مەقامی دیشی گوتووە، بەڵام تۆمار نەکراون. سێوە هەروەکوو خۆم دیومە پیاوێکی ڕەش ئەسمەر و بەژنی مام ناوەندی و پشتی قەمیوور بوو.

سێوە هەموو کات جلکی کوردی لەبەر دەکرد، کورتەک و شەڕواڵی مرادخانی و پشتێن و کڵاو و جەمانەی کۆییانەی دەبەست.

لە دوای ئەوەی تووشی نەخۆشی دەبێت لەتەمەنی (٧٣) ساڵیدا کۆچی دوایی دەکات لە (١٩٦٤/١٢/٩) و لەگۆڕستانی (مارت شمونی) لە گوندی (هەرمۆتە) بەخاک دەسپێردرێت.

گۆرانییەکانی ڕەنگدانەوەی سروشت و جوانیی و دڵداریی و شۆخ و شەنگی کیژی کوردستان بوون.

لە کۆڕ و گۆرانییەکانیدا لەگەڵ حەنیل، نەشئەت ڕەشید ئاغای حەویزی، عەبەی چایچی، مەرنێن قەشە، مەلا ئەسعەد، ئەحمەدی حەمە مەلا و پووتا) سەرمەشقی گۆرانیی گوتن بووە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی لە شاری کۆیە و هەموو کوردستان دەنگ بداتەوە، بەتایبەتی دوای تۆمارکردنی ئەو (پێنج) گۆرانییەی لە ئێستگەی کوردی بەغدا. کە دواجار گۆرانیی

**سێوە هەموو کات جلکی کوردی لەبەر دەکرد، کورتەک و شەڕواڵی مرادخانی و پشتێن و کڵاو و جەمانەی کۆییانەی دەبەست**



دکتۆر
جەمیل عیسا



(سەحەر)ە بووە ناسنامەی (مامە سێوە)ی هونەرمەند.

سێوە هەوڵی زۆری داوە بۆ فێربوونی زمانەکانی عەرەبیی و فارسیی. بەشێکی زۆری لە شیعرەکانی شاعیرانی کۆیەی لەبەرکردووە.

ئەو سەردەمانە کۆیە بە شاعیری بەناوبانگی وەکو حاجی قادر، دڵدار، ئەختەر، صافی، قاسید، عەبدوڵلا بەگی میسباح و شاعیری دیش باناوبانگ بوو. سێوەی هونەرمەند خۆی بە شیعرەکانیان جۆش دەکرد و بە بەستە و مەقام دەیگوتنەوە و کوڕی جاحێڵەکانی ئەو سەردەمەی دەخستە جۆشوخرۆش. لە حەمامۆک، تاتوکان، هەیبەت سوڵتان، چنارۆک و کەکۆن، دەنگی ئەو گۆرانیبێژانە دەنگی دەدایەوە، بەتایبەتی ئەو کاتە کۆیە کەوتبۆوە نێوان شیوی ڕەزان و کەکۆن، ئەو گەڕەکانەش بەسەریەکەوە بوون، شار بێ دەنگ و بێ هەراوهۆریا بوو، هەربۆیە دەنگی گۆرانیبێژەکان دەگەیشتە هەموو شوێنێکی نێو شار.

مامۆستا (کەریم شارەزا) کتێبێکی لەسەر سێوەی هونەرمەند و مەقامەکانی نووسیوە و ئاماژەی بەچەند گۆرانییەکی وی داوە، کە



لە تۆمارگە و ئێستگەی کوردی بەغدا تۆمار نەکراون: سەحەر، بەهار، گوڕێ، تەنگ مێرەم، عایشەگوڵ، جگە لەم پێنج گۆرانییە ئەمانەی تر تۆمار نەکراون: لەبەرنازی چاوبازان، نیوەشەو، حەریقی ئاگری دووریم، لەباغان ئاهونالین دێ، بەقامەت خەرامان، زولف و ئەگریجەی یار، شلەو خانان، جەبارە جەبارە.

خاڵە سێوە یان لەساڵانی پەنجاکانەوە ئاشنایەتی لەگەڵ هونەرمەندی گەورە تایەر تۆفیق هەبووە و حەزی لە گۆرانیی و مەقامەکانی تایەر دەکرد.

گوێشی لە گۆرانییە عەرەبییەکانیش دەگرت، سەرسام بوو بە گۆرانییەکانی محەمەد عەبدولوەهاب.

گۆرانییەکانی سێوە و عیشقی بۆ واری وا دەردەکەوێت پیاوێکی دڵتەڕ بووەو باس لەوە دەکرێت، کە نوکتەی خۆش و خۆش مەجلیس بووە، گۆرانییەکانی هەموو خەڵکی شاری کۆیەی بەلای خۆدا ڕاکێشابوو.

برادەرایەتی هونەرمەندەکانی دیکەشی دەکرد، وەک باکوری، تایەر تۆفیق، ڕەسووڵ گەردی ، حەوێز وەهاب، محەمەدی چایەچی، ئەحمەدی حەمە مەلا، مەلا ئەسعەد و ئەوانی دی. لەئاهەنگ و بۆنەکانیش شایی و سەرچۆپی کێش بوو.

لەکۆڕێکدا کە بۆ بەڕێز مامۆستا کەریم شارەزا

***زۆرێک لە مۆسیک ژەنەکان لێکدانەوەیان بۆ مەقامەکانی کردووە و باسی ئەو هونەرمەندە گەورەیان کردووە، بەتایبەتی مامۆستا وریا ئەحمەد، مامۆستا باکووریی، مامۆستا زاهیر محەمەد و مامۆستا سەردار ئەحمەد***

و بەندە ڕێکخرا بوو، لە (کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کلدان) لەشاری عەنکاوە باسمان لەگۆرانیی و هەڵوێستەکانی ئەم هونەرمەندە کرد، بەتایبەتی لە بۆنەکانی نەوروز، کە بە دەنگە بەسۆزەکەی خەڵکی جۆش دەدا.

ئەم هەستە نەتەوایەتی و نیشتمانپەروەریەی خاڵە سێوە هاندەرێک بوو بۆ سەلماندنی جەژنی نەتەوایەتی و ڕاوەستان لە دژی ڕژێمی ئەوکات.

هەربۆیە خەڵکی کۆیە لەو بۆنانە بانگهێشتیان دەکرد. ئێستە ئەم کۆڕە لەلایەن (ئەمیر محەمەد کەبابچی) تۆمارکراوە و پێم وایە لەفەوتان ڕزگاری بووە.

جگە لەم سەرگوزشتەیەی، کە باسم کرد. توێژینەوەیەک لەسەر گۆرانییەکانی لەلایەن (پ.ی دکتۆر هاوژین صلیوە و بەڕێز ئارەزو ئیسماعیل) کراوە، بەناوی (سێوە و دڵدار لەچەند دیدارێکدا).

هەروەها زۆرێک لە مۆزیک ژەنەکان لێکدانەوەیان بۆ مەقامەکانی کردووە و باسی ئەو هونەرمەندە گەورەیان کردووە، بەتایبەتی مامۆستا وریا ئەحمەد، مامۆستا باکووریی، مامۆستا زاهیر محەمەد و مامۆستا سەردار ئەحمەد.

سێوەی هونەرمەند زۆر سەرسام بووە، بە (حەنیل) لە گۆرانیی و مەقاماتدا بە مامۆستای خۆی داناوە. جگە لەمەش خاڵە سێوەی هونەرمەند بەشدار بووە لە کۆڕس بۆ گۆرانی گوتن، کە حەمە گەمحانی چایەچی، لەگەڵ مامۆستا باکووریی، حەمەدەمین عەباس، مەلا ئەسعەد و حەمەدەمینی کەبابچی. هەندێکیان تۆمارکردووە.

مامۆستا سەردار ئەحمەدی (باب سەردار) کە بلوێرژەنێکی ناوداری کوردستانە باس لە سێوە دەکات وەکو گۆرانیبێژێکی ڕەسەن.

بەتایبەتی باسی گەشتێکیان دەکەن، کە چوونەتە ڕانیە، خاڵە سێوە، سەلاح محەمەد و عەدنان جەمال-یشیان لەگەڵدا بووە، بۆ ئاهەنگگێڕان.



- **رۆڵی قوتابخانە ئاینییەکان و سیستەمی خوێندنی فەرمی لە کوردستانی باشوور (١٨٦٩-١٩٤٠) -**

**بەشی یەکەم**

ئیحسان ڕەشاد موفتی

# ڕۆڵی قوتابخانە ئایینییەکان و سیستەمی خوێندنی فەرمی لە کوردستانی باشوور ١٨٦٩ – ١٩٤٠

ئیحسان ڕەشاد موفتی

بەشی یەکەم

پێش ئەوەی بچینە نێو باسی سەرەتای خوێندن لە کوردستانی باشوور، کە لەنەخشەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی لەچوارچێوەی (ویلایەتی مووسڵ) دیاری کراوە، کە لکێنرا بەدەوڵەتێک بەناوی عێراق، ئەو عێراقەی، کە تەنیا سەدەیەکە وەک دەوڵەت لەسەر نەخشە دیاریکراوە.

ئەگەرچی ناوی (عێراق) زۆر کۆنە، بەڵام بەدرێژایی مێژوو، پێش ئیسلام و لەکاتی سەرهەڵدانی ئیسلامیشدا، دەوڵەتێک، یان قەوارەیەک نەبووە ناوی عێراق بووبێت، بەڵکو شتێکیش نەبووە بە ناوی (نیشتمانی عەرەبیی)

سەرەتای خوێندن لە باشووری کوردستان، لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی، پێش دەرکردنی یاسایێک بۆ خوێندنی فەرمی، لەشێستەکانی سەدەی نۆزدەهەم، خوێندنی ئایینیی هەبووە، لەنێو مزگەوت و تەکیە و خانەقاکان، لەگەڵ شوێنی تایبەت بۆ فێرکردنی منداڵان بە نووسین و خوێندنی قورئانی پیرۆز، ئەم شوێنانە بە (مکاتیب) ناسرابوون. قوتابخانە ئاینییەکان رۆڵێکی دیاریان هەبووە لەدرێژەپێدانی خوێندن لە بازنەیەکی سنووردار، بەڵام لەهەمان کاتدا ئەم قوتابخانە ئاینییانە دەیان زانا، نووسەر، شاعیر و ڕۆشنبیری ناوداریان پێگەیاندووە و ناویان لەنێو لاپەرەکانی مێژوو تۆمار کراوە.

ئەم قوتابخانە ئاینییانە، تا سەدەیێک دوای دەرچوونی یاسای خوێندنی حکوومی لە لایەن دەوڵەتی عوسمانیی، هەر بەردەوام بوون، ئەم قوتابخانانە سەرەتا پاڵپشت بوون بۆ تێکەڵبوونی قوتابیان بەقوتابخانەکانی حکوومی. لەکوردستاندا ئەم قوتابخانە ئاینییانە تا نیوەی سەدەی ڕابردوو بەردەوام بوون، پاشان بە یاسایەکی تایبەت بە چەندین قۆناغ لەنێو خوێندنی حکوومی ڕێکخران.

١- خوێندنی ئایینیی لەهەندێک لایەن بابەتی هاوبەشی هەبوو لەگەڵ خوێندنی حکوومی، لە خوێندنەوەی ئەلفوبێی زمانی عەرەبیی، خوێندنی قورئانی پیرۆز، زۆربەی قوتابیانی خوێندنی ئایینیی، کە قۆناغی نووسین و خوێندنی قورئانیان تەواو دەکرد، وازیان لە خوێندن دەهێنا و دەستیان دەکرد بەکارکردن لەپیشەی جیاواز بەمەبەستی یارمەتیدانی خێزانەکانیان بۆ بژێوی، بەڵام بەشێکی کەمیان لە خوێندن بەردەوام دەبوون.

٢- فێرکردنی ئەلفبێ و خوێندنی قورئان بە منداڵان، زۆرجار لە ژوورێک بوو، لەنێو مزگەوت، یان تەنیشت مزگەوت، کە لە جیهانی عەرەبی ئیسلامیدا بە (الکتاتیب) ناسراوە و بە سەرپەرشتی مامۆستایەک، کە زانیارییەکی باشی لەسەر ئایینی ئیسلام هەبووبێ، تێیدا خوێندن و نووسین و قورئانی پیرۆز و هەندێک زانیاریی گشتیی لەسەر ئایین، فێری قوتابیان دەکرا، ئەمە جگە لەوانەی (حیساب) ژمێرەی ئاسان کراو.

٣- سەرەتای خوێندن لەگشت قوتابخانە ئاینییەکان لەشار و شارۆچکەکانی کوردستان، لەچەند ژوورێک لەنێو مزگەوت پێکدەهات (مامۆستایان-مەلا) ژوورێکی تایبەتیان هەبوو بۆ (قوتابیان-فەقێ) خوێندن لەنێو مزگەوت بەشێوەی بازنەیی بوو.

قوتابی بەچەند قۆناغێکدا تێپەڕ دەبوو، وانەکان بریتی بوون لە (فقە، تفسیر، تەجویدی قورئان، زمانی عەرەبیی و بەشەکانی) زۆرجاریش قوتابی ناچار دەبوو ئەم شار و ئەو شار بکات، بۆ

تەواوکردنی خوێندنەکەی لەسەر دەستی زانایەکی ئایینیی ناودار، تا پاش (٩-١٢) ساڵ لەخوێندن، ئیجازەی (مەلای ١٢ عیلم) بەدەست بێنێ، ئەو جۆرە خوێندنە سێ قۆناغ بوو (فەقێ – سوختە – موستەعید) دوای تەواوبوونی، قوتابی ئیجازەی مامۆستای ئایینیی وەردەگرت و بەو بۆنەیەشەوە ئاهەنگێک ساز دەکرا.

کاتێک قوتابخانەی عوسمانیی بەفەرمی کرایەوە، ئەو قوتابیانەی لەمزگەوتەکان فێرە خوێندن و نووسین ببوون، بەگوێرەی ئاستی خوێندن و تەمەنیان لە قوتابخانەی سەرەتایی وەردەگیران، یا یەکسەر دەچوونە قوتابخانەی ڕوشدیە (ناوەندیی) بۆیە خوێندنی مزگەوت بەشێکی گرنگ و یاریدەدەر بوو بۆ قوتابخانەکانی خوێندنی فەرمی سەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی، بۆ دواجار داخرانیشی بەداگیرکردنی کوردستانی باشوور لەلایەن سوپای ئینگلیزەوە کۆتایی هات.

٤- عێراقی عوسمانیی، زاراوەیەک بوو بۆ سێ ویلایەت بەکار دەهات (بەسرە/ بەغداد/ مووسڵ) لەنەخشەی کۆنی عێراق، ویلایەتی بەسرە و بەغدا، بەعێراقی عەرەب دەناسران، کوردستانی باشوور و ویلایەتی مووسڵ-یش بە (عێراقی عەجم)

**یەکەم یاسای خوێندنی فەرمی**

**دەوڵەتی عوسمانیی ١٨٦٩ز**

**مەلا، ژوورێکی تایبەتییان هەبوو بۆ قوتابیانی فەقێ، بۆ خوێندن لەنێو مزگەوت، کە بە شێوەی بازنەیی بوو**

١- لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی هەستی بەگرنگیی ڕێکخستنی پەروەردە کرد، بۆیە لەساڵی (١٨٦٩ز) یاسای خوێندنی فەرمی دەرکرد (قانون التعليم الحكومي) ئەم یاسایەش کچان و کوڕانی دەگرتەوە لەگشت ویلایەتەکانی ئیمپراتۆریەتەکە، کە لە (٢٩) ویلایەت پێکهاتبوو.

ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی، جیهانی عەرەبی بەسەر (١٠) ویلایەت (پارێزگە) دابەش کردبوو: مووسڵ، بەغدا، بەسرە، حیجاز، یەمەن، دیمەشق، حەلەب، بەیروت، میسر، جەزائیر، تونس و تەرابلوس. هەرێمی باشووری کوردستان-یش بە ویلایەتی مووسڵ ناسێنرابوو. ویلایەتەکانی وەک (وان دیاربەکر و بەدلیس) و هەندێک ویلایەتی دیکەی کوردستانی باکووری دەگرتەوە.

٢- ئەو جۆرە ئیدارەکردنەی ویلایەتەکان لەساڵی ١٨٦٧ز پەیڕەو دەکرا، هاوکات بوو لەگەڵ دەرچوونی یاسای



بەشێک لە لاوانی کورد لە کۆلێژ و قوتابخانە جیاوازەکانی بەغدا ساڵی ١٩٢٦

**له یاسای خوێندنی فەرمی دەوڵەتی عوسمانیی، کە لەساڵی ١٨٦٩ز دەرچوو، هاتبوو، کە خوێندنی سەرەتایی بێ بەرانبەرە و لێدانی خوێندکاریش قەدەغەیە**

خوێندنی فەرمی. ئەوەی تێبینی دەکرا لە جێبەجێکردنی ئەم یاسایە، دواکەوتنی کردنەوەی قوتابخانەی کچان بوو لە زۆربەی ویلایەتەکان.

یەک لەو هۆکارانەی دواکەوتنی، دژایەتی کۆمەڵگە بوو بۆ ناردنی کچان بۆ قوتابخانە، هەرچەندە منداڵانی کچ و کوڕانی هاووڵاتیانی جوو و کریستیان، ئەو کێشە کۆمەڵایەتییەیان بەراورد بەموسڵمانەکان زۆر کەمتر بوو، بۆیە کچان و کوڕان زووتر چوونە قوتابخانە تایبەتییەکانی خۆیان.

٣- دوای ٢٧ ساڵ لەسەر دەرچوونی یاسای عوسمانیی بۆ خوێندنی فەرمی، یەکەم قوتابخانەی کچان لەساڵی ١٨٩٦ز لەشاری مووسڵ کرایەوە و بەدوای ئەویش بەسێ ساڵ، لەساڵی ١٨٩٩ز یەکەم قوتابخانەی کچان لەویلایەتی بەغدا کرایەوە. لەشارەکانی وەک هەولێر، کەرکووک و سلێمانی لە کوردستانی باشوور، قوتابخانەی کچان پێش کۆتایی بیستەکانی سەدەی ڕابردوو کرایەوە، ئەویش دوای ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی، لە ماوەی داگیرکردنی وڵات لەلایەن سوپای ئینگلیز و دامەزراندنی دەوڵەتێک بەناوی عێراق.

٤- ئامانجی سیاسەتی پەروەردەیی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی، بۆ دەرکردنی یاسای خوێندن، سەرتایێک بوو بۆ دروستکردنی قوتابخانەی فەرمی، هاوشێوەی سیستەمی وڵاتانی ئەوروپیی، لە ڕووی دابەشکاریی ئیداری و پرۆگرامەکانی خوێندنەوە، عوسمانییەکان پەروەردەیان بەسەر چەند قۆناغێک دابەش کردبوو:

- خوێندنی سەرەتایی چوار ساڵ بوو.
- ناوەندیی ڕوشدیە، سێ ساڵ
- خوێندنی ئامادەیی (ملکی و سەربازیی) (فەرمانگەکانی ئامادەکاری) چوار ساڵ
- کۆلێژی تایبەتمەند و خوێندنی بەرز.

٥- یەکەم یاسای خوێندنی فەرمی دەوڵەتی عوسمانیی ئەنجوومەنی زانستیی لە ویلایەتەکان پێکهێنا، کە سەرپەرشتی جێبەجێکردنی یاسای خوێندنیان دەکرد.

بۆ نموونە مەرجی کردنەوەی قوتابخانەی ڕوشدیە



نموونەیێک لەقوتابخانەکانی حوکوومی سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیی، قوتابیان تەنیا دوو، یان سێ مامۆستایان هەبوو، زۆرجاریش قۆناغی سەرەتایی و ناوەندیی (ڕوشدیە) لە هەمان قوتابخانە دەبوون لەبەر کەمی ژمارەی مامۆستان

(ناوەندیی) دەبووایە پێنج سەت خانوو لەو شارە هەبێ، بۆ هاوڵاتیانی جوو، بۆ کرستیانەکانیش مەرجەکە سەت خانوو بووە، ئەو جیاوازییە لەژمارەی خانووی نێوان موسڵمان و کرستیان، ڕەنگە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە، کە ژمارەی چوونی منداڵانی موسڵمانان بۆ قوتابخانە زۆر کەمتر بووە بەبەراورد بەناردنی منداڵانی جوو و کرستیان.

٦- بابەتەکانی خوێندنی سەرەتایی بریتی بوون لە (ئەلفوبێ، قورئانی پیرۆز، تەجوید، زانینی بارودۆخ، فێرکردنی نووسین، بنەماکانی حیساب، مێژووی عوسمانیی، تۆماری جوگرافی، زانیاریی بەسوود و تەندروستیی).

لە یاسای خوێندنی فەرمی دەوڵەتی عوسمانیی، کە لەساڵی ١٨٦٩ز دەرچوو، هاتبوو، کە خوێندنی سەرەتایی بێ بەرانبەرە و لێدانی خوێندکاریش قەدەغەیە.

یاسای خوێندنی ئەو سەردەمەی سەدەی نۆزدەم بنەماینکی گرنگ بوو بۆ پەرەسەندنی خوێندن، هەرچەندە عوسمانییەکان درەنگ هەستیان بەو گرنگییە کرد.

هەندێک ڕێنمایی لەجۆری وانەکان و درێژی کاتی وانەکان، کە لە یاسای خوێندن هاتبوو، کاتی وانەکانی دیارکردبوو

**خوێندنی ئایینیی سێ قۆناغ بوو (فەقێ، سوختە، موستەعید) دوای تەواوبوونی قوتابی ئیجازەی مامۆستای ئایینیی وەردەگرت و بەو بۆنەوە ئاهەنگێک ساز دەکرا**

بە چل خولەک، هەروا پشووی نێوان وانەکان بە پانزە خولەک دەسنیشان کرابوو، کاتی خوێندنی بەیانی، لە کاتژمێر ٨ تا ١٢ بوو، دوای تەواوکردنی ئەو ماوەیە قوتابیان دەگەڕانەوە ماڵ، دوو کاتژمێر پشوویان دەدا، دوای ئەوە جارێکی دیکە لە کاتژمێر دوو دەگەڕانەوە قوتابخانە، تا کاتژمێری چوار.

بەیانیان ماوەی دەستپێکردن و گوتنی سروود و ئامادەکاری بۆ ڕۆیشتن بۆ پۆلەکان (١٠) خولەک بوو. نووسەری کتێبی (مێژووی خوێندن لە عێراق لە سەردەمی عوسمانیی) (عەبدولڕەزاق هیلالی) پشتڕاستی دەکاتەوە، کە لە ڕێنماییەکاندا هاتووە، وانە گرنگەکان دەبێت لەماوەی بەیانیان دابنرێن، وەک: قورئانی پیرۆز، زانیاری ئایینیی، هاوڕێییەتی، ئەخلاق، زمانی تورکیی، مێژوو، جوگرافیا، ژمێریاریی و ئەندازە.



کەرکووک- قوتابخانەی نەهێشتنی نەخوێندەواری ساڵی ١٩٣٣

دوای پشووی دوو کاتژمێر وانەی پراکتیکی و سووک، وەک: کشتوکاڵ، وێنەکێشان، مۆسیقا، سروود و وەرزشی جەستەیی، دەخوێندران.

سەبارەت بە پۆلی یەکەم و دووەم، تاقیکردنەوە بەشێوەی زارەکی لە ڕێگەی لیژنەیەکەوە ئەنجام دەدرا، کە پێکدەهات لە مامۆستای بابەت و هەندێک کەسایەتی دەرەوەی قوتابخانە، هەروا لە یاساکە هاتبوو: کەمترین نمرەی دەرچوون بریتییە لە پێنج نمرە و زۆرترین نمرەی دەرچوونیش بریتییە لە (١٠) نمرە.

لەبەدواچوونی ئەو بابەتەدا تێبینی ئەوەم کرد، کە ئاسەواری یاسای خوێندنی عوسمانیی کاریگەری خۆی لەسەر یاساکانی خوێندن دوای ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانیی بەجێهێشتوە، لەشێوەی کاتی خوێندنی بەیانیان و پاش نیوەڕۆیان لەنێو قوتابخانەکان نزیکەی

**یاسای خوێندنی ئەو سەردەمەی سەدەی نۆزدەم بنەمایێکی گرنگ بوو بۆ پەرەسەندنی خوێندن، هەرچەندە عوسمانییەکان درەنگ هەستیان بەو گرنگییە کرد**

سەدەیێک لەدەرچوونی ئەم یاسایەی عوسمانییەکان هەر مابۆوە، بۆ نموونە: ساڵی ١٩٦١-١٩٦٤ لە قوتابخانەی سەرەتایی بووم لە قەڵای هەولێر، بەیانیان چوار وانەمان دەخوێند لە کاتژمێر ٨ بەیانی تا کاتژمێر ١٢ نیوەڕۆ. لە کاتژمێر ١٢ تا کاتژمێر ٢ی نیوەڕۆ پشومان هەبوو، دەگەڕاینەوە ماڵەوە، لە کاتژمێر ٢ی پاش نیوەڕۆ دووبارە دەگەڕاینەوە قوتابخانە، بۆ وەرگرتنی دوو وانەی دیکە، تا کاتژمێر ٤ی ئێوارە.

ساڵی ١٩٦٥-١٩٧٠ کاتێک ژمارەی قوتابییان لە شاری هەولێر زۆربوو، کاتی خوێندن کەم کرایەوە، دوو قوتابخانە لە یەک بینادا، بەکاتی جیاواز وانەیان دەخوێند، سێ ڕۆژ بەیانیان و سێ ڕۆژ ئێواران، لە کاتژمێر ٨ی بەیانی تا کاتژمێر ١٢ی نیوەڕۆ و قوتابخانەی دووەم لە کاتژمێر ١٢:٣٠ یان ١ی نیوەڕۆ تا کاتژمێر ٤ یان ٥ی ئێوارە. کێشەی کەمی بینای قوتابخانە، بەردەوام بووە تا ئەمڕۆکە.

دوای ڕوخانی ڕژێمی بەغدا، قوتابخانە تایبەتییەکان ژمارەیان زۆر بوو، لەبەرانبەردا قوتابخانەکانی حکوومی بەهۆی کەمی مووچە و دواکەوتن و دانەمەزراندنی مامۆستای تازە، کارامەیی لە ولنە گوتنەوەدا دواکەوت، قوتابخانە تایبەتییەکان، کە بە پارەیێکی زۆر قوتابی وەردەگرن، ماوەی خوێندنیان وەک سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیی درێژ کرایەوە، بەڵام بەبێ پشووی دووکاتژمێر، خوێندن بەردەوام بوو لە بەیانییەوە تا نزیکەی ٣:٣٠ یا ٤ی ئێوارە.

## سەرچاوەی زانیاریی خوێندن لە سەردەمی عوسمانییەکان

### ١- ئاماری خوێندن بەپێی ساڵنامەکانی ویلایەتی مووسڵ

سەرچاوەی زانیاریی دەربارەی ژمارەی قوتابیان و قوتابخانەکانی فەرمی لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیی زۆر کەمن، تاکە سەرچاوەی زانیاریی ئەو سەردەمە تەنیا (ساڵنامە)کانی دەوڵەتی عوسمانیین، کە لە ئیستانبوڵ و ویلایەتەکانی عوسمانیی دەردەچوون و سەرچاوەی زانیاریی گرنگ بوون.

ویلایەتی مووسڵ (کوردستانی باشوور) پێنج ژمارەی لەو ساڵنامەیە دەرکردووە، لەم ساڵنامانەدا زانیارییەکانی سەر سنجق، قەزا و ناحیەکان، تا ڕادەیەک کەمتر بوون بە بەراورد بە زانیاریی ناوەندی ویلایەت، کە مووسڵ-ە، لەنێو ژمارە تازەکانی ساڵنامەکان، هەندێک زانیاریی و ئاماری کۆن دووبارە بوونەتەوە، لە هەندێک شوێن، شاری سلێمانی و کەرکووک سنجق بوون، واتە پارێزگە یا (لیوا) شاری هەولێریش، کە پێش سێ سەدە سنجق بووە، بە بەغداوە بەسترابووە، پاشان بووە قەزایێک سەر بە سنجقی کەرکووک لە بەشەکانی دابەشکردنی ئیدارەی ویلایەتی مووسڵ.

لە سەرەتای سەدەی حەڤدەی زاینیدا، عێراقی عوسمانیی پێکهاتبوو لە چوار ویلایەت: بەغدا، مووسڵ، بەسرە و شارەزوور (کەرکووک) ئەوکات زەحمەت بوو سنووری ورد بۆ ئەم ویلایەتانەی عێراق دابنرێن، بەهۆی نەبوونی سەقامگیریی، بەو پێیەی گۆڕانکاری بەردەوامیان بەسەردا دەهات، چونکە بەشێک لە سنجقەکان لە ویلایەتەکاندا، دەخرانە سەر ویلایەتی دیکە، یان ژمارەی سنجقەکان لە هەمان ویلایەت زیادی دەکرد، بۆ نموونە شاری هەولێر و شارەزوور، عوسمانییەکان هەولێریان خستە سەر ویلایەتی بەغدا و بە درێژایی سەدەی شانزەهەمیش هەر وا مایەوە، پاشان لەسەدەی حەڤدە خستیانەوە سەر

ویلایەتی شارەزوور.

کە کوردستانی باشوور دابەش کرا، کرایە دوو ویلایەت، مووسڵ و شارەزوور (کەرکووک) بەڵام لەساڵی ١٨٧٦ ویلایەتی شارەزوور هەڵوەشایەوە و کرایە بەشێک لە ویلایەتی مووسڵ، لە ساڵی ١٨٧٩ز ویلایەتی مووسڵ پێکهێنرا، کە لە سێ سنجق (لیوا) پێکهاتبوو:

١- سنجقی ناوەڕاست (مرکز)ی مووسڵ و قەزاکانی: دهۆک، زاخۆ، زێبار، شنگال و ئاکرێ.

٢- سنجقی سلێمانی: قەزاکانی بازیان، شارباژێر و قەرەداغی لەخۆ گرتبوو.

٣- سنجقی شارەزوور (کەرکووک) و قەزاکانی: هەولێر، ڕانیە، ڕواندوز، کۆیسنجق و کفری لەخۆ گرتبوو.

بەشێوەیێکی گشتیی خوێندن لە شارەکانی کوردستان وەک شاری مووسڵ نەبوو، چونکە مووسڵ مەرکەزی ویلایەت بوو، بۆ نموونە لەساڵنامەی ویلایەتی مووسڵ بۆ ساڵی ١٣١٠ی کۆچی ١٨٩١ زایینی هاتووە: ژمارەی قوتابخانە سەرەتاییەکانی شاری مووسڵ گەیشتووەتە ١٨ قوتابخانەی بنەڕەتی، بەڵام قوتابخانەکانی هەموو شارەکانی دیکەی کوردستان ناگاتە ئەم ژمارەیە. سەرچاوەی فەرمی زانیاریی ئەو سەردەمەی دەوڵەتی عوسمانیی (ساڵنامە)کانە، کە زانیاریی لەسەر ژمارە، ناوی فەرمانبەران، گوندەکان، دانیشتوان، قوتابخانە و قوتابیان تۆمار کراوە.

**مەرجی کردنەوەی قوتابخانەی ڕوشدیە دەبووایە پێنج سەت خانوو لەو شارە هەبێ، بۆ هاووڵاتیانی جوو، بۆ کرستیانەکانیش، مەرجەکە سەت خانوو بووە**

## ٢- هەندێک ئاماری بڵاوکراوەی نێو یەکەم ساڵنامەی عوسمانیی :

بەگوێرەی یەکەم ژمارەی ساڵنامەی مووسڵ، ژمارەی خانووەکانی هەولێر (١٨٢٢) خانووە، لە کاتێکدا ژمارەی دانیشتووانی (٣٧٦٣) کەس بووە، تەنیا ڕەگەزی نێر خەمڵێندراوە، هەندێک زانیاریی لەسەر قوتابخانەی ڕوشدیە دەدا و دەڵێ: عەبدولحەکیم ئەفەندی و عەبدولقادر ئەفەندی لەقوتابخانەی الرشدیە (قوتابخانەی ناوەندیی) وەک مامۆستای یەکەم و مامۆستای دووەم کاریان کردووە.

ژمارەی دانیشتوانی هەولێر لەنێوان ساڵانی١٨٩٠ بۆ ١٩١٤ دوو هێندە زیادی کردووە. بەڵام دەسەڵاتدارانی ئینگلیزی داگیرکەر لە عێراق، ساڵی١٩٢٠ ژمارەی خانووەکانی قەڵای هەولێریان بە ٥٢١ خانوو مەزەندە کردووە، کە ١٣٣ خانوویان لە گەڕەکی تۆپخانە و ٢١٢ لە گەڕەکی تەکیە و ١٧٦ خانوویان لەگەڕەکی (سەرا)یە.



قوتابی و مامۆستایانی سانەوی ( ناوەندیی + ئامادەیی) کەرکووک ٧-١-١٩٢٨

## ژمارەی دانیشتوانی هەولێر لە نێوان ساڵانی ١٨٩٠ بۆ ١٩١٤ دوو هێندە زیادی کردووە

حاکمی بریتانی لەهەولێر جەنەراڵ های (١٩١٨-١٩٢٠) ژمارەی دانیشتووانی هەولێری بەنزیکەی ١٤ هەزار کەس خەملاندووە. زانیاریی ساڵنامەکان و زانیاریی سەردەمی ئینگلیز لە ژمارەی ڕاستی (تقريبي) نزیکمان دەکەنەوە. لە ساڵنامەی مووسڵ هاتووە، کە ژمارەی قوتابیان لە قوتابخانەکانی هەولێر ٢٨ قوتابی بووە، ئەم ژمارەیەش بۆ ساڵی خوێندنی ١٨٩٦/١٨٩٧ی زایینی هەڵکشاوە بۆ ٣٥ قوتابی. هەریەک لە مامۆستا عەبدولحەکیم ئەفەندی و موحەممەد ڕەشید ئەفەندی لەم قوتابخانەیە وانەیان گوتووەتەوە.

ماوەی خوێندن لە قوتابخانەی ڕوشدیە سێ ساڵ بووە، کە هاوتایە لەگەڵ خوێندنی ناوەندیی (متوسطه) لەم سەردەمە. ئەو بابەتانەی، کە ساڵی یەکەم لەو قوتابخانانە دەخوێندران بریتی بوون لە: زانستە ئاینییەکان، زمانی تورکیی، زمانی عەرەبیی، ژمێریاریی، جوگرافیا، خۆشنووسیی، وێنەکێشان و زانیاریی بەسوود.

لەساڵی دووەمیشدا قوتابیان وانەی خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزیان وەردەگرت لەگەڵ زانستە ئاینییەکان، زمانی تورکیی، عەرەبیی، فارسیی، ژمێریاریی، جوگرافیا، مێژوو، خۆشنووسیی، وێنەکێشان، زانست (زانیاریی بەسوود) لەساڵی کۆتاییشدا خوێندکاران هەمان بابەتەکانی ساڵی دووەم فێر دەکران، جگە لەزمانی فەڕەنسیی و ئەندازیاریی.

وەرگرتنی نمونەیەک و بەراوردکردنی ژمارەی قوتابخانە لە پایتەختی دەوڵەتی عوسمانیی و ویلایەتی مووسڵ، ژمارەی قوتابخانەکانی ڕوشدیە (ناوەندیی) لە ئیستانبوڵ لەساڵی ١٨٨٨دا (٣١) قوتابخانە بووە، کە (١٧١٥) قوتابی هەبووە، لە کاتێکدا لە تەواوی ویلایەتی مووسڵ، تەنیا (٧) قوتابخانەی (ڕوشدیە)ی هەبووە، کە بریتی بووە لە ٣١٨ قوتابی، ئەو حەوت قوتابخانەیەی ویلایەتی مووسڵ بە ڕێژەییەک قوتابخانە بۆ هەر شارێک، یەک لە مووسڵ، ئەوانی دیکە لە کەرکووک، سلێمانی، هەولێر، کفری، ئاکرێ، ڕەواندوز.

هەرچەندە پسپۆران ئەو زانیارییانەی نێو ساڵنامەکان بە تەواوی پەسند ناکەن، لەبەر ئەوەی لە ساڵنامەی یەکەم، ویلایەتی مووسڵ ١٨٩١ و دواساڵنامە ساڵی ١٩١٢ز دەرچووە، هەندێک ژمارەی هەر وەک خۆی ماوەتەوە، وای بۆ دەچن، کە زانیاریی لەسەر شارەکان هەر وەک خۆی نووسرابێتەوە و نوێ نەکرابێتەوە.

ئەو شارانەی سنجەق بوونە، وەک شاری سلێمانی، قوتابخانەیەکی سەربازیی ڕوشدیەی لێ بووە و بوویتە



قوتابخانەی تایبەت بە قوتابیانی ئاشووری لە مووسڵ ١٩٣٤

هۆی زیادبوونی ڕێژەی قوتابیان، هەروا دەرفەتی تەواوکردنی خوێندنیش زۆرتر بووە، بۆ ئەوانەی ڕوویان لە بەغدا و ئیستانبۆل کردووە. ژمارەی قوتابیانی کەرکووک و سلێمانیش زۆرتر بووە بە بەراورد لەگەڵ شارەکانی دیکەی کوردستانی باشوور.

## ٣- ئاماری خوێندن دوای (اتحاد و الترقی) لە ساڵی ١٩٠٨ز

لەهەر سێ ویلایەتی عێراق، گەشەکردنی پەروەردە بەسستی بەرەوپێش چووە، بەپێی ئەو "ساڵنامانە"ی لەویلایەتی بەغدا، مووسڵ و بەسرە دەرکراون، بەتایبەتی لە دوا قۆناغی سەردەمی عوسمانییەکان، بەم شێوەیە بووە: وەک ئەوەی لەلایەن نووسەر (عبدالرزاق الهلالی) هاتووە: (تاریخ التعلیم فی العهد العثمانی، بغداد. ١٩٥١ ص. ٢٤٨ – ٢٥٢)

لەساڵی ١٩٠٨ گرووپی یەکێتیی و پێشکەوتن (الاتحاد والترقی) لە ئیستانبوڵ دەسەڵاتیان گرتە دەست، ئارەزووی خوێندن زیاتر بوو و چەندین قوتابخانەیان لەپارێزگەکانی عوسمانیی کردۆتەوە.

ا/ ئاماری قوتابخانە حکوومییەکان/ تایبەتەکان

| شارەکان | ژ. قوتابخانەکان | ژ. قوتابی کوڕ | ژ. قوتابی کچ |
|---|---|---|---|
| بەغدا | ٥٤ | ٣٩١٠ | ٣٠٠ |
| موسڵ | ٤٢ | ٢٦٤٤ | ٢٦٠ |
| بەسرە | ٣٢ | ٨٣٤ | ٤٠ |
| هەمووی | ١٢٨ | ٧٣٨٧ | ٦٠٠ |

ب/ خوێندنگە بیانییەکان – ئەهلی

| شارەکان | ژ. قوتابخانەکان | ژ. قوتابی کوڕ | ژ. قوتابی کچ |
|---|---|---|---|
| بەغدا | ٥٧ | ٦٥٢٦ | ٢٠١٣ |
| مووسڵ | ٦ | ١٢٩٤ | ١٥٠ |
| بەسرە | ١ | ٢٠٠ | ٠ |
| هەمووی | ٦٤ | ٨٠٢٠ | ٢١٦٣ |

بەپێی ڕاپۆرتە فەرمییەکان، ژمارەی قوتابخانەکان، خوێندکاری نێر و مێ، لەعێراق بەگشتیی، لە ساڵی١٩١٤ گەیشتبووە ئەم ژمارانە:

کۆی گشتیی قوتابخانەکان لەهەر سێ ویلایەتی بەغدا، بەسرە و مووسڵ ١٩٢ قوتابخانە و ١٥٣٩٨ قوتابی کوڕ و٢٧٦٣ کچ تیایا خوێندوویانە.

## ٤- پرۆگرامی خوێندن لە قوتابخانەکانی ڕوشدیە (ناوەندیی):

پرۆگرام و کاتی وانەکان لە قوتابخانەکانی ڕوشدیە (ناوەندیی) لە دەوڵەتی عوسمانیی بۆ سێ ساڵی خوێندن و لە هەفتەیەکدا، تا کۆتایی، دەوڵەت پابەند بوو بەم پرۆگرامەوە.

بۆ ڕوونکردنەوەی زیاتر و پیشاندانی مەنهەجی خوێندن و ژمارەکانی هەر وانەیێک لەهەفتەدا لە بابەتی خوێندنی قوتابخانەکانی ڕوشدیە لەدەوڵەتی عوسمانیی، لەو خشتەیەی خوارەوە ڕوونکراوەتەوە:

وانەکانی ساڵی یەکەم، دووەم و سێیەم

| وانەکان | کاتژمێرەکان لە هەفتەی یەکەم | کاتژمێرەکان لە هەفتەی دووەم | کاتژمێرەکان لە هەفتەی سێیەم |
|---|---|---|---|
| قورئانی پیرۆز و فێرکردنی ئایینیی | ٢ | ٢ | ٢ |
| زمانی تورکیی | ٧ | ٦ | ٤ |
| زمانی عەرەبیی | ١ | ٢ | ٢ |
| زمانی فارسیی | ٠ | ١ | ٢ |
| زمانی فرەنسیی | ٠ | ٠ | ٣ |
| ماتماتیک | ٢ | ٢ | ٢ |
| ئەندازە | ٠ | ٠ | ١ |
| جوگرافیا | ٢ | ٢ | ٢ |
| مێژوو | ٠ | ٢ | ٢ |
| زانیاریی بەسوود | ١ | ١ | ١ |
| خەت | ١ | ١ | ١ |
| نیگار | ١ | ١ | ١ |
| کۆی گشتی | ١٨ | ٢٠ | ٢٣ |

ژمارەی قوتابیان لە قوتابخانەی (ڕوشدیە)ی هەولێر لەساڵی ١٩١٢ بۆ ٢٩ قوتابی کەمی کردووە، بەڵام ژمارەی قوتابخانەی سەرەتایی لە ساڵنامەکان هاتووە، کە لە هەولێر دوو قوتابخانە هەبووە، یەکەمیان ٨٦ خوێندکار و دووەمیان، کە بە قوتابخانەی قەڵا

ناسراوە، ٦٩ قوتابی هەبووە. مەولوود ئەفەندی و عەبدولکەریم ئەفەندی لە یەکەمدا وانەیان داوەتەوە، لە دووەمیشدا ڕەئوف ئەفەندی و مستەفا ئەفەندی، وانەیان داوەتەوە.

کۆنترین دۆکیومێنت دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی١٩٠٥، پێش نزیکەی ١١٨ ساڵ، زانیاریی ورد لەسەر یەک لەو مامۆستایانەی ناویان لە ساڵنامەی عوسمانیی هاتووە کۆکردۆتەوە و ئەرشیفم کردوون، ئەویش مامۆستا ڕەئووف مەلا خدر ئەفەندیە، کە دەکاتە باپیری باوکی دایکم (منیرە مەلا ڕەئووف مەلا خدر) ڕەئووف ئەفەندی، کە دەبێتە باوکی حاکم مەعرووف ڕەئووف، یەکەم وەزیری داد لە حکومەتی هەرێمی کوردستان لەساڵی ١٩٩٢.

لەبڕگەکانی داهاتوو باسی هەردوو دۆکیۆمێنت دەکەین، کە یەکەمیان بڕوانامەی تاقیکردنەوەی دامەزراندنیەتی، وەک مامۆستا، دووەمیشیان پێناسەی باری شارستانی

> *لە ساڵی ١٩٣٤ ژمارەی قوتابخانەکان لە پارێزگای هەولێر بەقەزا و ناحیەکان، بە گشتیی بیست قوتابخانە بووە بۆ کوڕان، بۆ کچانیش دوو*

عوسمانییە، کە ساڵی لە دایکبوونی مامۆستا ڕەئووف ئەفەندی (١٨٨١) نیشاندەدا.

**ناوەڕۆکی ساڵنامە:**

هەموو شتێکی پەیوەست بەو قەوارەیەی تێدایە، کە لە ماوەی ئەو ساڵەی پێشوودا لێیەوە دەرچووە، بەو پێیەی لە مێژووی ئێمە و مێژووی هەموو جیهان لە سەدەی نۆزدە و بیستەمدا گرنگییەکی زۆری هەیە، بەتایبەتی لەماوەی ١٨٤٧ - ١٩١٥.

ساڵنامە وەک ڕاپۆرتێکی سالانەی گشتگیر وایە، لەبارەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی و پارێزگاکانی، بەبێ جیاوازیی. زانیارییەکانی پەیوەندیدار بە وڵاتانی جیهان کۆ دەکاتەوە لەڕووی ڕووبەری خاک و دانیشتوان و ئابووریی و هێزی سەربازیی و دەریایی و بازرگانییەوە.

**پرۆسەی خوێندن دوای هاتنی ئینگلیز (١٩١٨-١٩٢٣)**

ئینگلیز، کە عێراقیان داگیرکرد، قۆناغ بەقۆناغ، شێوەی خوێندن و بەڕێوەبردنی مەڵبەندی ویلایەت و سنجاقەکانیان بۆ پارێزگا (لیوا) گۆڕی. زۆربەی کوردستانی باشووریان بەسەر چەند پارێزگایەک وەک: مووسڵ، هەولێر، کەرکووک و سلێمانی دابەشکرد.

سەرەتا گۆڕینی سیستەمی خوێندنیشیان لەشاری بەسرە-وە دەستپێکرد، ئەوەش هاوکات بوو لەگەڵ هەڵگیرسانی جەنگی یەکەمی جیهانیی، ئەو کاتەی بریتانیا دەرفەتی داگیرکردنی بەسرای بۆ ڕەخسا، بە پاڵپشتی کەشتییە جەنگییەکانی، کە لە کەنداوی فارس بوون، لە ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩١٤دا جووڵەیان پێکرا و بەسرەیان داگیرکرد (سێر پێرسی کۆکس) بوو بە سەرۆکی حاکمی سیاسیی بریتانیا (مندوب السامی البريطاني) کە بەرەگەز جوو بوو.

هەوڵی کردنەوە و پەرەسەندنی قوتابخانە و خوێندنیان دا، لەبەر پێویستییان بەکارمەند و خوێندکاری ئینگلیزیزان، بەڵام گۆڕانکاریی لەسیستەمی خوێندن دوای داگیرکردنی شاری بەغدا لەساڵی ١٩١٧ دەستی پێکرد، کوردستانی باشوور، کە بەبێ شەڕ داگیرکرا، لەگەڵ کۆتایی هاتنی شەڕی یەکەمی جیهانیی لە ساڵی ١٩١٨ بەڵام هەوڵی گۆڕانکاریی لە پەرەپێدانی خوێندن ماوەکەی زۆرکەم بوو.

قوتابخانە کۆنەکەکان بە ژمارەی کەمتر مانەوە، بە دوو قۆناغ ماوەی خوێندنی سەرەتایی کرا بەشەش ساڵ. سەرەتای پەرەسەندن و خوێندنی زمانی ئینگلیزیی ئەو کاتەی (مێجەر بۆمن) هات و هەنگاوی جدی گرتەبەر و دەستی کرد بە پەرەپێدانی پەروەردە لەعێراق.

مێجەر (بۆمن) دوای گەیشتنی بۆ بەغدا، لەمانگی ئابی ساڵی ١٩١٨ هەوڵەکانی دەست پێکرد و وەک سەرپەرشتیاری زانیاریی گشتیی دەست بەکار بوو، چەند یاریدەدەرێکی تایبەتی، بۆ خۆی لە هاووڵاتیان دامەزراند و ئەنجوومەنی پەروەردەی فراوانتر کرد، ئەمەش ڕۆڵێکی بنەڕەتی گێڕا، لە ڕێکخستنەوەی پەروەردە.

مێجەر بۆمن خوێندنی سەرەتایی کردە دوو قۆناغ: قۆناغی یەکەمی سەرەتایی بۆ ماوەی دوو ساڵ، پێیان دەگوت: (ئەوەلی) کە تەنیا فێربوونی پیتەکانی ئەلفوبێی دەگرتەوە، پاشان قۆناغی دووەمی خوێندنی سەرەتایی بووە چوار ساڵ.

بەشی بەرایی خشتەی دابەشکردنی وانەکانی هەفتە

| وانەکان | ساڵی یەکەم | ساڵی دووەم | ساڵی سێیەم | ساڵی چوارەم |
|---|---|---|---|---|
| قورئانی پیرۆزو فێرکردنی ئایینی | ٦ | ٦ | ٥ | ٥ |
| زمانی عەرەبیی | ١٠ | ١٠ | ٩ | ٩ |
| خەتی عەرەبیی | ٤ | ٣ | ٢ | ٢ |
| ماتماتیک | ٥ | ٥ | ٦ | ٧ |
| جوگرافیا | ٢ | ٢ | ٣ | ٣ |
| مێژوو | - | ١ | ٢ | ٢ |
| نیگار | - | - | ٢ | ٢ |
| کاری دەستی | ٢ | ٢ | ٣ | ٢ |
| ئەندازە | - | - | ٢ | ٢ |
| وانەی شتەکان | ٢ | ٢ | ٢ | ٢ |
| وەرزش | ٣ | ٣ | ٣ | ٣ |
| کۆی گشتی | ٣٤ | ٣٤ | ٣٩ | ٣٩ |

دوای دەست بەسەرداگرتنی ویلایەتی بەغدا، مووسڵ و بەسرە، ئیدارەی بریتانیا ئەو ناوچانەی بەسەر چوار بەڕێوەبەرایەتی ئیداری پەروەردەدا دابەش کرد. یەکەمیان لە بەغدا، دووەمیان لە مووسڵ، سێیەمیان لە حلە و چوارەمیان لە بەسرە.

قوتابخانە سەرەتاییەکان/ خشتەی دابەشکردنی وانەکانی هەفتە وانەکان بەشی یەکەم، بەشی سەرەتایی

| وانەکان | ساڵی یەکەم | ساڵی دووەم | ساڵی یەکەم | ساڵی دووەم | ساڵی سێیەم | ساڵی چوارەم |
|---|---|---|---|---|---|---|
| قورئانی پیرۆز و فێرکردنی ئایینی | ٦ | ٦ | ٥ | ٥ | ٤ | ٤ |
| زمانی عەرەبیی | ١٠ | ١٠ | ٩ | ٨ | ٦ | ٦ |
| خەتی عەرەبیی | ٤ | ٣ | ٢ | ٢ | ١ | ١ |
| ماتماتیک | ٥ | ٥ | ٤ | ٥ | ٥ | ٤ |
| جوگرافیا | ٢ | ٢ | ٢ | ٢ | ٢ | ٢ |
| مێژوو | - | ١ | ٢ | ٢ | ٢ | ٢ |
| نیگار | - | - | ١ | ١ | ١ | ١ |
| کاری دەستی | ٢ | ٢ | ٢ | ٢ | ٢ | ٢ |
| ئەندازە | - | - | - | - | ٢ | ٢ |
| وانەی شتەکان | ٢ | ٢ | ١ | ١ | ١ | ١ |
| وەرگێران | - | - | - | - | ١ | ٢ |
| زمانی ئینگلیزی | - | - | ٦ | ٧ | ٨ | ٩ |
| خەتی ئینگلیزی | - | - | ٢ | ١ | ١ | ١ |
| وەرزش | ٢ | ٢ | ٢ | ٢ | ٢ | ٢ |
| کۆی گشتی | ٣٤ | ٣٤ | ٣٩ | ٣٩ | ٣٩ | ٢٩ |

هێزەکانی بریتانیا توانیان لە ١٠ی تشرینی دووەمی ١٩١٨ مووسڵ داگیر بکەن و عەقید لیچمن (G.E. Leachman) وەک حاکمی سیاسی و سەربازیی ئەوێ دەستنیشان کرا، سەبارەت بەسیاسەتی پەروەردەیی بریتانیا لەشارەکانی کوردستانی باشوور، پەروەردەی بەشتێکی لاوەکی دەزانی. ئیدارەی سەربازیی بریتانیا یەکێک لە ئەفسەرەکانی سوپای بەناوی کاپتن بیس (E.H.Base) بە بریکاری زانست (پەروەردە) لە پەروەردەی مووسڵ دەستنیشان کرد.

کاپتن بیس، جێگری سەرپەرشتیاری معاریفی لەموسڵ، لەسەرەتای مانگی کانوونی یەکەمی ساڵی١٩١٨ز، گەیشتە مووسڵ و گەشتێکی پشکنینی بۆ شارەکە کرد، بۆی دەرکەوت کە (٦) قوتابخانەی سەرەتایی فەرمی بۆ کوڕان هەیە. هەروەها سێ قوتابخانەی کچان. لەگەڵ قوتابخانەیەکی ئامادەکاری بۆ پیشەسازی، ماڵی مامۆستایانی قوتابخانەی کوڕان، هەروەها چەند قوتابخانەیەکی کلدانی و سریانی و جوو لەشارەکە هەبوون.

کاپتن بێس، هەموو قوتابخانە سەرەتاییەکانی عوسمانیی داخست، جگە لە قوتابخانەی ئەل وەتەن، کە یەکێک لە هۆکارەکانی داخستنی ئەم قوتابخانانە، ئەوەبوو، کە ئەو قوتابخانانە سیاسیین (حزبین) و کار بۆ کۆمەڵگەی یەکێتیی و پێشکەوتن (الاتحاد والترقي) دەکەن، ژمارەیەکی زۆری لە مامۆستایانی ئەم قوتابخانانە لە کارەکانیان دوورخستەوە، بەتایبەتی ئەوانەی ڕەتیان کردەوە هاوکاری دەسەڵاتی داگیرکەر بکەن.

دەسەڵاتدارانی بریتانیا لە مووسڵ پشتگیریان لەکردنەوەی قوتابخانە دەکردەوە بۆکچانی مەسیحی و جوو، بەڵام پەروەردە بەهێواشی کاری دەکرد بۆ کردنەوەی قوتابخانەی کچان بۆ منداڵانی موسڵمانان

ئینگلیز دەستیان کرد بەگۆڕینی سیاسەتی پەروەردە و پرۆگرامەکانی خوێندن، کە لە چواردە بابەت پێکهاتبوو، لەوانە: (قورئانی پیرۆز، ئایینی ئیسلامی، زمانی عەرەبیی، خۆشنووسیی عەرەبیی، وانەی شتەکان، وەرگێڕان، زمانی

ئینگلیزیی، خۆشنووسیی، ئینگلیزیی، بیرکاری، جوگرافیا، مێژوو، وێنەکێشان، کاری دەست و ئەندازیاریی).

دوای داگیرکردنی عێراق لەلایەن ئینگلیزەکانەوە، بەماوەیەکی کەم خوێندن پشتگوێ خرا و گرنگی پێ نەدەدرا، ئەمەش لە چوارچێوەی سیاسەتی بریتانیای داگیرکەر، کاتێک لە ٣٠ی تشرینی یەکەمی ساڵی١٩٢٠ حکومەتی عێراقیش پێکهێنرا، وەزارەتی پەروەردە، وەک هەر وەزارەتێکی دیکەی ئەوکات، ڕاوێژکارێکی ئینگلیزی هەبوو.

خەرجییەکان بۆ پـەروەردە زۆرکـەم بـوو، دەسـەڵاتی داگیرکەر لەساڵانی ١٩١٩-١٩٢٠ لە سەرتاسەری عێراق کەمتر لە یەک ملیۆن ڕوپیەی بۆ پێداویستییەکانی پەروەردە خەرج کردووە، کە دەکاتە حەفتا هەزار ڕوپیەی تورکیی. لە کاتێکدا خەرجی خوێندن لە سەردەمی عوسمانییەکان لە پارێزگای بەغدا لە ساڵانی ١٩١١-١٩١٢ سی و چوار هەزار لیرەی تورکیی بووە.

ژمارەی قوتابخانەکان لە سەرانسەری عێراق بەقوتابخانە ئەهلیەکانیشەوە لە مانگی نیسانی ساڵی ١٩٢٠ گەیشتە ٩٠ قوتابخانە، ژمارەی ئەو خوێندکارانەش، کە ناویان لە قوتابخانە حکوومییەکان و ئەوانەی سەر بەکەمینە ئایینییەکان بوون، بەنزیکەی شەش هـەزار خوێندکار مـەزەنـدە دەکـرێ. سـەبـارەت بـەواقیـعی کولـتووری کوردستانیش، حاڵەتێکی بچووکتر بوو لە باقی وڵات، مێجەر سۆن ساڵانە ٦٣ هەزار ڕوپیەی بۆ پەروەردەی ناوچەی سلێمانی خەرج دەکرد، کە ئەم برەش زۆرکەم بوو بە بەراورد بەهاوردەی خەرجی لەساڵی ١٩٢٠.

لەساڵی ١٩١٥ بەتەنیا ژمـارەی خوێندکارانی شاری سلێمانی ١٠٪ی کۆی خوێندکارانی سەرجەم بەشەکانی عێراقی پێکدەهێنا، لە کاتێکدا کۆی گشتیی خوێندکاران لە کوردستان بەگشتیی دوای ئەو داگیرکارییە نەدەگەیشتە ئەم ڕێژەیە. دوای شەڕ ئینگلیز لەمانگی شوباتی ساڵی ١٩١٩ یەک قوتابخانەیان لەشاری سلێمانی کردەوە.

دۆخی قوتابخانەکانی کچانیش لەهی کوڕان باشتر نەبوو، لەهەندێک شوێنیش کردنەوەی زۆر دواکەوت و گەیشتە نزیکەی ١٠ ساڵ. لەشاری هەولێر و شارەکانی دیکەی کوردستان بەهەمان شێوە، دوای داخستنی قوتابخانەکان لە عێراق لە جەنگی یەکەمی جیهانیی، ئینگلیزە زۆر کەمتەرخەم بوو لە کردنەوەی قوتابخانەی کچان. لە عێراق بەگشتیی و کوردستانی باشوور بەتایبەتی، قوتابخانەی کچان تا ١٩ی ای ١٩٢٠ نەکرایەوە، هۆکارەکانی ئەمەش پەیوەندی بەعورفی کۆمەڵایەتی وڵاتانی ئیسلامی و کاریگەری جۆری کولتوری دەسەڵاتی عوسمانیی هەبووە، لەسەر دواکەوتن و فراوانکردن و زۆرکردنی قوتابخانەی کچان.


بەشێک لە قوتابیانی کۆنترین قوتابخانەی هەولێری ئامادەی کچان ١٩٦٤

# ئەدەب

- **دوو دیدار لەگەڵ عەبدوڵڵا پەشێو و د. نەجمەددین جەباری**
- **حوجرە (کون تێیە)کەی نالی لە باڵەکەتی بووە؟**

محەمەد عەبدولڕەحمان مێرگەیی

- **دەمێک لەگەڵ مارف خەزنەدار**

فەڕۆخ نێعمەتپوور

- **پەیمانی ئەلەست لە شیعری کوردیدا**

سەرتیپ ئاغا واحد بەگ

- **دە چیرۆکی زۆر کورتی پاولۆ کۆیللۆ**

و : تاهیر عوسمان

- **ساڵەهایە**

سەعدوڵڵا پەرۆش

- **دیاری سەری ساڵ**

قەهار شێخانی

# دکتۆر نەجمەدین جەباری:
# شانامەی فیردەوسی، لە بیچم و ناوەڕۆکدا وەک شانامەی کوردییە

دکتۆر نەجمەدین جەباری ساڵی ١٩٧٣ لە شاری بانەی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە دایکبووە. ئێستە مامۆستایە لە بەشی زمان و ئەدەبی فارسیی، لە زانکۆی کوردستان لە سنە. هەروەها ئەندامی فەخری ئەنستیتۆی زانستیی زاگرۆسە. خاوەنی دوو کتێبی چاپکراوە، کتێبێکیشی ئامادەیە بۆ چاپ:

- ساخکردنەوەی کەشکۆڵی حەسەن بەگی کانی ناو بە ناوی «مەندەی زەمانە»

- وەرگێڕانی «ویسێ و ڕامین» لە فارسییەوە بۆ کوردی.

- بنەماکانی ئوستووڕەناسیی کوردی ئامادەی چاپە

**بورهان قادر- سنە**

**- با لە فیردەوسییەوە دەست پێ بکەین، کێ بوو و لە چ شوێن و زەمانێکدا دەژیا؟**

+ حەکیم ئەبوولقاسم فیردەوسیی تووسی، شاعیری بلیمەتی فارسە، لە ساڵی ٣٢٩ی کۆچی لە دایک بوو و هەتا ٤١٦ی کۆچی ژیا. فیردەوسی سەر بە چینی «دێهقان» بووە، کە خان بوون و ملک و ماڵاتی زۆریان هەبوو. بەشێک لە دێهقانەکان هەر لە سەر ئایینی زەرتوشتی مابوون و پێداگر بوون نەریتی سەردەمی ساسانی (بەر لە ئیسلام) زیندوو ڕابگرن. لەم ڕووەوە پارەی زۆریان بۆ زیندووکردنەوەی ئەو نەریتانە خەرج دەکرد، کە پەیوەندیی بە ڕۆژگارانی بەر لە ئیسلامەوە هەبوو. فیردەوسی موسوڵمان بوو، بەڵام دڵی هەر لە لای ڕۆژگارانی بەر لە ئیسلام بوو. بۆیە هەوڵ و زەوق و توانستی خۆی خستە گەڕ، کە کارێک بکا و لە ئاکاما سەری لە شاعیری دەرهێنا هەستی شاعیرانەی خستە خزمەتی هۆنینەوەی تاقە بەرهەمی خۆی بە ناوی شانامە.

**- ئاوڕێکی خێرا لە مێژووی ئەو دەم بدەینەوە؛ لە زەمانی فیردەوسیدا چ دەسەڵاتێک لەسەر کار بوو و چۆن دەڕوانییە هەوڵی (دێهقان)ەکان؟**

+ کاتێک کە فیردەوسی دەژیا، بنەماڵەیەک بە ناوی «سامانی» دەسەڵاتیان بەدەست بوو، کە لە خوراسانەوە



دەستی پێ دەکرد، هەتا چۆمی جەیحوون. سامانییەکان زۆر لە بەندی نەریتی بەر لە ئیسلامدا بوون، بە پشتگیریی ئەوان زۆرێک لە جێژنەکان پارێزرا.

ئەوان لە زمانی «دەری» پشتیوانیان دەکرد؛ ئەو زمانەی کە دواتر پێی گوترا «فارسی» بۆیە خەڵاتی زۆریان بە شاعیران دا، کە بە دەری شیعر بهۆننەوە. دیارە کە بەر لەوانیش بنەماڵەی «سەففاری» دەسەڵاتیان بە دەست بووە. پشتیوانی لە زمانی دەری (فارسی) لە سەردەمی ئەوانەوە دەستی پێکرد. یەعقووب سەففاری بۆ یەکەم جار فەرمانی بۆ شاعیران دەرکرد کە کەس بە زمانی عەرەبی شیعر نەبێژێ، بەم جۆرە زمانی دەری هاتە سەر کاغەز.

سامانییەکان زۆر بەهێزبوون و زۆر ئاوڕیان لە شاعیران دەداوە. یەکێک لە وەزیرانی سامانی بە ناوی «ئەبوو مەنسوور موعەممەری» پێشنیازی بە فیردەوسی دا، کە شانامە هەر لە سەرەتاوە هەتا کۆتایی بهۆنێتەوە،

**زۆر بەسەرهات و کەسایەتی لە شانامەی کوردیدا هەن کە هیچ ناو و ڕەنگێکیان لە شانامەی فیردەوسیدا نییە**

فیردەوسیش بە هانای ئەم پێشنیازەوە چوو و شانی بەر ئەم ئەرکە قورسە دا.

**– ئەی چۆن شانامەی فیردەوسی لە رووی مێژوو و ئەدەب و ناوەڕۆکەوە بناسین؟**

+ شانامەی فیردەوسی تاقە بەرهەمی فیردەوسییە. ئەم شاعیرە لە سی ساڵدا (لە نێوان ساڵانی ٣٨٠-٤١١ی کۆچی) لە شاری تووس لە ئەیالەتی خوراسان شانامەی بە شیعر هۆنییەوە و پێشکەشی مەحموودی غەزنەویی کرد. بەر لە فیردەوسی کەسانێک پەخشان، یان هۆنراوەیان بە زمانی دەری نووسیبوو کە ناودارترینیان لەنێو شاعیراندا، ڕوودەکی سەمەرقەندی بوو، کە بە باوکی ئەدەبی دەریش ناو دەبرێ؛ بەڵام دەستپێکی ڕاستەقینەی ئەدەبی عەجەمی (دەری/ فارسی) شانامەی فیردەوسییە، کە نزیکەی پەنجا و دوو هەزار دێڕ لەخۆ دەگرێ و بناغەیەکی پتەوی بۆ ئەو ئەدەبە دامەزراند. ناوەڕۆکەکەیشی باس لە ئوستوورەی هاتنی گەلی ئاریایی –کە کۆچەر و دوور لە ژیار بوون- دەکا لە «ئێران وەئیجە«وە –کە سەرچاوەی هەڵهاتنی ئاریاییەکانە دێتە ئەژمار- بۆ ئەو وڵاتە بەرین و بەبرشتە، کە ناوی «ئاریانا»یان لێنا و ئەمڕۆ دەکەوێتە نێوان تورکەمەنستان و ئەفغانستان. دامەزراندنی ژیاری عەجەمان لەو ناوچە و پێکهەڵپژان لەگەڵ دانیشتووانی ڕەسەنی ئەو شوێنە تازەی کە کۆچیان بۆ کردووە، بەشێک لە بنەماکانی شانامەی فیردەوسییە، کە لە قاڵبی چیرۆکی پاڵەوانیدا دەرکەوتووە. لە سەردەمی فیردەوسی بەم چەشنە چیرۆکانەیان گوتووە «ئەفسانە« و ئەمڕۆ بە ژانری «حیماسە« ناوی دەبەن.

**– با زیاتر لە ناوەڕۆکی شانامەی فیردەوسی بدوێین، جا دواتر بێینە سەر هەڵسەنگاندنی لەگەڵ شانامەی کوردی.**

+ بەر لە ئیسلام نەریتێک لە مێزۆپۆتامیا باوبوو، کە هەر پاشایەک ئەو کارە گرینگانەی لە گلێنەکاندا بە خەتی بزماری دەنووسی، کە لە سەردەمی دەسەڵاتیدا کردبووی؛ وەک پاشایانی سۆمەر، ئاکاد و ئاشوور. پاشایانی ساسانیش هەمان نەریتیان قۆستەوە و کارەکانیان لە کتێبێکدا نووسی، کە پێیان گوت «خوەتای‌نامەک» بە مانای «شانامە«. وشەی «خوەتای» لەگەڵ خاوەن -کە لە کوردیدا هەیە- یەک ڕیشەن. ئەم کتێبە بە زمانی پاڵەوی بوو، کە بەر لە ئیسلام زمانی دیوانی بوو. ئەم کتێبە لە زەمانی فیردەوسیشدا هەرمابوو، بەڵام دواتر تیاچوو. عەبدوڵڵا ئیبنی موقەففەع، بەر لەوەی ئەم کتێبە تیابچێ، بە ناوی «سیر الملوک» وەریگێڕایە سەر زمانی عەرەبی، کە لەبەردەستدایە. ئەمە لە لایەک.

لە لایەکی دیکەوە ئەودەم لە خوراسان زۆر چیرۆکی پاڵەوانی لەبەردەست دابوون، کە هەرکەسە و بەرگێکی بوو؛ هەر بنەماڵە و چیرۆکێکی لابوو. هەتا شاعیرێک بە ناوی ئەبولموئەیەد بەلخی تەواوی ئەم چیرۆکە بڵاوانە لە لای یەک دادەنێ و لە بەرگێکدا کۆیان دەکاتەوە و ناوی دەنێ «شانامەی گەورە».

فیردەوسی هەر ئەو نەزمەی پاراست، کە ئەبولموئەیەد بە شانامەی دابوو. لەو نەزمەدا چیرۆکەکان لە «گیومەرتەوە« (وەک یەکەمین مرۆڤ لە ئەفسانەگەلی عەجەماندا) دەست پێ دەکا و ئینجا بە شێوەی زەمانمەند (کرۆنۆلۆجیکال) لە زنجیرەی پاشایانی «پیشدادی» تێ دەپەڕێ، هەتا بە سەرهەڵدانی «ئەژیدەهاک» (زوحاک)

دەگا، دوای ئەو زنجیرەی پاشایانی «کیانی» دێن.

لەم بەشەدایە، کە ڕۆستەم سەر هەڵدەدا و لە بەشێکی زۆری چیرۆکەکاندا دەور دەگێڕێ. ئینجا دەگاتە سەردەمی مێژوویی، کە لێرەوە فیردەوسی ئەو بەشە مێژووییەی (خوەتای‌نامەک) ئاوێتەی دەکا و هەتا داڕووخانی ئیمپراتۆریی ساسانی و سەرهەڵدانی ئیسلام لە خۆ دەگرێ. ئەمە ناوەڕۆکی شانامە بوو بە کورتی، کە لە ڕاستیدا بەسەرهاتی وڵاتی ئێران دەگێڕێتەوە.

کاتێک دەڵێین «ئێران»، مەبەست ئێرانی ئەو دەمە، کە ئەیالەتی «هێلمەند»ی ئەفغانستانی ئەمڕۆوە دەستی پێدەکرد و دەچووە بان هەتا چەمی جەیحوون. پانتاییەکی بچووک، کە بەشێکی ئەفغانستان و تورکمەنستانی ئەمڕۆ (خوارەزم) لە خۆ دەگرێ. ئەو وڵاتەی، کە ئەمڕۆ پێی دەڵێن ئێران، ئەودەم پێیان دەگوت «فارس» کە لە سەرچاوەگەلی یۆنانیدا وەک «پێرشیا» ناوی لێ براوە.

**- ئەم شانامە ج جیاوازییەکی لەگەڵ شانامەی کوردی هەیە؟**

+ شانامەی فیردەوسی، لە بیچم و ناوەڕۆکا وەک شانامەی کوردییە؛ چونکە ناوەڕۆکی هەر دووکیان لە چیرۆکگەلی پاڵەوانی پێکدێ؛ بەم بۆنەوە هەردووکیان دەچنە خانووی ژانری حیماسییەوە. چیرۆکەکانی شانامەی کوردی پەرتەوازەیە و بەو جۆرەی، کە ئەبولموئەیەد بەلخی شانامەی فارسیی بە شێوەی کرۆنۆلۆجیکاڵ دەرهێنا و هەمووی یەک خستەوە، شانامەی کوردی وەها کارێکی بۆ نەکراوە؛ پێویستیش ناکا وەها کارێکی بۆ بکرێ؛ چونکە جەوهەری چیرۆکەکان هەر بەو جۆرەیە، کە لێک ترازاو بێ.

لە شانامەی فیردەوسیدا بەشی ئوستوورەیی پڕەنگە، بەڵام لە شانامەی کوردیدا ئەو بەشە کاڵە. جگە لەمانە زۆر بەسەرهات و کەسایەتی لە شانامەی کوردیدا هەن کە هیچ ناو و ڕەنگێکیان لە شانامەی فیردەوسیدا نییە، کە سەربەخۆبوونی ئەم شانامە لە ئەدەبی کوردیدا دەردەخا. شانامەی کوردی بە کوردیی گۆرانی هەڵبەستراوە و شاعیرەکەی یەک کەس نییە.

بەگشتیی ئێمە دەتوانین دووجۆر گێڕانەوە لە ئەدەبی پاڵەوانی پیشان بدەین: گێڕانەوەی خوراسان، کە بوو بە «شانامەی فیردەوسی» و گێڕانەوەی زاگرۆس، کە بوو بە «شانامەی کوردی».




**- ئەی کورد وەک نەتەوە لە شانامەی فیردەوسیدا ج دەورێک دەگێڕێت؟**

+ فیردەوسی لە شوێنێکدا باسی کورد دەکا، ئەو کاتەی کە زوحاک مێشکی لاوان دەرخواردی مارەکانی دەدا، دوو چێشتلێنەر هەر ڕۆژ بەجێی دوو لاو یەک کەس دەکوژن و بەجێی ئەوی دی مەڕێک سەر دەبڕن و مێشکیان دەرخواردی مارەکانی زوحاک دەدەن.

فیردەوسی دەڵێ: کە حەشیمەتی ئەو لاوە ڕزگارکراوانە زۆر بوو و گەیشتە سی کەس، مەڕ و ماڵاتیان پێدان، کە بڕۆنە کوێستانەکان و لەوێ بژین و ئیدی بەرەو ئاوەدانی نەیەنەوە. فیردەوسی دەڵێ: کە کورد لە تۆرەمەی ئەم لاوە ڕزگارکراوانەیە.

ئەم قسە سەرتاپای چەوتییە و هیچ لەگەڵ ڕاستیدا ناخوێنێتەوە. لەو دەمدا هەژمارێکی زۆری کورد لە خوراسان دەژیان، ئەم کوردانە هێزێکی زۆر و دەسەڵاتێکی لەبەرچاو بوون.

یەکەم شاعیر، کە لە خوراسان، یەکەم شیعری بە زمانی دەری گوت، کوردێک بوو بە ناوی «بەسسامی کورد»؛ هەروەها دەسەڵاتی ئومەوی لە بەغدا بە دەستی کوردێک بوو بە ناوی «ئەبووموسلیم» گۆڕیا و بە دەستی بنەماڵەی عەباسی گەیشت. لە کتێبی «تاریخی بەیهەقی»دا اهکزە جار باسی لەشکری کوردەکان کراوە، کە لە ڕیزی سوپای مەحموودی غەزنەویدا بوون. من وا تێدەگەم کە فیردەوسی قینێکی نهێنیی لە کورد بووە، کە ئەو بابەتە چەوتەی بە شانامەکەی خۆی زیا کردووە.

لەگەڵ ئەوەدا دەتوانین لێکدانەوەیەکی دیش بۆ ئەو قسەی فیردەوسی بکەین: کوێستانەکان لە بەر ئەوەی، کە شوێنی تایبەتی خواکان بووە، هەمیشە نوور و ڕووناکایی لێبووە، شوێنێکی پیرۆز بووە و ئەهریمەن نەیتوانیوە دەستی پێ بگەیەنێ؛ بۆیە لە ئوستوورەکاندا وا هاتووە: کە ئەم لاوە ڕزگاربووانە ڕەوانەی کوێستان

***دەتوانین دووجۆر گێڕانەوە لە ئەدەبی پاڵەوانی پیشان بدەین: گێڕانەوەی خوراسان، کە بوو بە «شانامەی فیردەوسی» و گێڕانەوەی زاگرۆس، کە بوو بە «شانامەی کوردی***

کراون، تا لەوێ بە ئاسوودەیی و دوور لە دەستدرێژیی ئەهریمەن بژین.

**– ئەمڕۆ باسێکی ڕۆژەڤ لە سەر مێژووی کورد، باسی کاوەی ئاسنگەرە، کە وەک جاشێک ناوی دێنن، کەچی لە شانامەکاندا (کوردیی و فارسیی) وەک مرۆڤێکی گەورە و نەتەوەدۆست دەرکەوتووە، ئەمە چۆن هەڵدەسەنگێنن؟**

هەر وەک ئاگادارن، کاوەی ئاسنگەر لە دژی دەسەڵاتی کاولکەر و پیاوخۆری زوحاک ڕاپەڕی و شۆڕشی خۆی دەست پێکرد. لە شانامەی فیردەوسیدا وا هاتووە، کە پاش ئەوەی زوحاک حەڤدە کوڕی کاوە دەکوژێ و مێشکیان دەرخواردی مارەکانی دەدا، کاوە هەڵدەقڕێ و دەنگ دێ و لە کۆشکی زوحاک دژی دەوەستێتەوە. ئەمجارە خەڵک لە دەوری خۆی کۆ دەکاتەوە، تا بە یەکەوە بەرەو حەشارگەی فەرەیدوون بڕۆن. ئەوان فەرەیدوون دەهێنن و دەیکەنە پاشا. تازە ئەویش، کە بەسەر زوحاکا سەر دەکەوێ، لە کێوی دەماوەندا یەخسیری دەکا، کە هەر وا بمێنێتەوە تا ئاخرە زەمان.

ئەم گێڕانەوە لە ئوستوورەی کوردیدا بەم جۆرە نییە و جیاوازیی بنەڕەتیی تیایە. لە گێڕانەوەی کوردیدا فەرەیدوون هەر بوونی نییە؛ بەڵکوو کاوە بە تەنیایی خۆی دژی زوحاک ڕادەپەڕێ و دەیکوژێ.

ئەمڕۆ چەند توێژەرێکی کوردستانی خوێندنەوەیەکی مێژوویی بۆ ئەم ئوستوورە دەکەن و دەڵێن زوحاک هەمان ئاستیاگ بووە، فەرەیدوون کورشی هەخامەنشی بووە و کاوەیش جاشێک بووە، کە دەسەڵاتی ڕادەستی فارسەکان کردووە. بە دەردی کابرای کورد گوتەنی: بەردێک کە نەزان بیخاتە بیرێکەوە، بە سەد زانا دەرنایاتەوە؛ نازانم ئەمانە بە دەهۆڵی کامە نەیاری کورد هەڵدەپەڕن، بەڵام هەرچی بێ، بەداخەوە سەریان لە خەڵک شێواندووە. چیرۆکی کاوە و زوحاک فرێ بە سەر مێژووەوە نییە و هەر جۆرە خوێندنەوەیەکی مێژوویی لەم گێڕانەوە چەوتە؛ بە پێچەوانەوە ئەم چیرۆکە ئوستوورەییە و ئەبێ خوێندنەوەی ئوستوورەیی بۆ بکرێ تا شکۆی کاوەی ئاسنگەر و ژیاری کورد لە زاگرۆسدا دەربکەوێ.

من لە وتارێکدا بە ناوی «تحلیلی بر اصالت زاگرسی روایت کاوە و ضحاک» کە بە زمانی فارسیی چاپ بووە، خوێندنەوەیەکی ئوستوورەییم بۆ ئەم چیرۆکە کردووە و دەرمخستووە، کە خوێندنەوەی مێژوویی بۆ ئەم چیرۆکە لە سەدەی پێنجەمی زایینییەوە بە دەستی موسا خۆرێنی کراوە و هەر لە سەر ئەم بناخە خوارە، دیوارێکی لار هەڵچنراوە. هیوادارم ئازیزێک ئەم وتارە بۆ زمانی کوردیی وەربگێڕێ.

**– بوونی زۆری چاپی شانامە لە خەزێنەی ئەدەبی فارسیدا، خوێنەری دووچاری پرسیار و گومان کردووە، ئایا کامە چاپ ڕەسەنە و کامەیان دەستکاری کراوە؟**

+ شانامە هەر لە سەرەتاوە وەک کتێبێکی پیرۆز سەیری کراوە؛ چونکە بەشێک لە مێژووی عەجەمان لەخۆ دەگرێ، کە ئاوێتەی چیرۆکگەلی پیرۆزی ئایینیی بووە. بۆیە لە پەستا ڕوونووس کراوەتەوە و هەر گەل و تاقم و دەربارێک بۆ خۆی ڕوونووسێکی هەڵگرتووە. دیارە ئەم گشتە ڕوونووسە لەگەڵ یەک جیاوازییان ئێجگار زۆرە و هەر ئەمەیش ڕواڵەتی شانامەی فیردەوسی (چ لە باری چەندایەتیی دێڕ و چیرۆکەوە و چ لە باری

چۆنایەتی و ئەنجامی چیرۆکەکان) گۆڕیوە؛ بۆیە کاری ساخکردنەوەی شانامە ئێجگار ئەستەم بووە. ئەمڕۆ تەنیا چاپێک، کە زانستیانە ساخ کراوەتەوە و واپێدەچێ تەواو لە شانامەکەی فیردەوسی بچێ، چاپی د. جەلال خالقی موتڵەقە، کە چل ساڵ بۆ ساخکردنەوەی ئەو بەرهەمە ڕەنجی کێشا.

**- لە هەندێک سەرچاوە باس لەوە دەکرێت، کە فیردەوسی لە بەرانبەر نەهێنانی پاشاکان و پێداهەڵگوتنیان پارەی وەرگرتووە، ڕەخنە و تێبینیی ئێوە بە گشتیی لەسەر ئەمە چییە؟**

+ شاعیریی لە سەردەمی فیردەوسیدا لە ڕیزی پیشە بەهرەدارەکان بووە؛ کەواتە کەسانێک، کە شاعیر بوونایە و بەختی ئەوەیان ببوایە، کە لە دەربارێکدا وەربگیرێن، نانیان دەکەوتە ڕۆنێ. فیردەوسیش بۆ ئەم کارە مەدحی مەحموودی غەزنەویی کردووە کە پاشایەکی زاڵ و سەردەست بووە و لە بەر زرانی ناوبانگی خۆی پارەی زۆری بە شاعیران داوە. لە دەرباری مەحموودا کۆڕی شاعیران ئەگیرا و ئەم شاعیرانە بۆ هەر بۆنەیەک (شەڕ، سەرکەوتن، جێژنی لە دایکبوون، کردنەوەی خانووبەرە و پرد و ...هتد) شیعرێکیان بە پاشا و دەربارییان هەڵئەگوت و لە بەرامبەردا خەڵات و پاداشی زۆری پێ ئەبەخشرا کە ئەو دەم بە خەڵاتی پاشایان ئەگوت «سیلە» (صله).

تەنیا پاشایەکی زەمان کە ناوی لە شانامەدا هاتبێ، مەحموودی غەزنەوییە. ئەو پاشاگەلەی دی، کە فیردەوسی باسیان دەکا، هەموویان هی سەردەمانی ئەفسانەیی و ڕۆژگارانی مێژوویی بەر لە ئیسلامن و نابێتە بیانوو بۆ ئەو قسەیە.

**- هیچ دەقێک بەدەر نییە لە ڕەخنە و خوێندنەوە، بەڵام ئەوەی ئێمە دەیبینین ڕەخنەگرتن لە شانامە بە تابۆ کراوە، هۆکاری ئەمە چییە؟**

+ بە داخەوە لە ساڵانی ۱۹۵۰ بەم لاوە، ڕەوتێک لە ئێران، بە پێشەنگیی بنەماڵەی دزێوی پاڵەوی (پەهلەوی) دەستی پێکرد، کە لە سەر بناخەی پانفارسیزم دامەزرابوو. هەر ساڵ پارەیەکی خەیاڵی بۆ ئەم ڕەوتە خەرج دەکرا و هەر ساڵ زیاتر پەرە بە بناخەگەلی نەتەوەیی فارس دەدرا؛ هاوکات هەوڵێکی زۆر بۆ دوورخستنەوەی گەلانی دی لە پێشینە و ڕەچەڵەکی خۆیان ئەهاتە گۆڕێ، کە کوردیش بەرکەوتەی ئەم ڕوانینە چەوتە بوو. شانامەی فیردەوسی بەردی بناخەی ئەم ڕەوتە دەهاتە ئەژمار؛ بۆیە ئەم کتێبە جیا لە دەوری ئەدەبیی، لە زەمانی ئێمەدا دەورێکی دیکەشی گێڕا، کە سیاسی بوو و ئێستایش هەر ماوە و لەوپەڕی بەهێزیدایە. ئەم ڕەوتە شانامەی لە مێشکی ئێرانییەکاندا پیرۆز کردووە و هەر بەو پێیەش کەسایەتیی فیردەوسیشیان پیرۆز کردووە؛ وەها پیرۆز، کە کەس ناتوانێ هیچ باسێکی نەرێنی یان نەقدێکی جیددی لەسەر ئەو کەسایەتییە و کتێبەکەی بکا؛ ئەو تابۆیە لێرەوە سەری هەڵدا، بەداخەوە هەر ڕۆژ بەهێزتریش دەبێ. تەنانەت کەسانێک بۆ ئەوەی فیردەوسی دەستنگەخواری مەحموو پیشان نەدەن، مێژوویان گۆڕی و زەمانی ژیانی فیردەوسییان بردە بەر لە دەسەڵاتی مەحموو تا بەم چەشنە بیسەلمێنن کە فیردەوسی دەستی بۆ پارە درێژ نەکردووە و ئەو کتێبەی بۆ دڵی خۆی و نەتەوەی فارس هۆنیوەتەوە. فارسەکان هەر ڕۆژ لە بیری ئەوەدان چۆن فیردەوسی و شانامە بەرزتر بکەنەوە و لە دەرباری مەحموو دووری بخەنەوە.

> ***فیردەوسی باسی کورد دەکا، کە زوحاک مێشکی لاوان دەرخواردی مارەکانی دەدا. دوو چێشتلێنەر هەر ڕۆژ بەجێی دوو لاو یەک کەس دەکوژن و بەجێی ئەوی دی مەڕێک سەر دەبڕن و مێشکیان دەرخواردی مارەکانی زوحاک دەدەن***

**- پێگەی ژنان لە شانامەی فیردەوسیدا چییە؟ چونکە ڕای جیاواز لە سەر بیروبۆچوونەکانی فیردەوسی بەرانبەر بە ژنان هەیە.**

+ بەر لە هەر شتێک چاوەڕێی ئەوە نەبین، کە لە خوراسانی ئەو دەمدا ژنان زۆر سەربەست بووبن و لە سەر مافی خۆیان پێداگریان کردبێ؛ ئێستایشی لەگەڵ بێت، ئەو شوێنانەی، کە لە ئێراندا پیاوانە، ژنان کەمترین دەرکەوتنیان لەنێو کۆمەڵگادا هەیە، کە جاروبار لە چیرۆکی نووسەرانی سەردەمی خۆیشماندا وەک جەمالزادە دەردەکەوێ. بەم پێشینەوە نابێ زۆر چاوەڕێی ئەوە بکەین، کە ڕوانینی فیردەوسی لە ڕوانینی نووسەران و شاعیرانی ئەودەم، یان تەنانەت ئێستایش جیاواز بێ. کەمێک پاش مەرگی فیردەوسی شاعیرێک هەر لە خوراسان بەناوی ناسر خوسرەو گوتی: کە تەنانەت نووسینیش کارێکی پیاوانەیە و ژنان نابێ

دەست بۆ قەڵەم ببەن؛ محەمەد غەزالی پێداگر بوو، کە پیاوان کچەکانیان فێری خوێندن نەکەن؛ لە وەها دۆخێکدا ژنان لە شانامەدا دەبێ چ دەرکەوتنێکیان بێ، جگە لەو دەرکەوتنەی، کە لە دیوان و کتێبی شاعیرانی دیکەیە. ئەوەی نووسەرانی سەردەم سەبارەت بە ڕوانینی بەرزی فیردەوسی بۆ ژن ئەدوێن، دوورە لە ڕاستی و زۆرتر پیرۆزکردنی ئەو کەسایەتییەیە، کە بە هۆکاری سیاسی ئەنجام دەدرێ.

**- پێتان وایە بە بەراورد بە هونەری چیرۆک و ڕۆماننووسین، کورد لە هونەری داستان نووسیندا هەژارە؟**

+ ئەگەر مەبەست لە داستان، بە گشتیی گێڕانەوە بێ، دەبێ بڵێم بەڵگەکان لەوە دەدوێن، کە ڕەچەڵەکی چیرۆکی کوردیی زۆر کۆنە و ناتوانین کاتێک بۆ سەرهەڵدانی دیاری بکەین. لەکتێبی یۆنانییەکاندا هاتووە، کە کورد لە

***فیردەوسی دەڵێ: کە حەشیمەتی ئەو لاوە ڕزگارکراوانە زۆر بوو و گەیشتە سی کەس، مەڕ و ماڵاتیان پێدان، کە بڕۆنە کوێستانەکان و لەوێ بژین و ئیدی بەرەو ئاوەدانی نەیەنەوە. فیردەوسی دەڵێ: کە کورد لە تۆرەمەی ئەم لاوە ڕزگارکراوانەیە***

سەردەمی مادەکاندا چیرۆکی «ئوداتیس و زاریادرس»ی هەبووە، کە وەک چیرۆکێکی پیرۆز دەیانگێڕاوە.

ئەگەر مەبەست ئوستوورە بێ، دیسان کۆنترین ئوستوورەکان هی ئێمەیە. بەر لە ئیسلام ئایینی کوردان میترایی بووە و وەک دەزانین، کۆنترین بەڵگە لەسەر بوونی ئەم ئایینە، بۆ هەزار و دووسەد ساڵ بەر لە میلادی مەسیح دەگەڕێتەوە، کە ئاشتینامەیەکە لەنێوان دوو ئیمپراتۆری «میتانی» و «هیتی»دا. لە کۆتایی ئاشتینامەکەدا هاتووە، کە هەرکەس ئەم پەیمانە بشکێنێ، میترا لەنێوی ببا. ئەم ئایینە کۆمەڵێک ئوستوورەی لەگەڵدایە، کە جیهانبینیی کوردان پێکدێنێ و چوار سووچی سەرەکی هەیە: پەیوەندی مرۆڤ لەگەڵ خواکان، خۆی، ئەویدی و سرووشت. ئەم چوار سووچە، بوارە جۆراوجۆرەکانی مێشکی مرۆڤی کورد لەخۆ دەگرێ بە شێوەگەلێکی وەک ئوستوورەی ئافراندن، ئوستوورەی پەیڤ، ئوستوورەی زەمان، ئوستوورەی پەسڵان و زۆری دی دەردەکەوێ. کەواتە ئایینی میترا وەک بناخەیەک بۆ ئوستوورەی کوردی دێتە ئەژمار و ئەگەر بمانەوێ هەر کارێک لە سەر ئوستوورەناسی (میتۆلۆژی)ی کوردی بکەین، پێویستە لێرەوە دەست پێ بکەین.

ئوستوورەگەلی میترایی لە زاگرۆسەوە بڵاو بووەوە و بە دەستی ئێرانییەکانیش گەیشت و لەنێو داب و ئایینی ئەوانیشدا ڕەنگی داوە و دواتر کاریگەریشی لە سەر ئایینی زەرتوشتی دانا. ئەمڕۆ ئێرانییەکان میترا بە خوایەکی ئێرانی دەناسن، بەڵام توێژینەوەکانی دیاکۆنۆف پێمان دەڵێ کە هەم وشەکەی و هەم ئایینەکەی مادییە. یەکێک لە نووسەرانی فارس بە ناوی «مێهرداد بەهار» دەڵێ کە ئێران هەرچیی لە ئوستوورە هەیە، لە زاگرۆسەوە بۆی هاتووە؛ ئەو دەڵێ: کە نە تەنیا ئوستوورە، بەڵکوو جێژنەکانیش وەک نەورۆز و مێهرەگان بناخەی زاگرۆسی هەیە. ئەمە دانپیانانێکە، کە ڕاشکاوانە کاریگەری ئایینی میترا دەردەخا.

بەداخەوە ئێمەی کورد کەمتەرخەم دانیشتووین، نە تەنیا هیچ کارێکمان بۆ ناسینەوەی ئوستوورەگەلی خۆمان نەکردووە، بەڵکوو زۆر جاریش بە چاوی سووکەوە تێی دەڕوانین، یان ئەو دەستەوشە و زاراوانەی بۆی بەکاردەهێنین، نارێکن: لە باشوور بە ئوستوورە دەڵێن «ئەفسانە». هەر لە ڕووی ئەم ناوەوە بزانین، کە چەندە پێگەی ئوستوورە لە لای توێژەران و میدیاکارانی کورد دابەزیوە. لە «ئەفسانە»دا جیهانبینی دەرناکەوێ، کەچی لە وشەی «ئوستوورە»دا ئەو جیهانبینییە لەگەڵ باوەڕەکان خۆی دەنوێنێ. لە لایەکی دیکەوە ئوستوورە خۆی چەندین لێکەوتە و دەرکەوتەی هەیە، کە ئەفسانە یەکێک لەوانەیە.

من لە ئەنجامدا دەڵێم: کە کورد خەزێنەی ئوستوورەی لە لایە، بەڵام لێی بزر بووە، وەرەی ئەوەی نییە خۆی بکات بە خاوەنی، چونکە مۆری گەلانی سەردەستی دراوسێی پێوەیە.

**• مامۆستای بەشی ئەدەبی فارسی لە زانکۆی کوردستان (سنە)**

**تێبینی: (دێهقان) لە ئێستادا بە واتای (جووتیار) دێت، بەڵام ئەو کات بە واتای ( خان ) بووە.**

# عەبدوڵڵا پەشێو:

# ئەگەر ئەمجارە بێمەوە، دەزانم لە نوێژی شێواندا چ دەڵێم

وەرگێڕانی لەفارسیەوە: ڕێباز مستەفا

**- هەرچەندە ئێوە یەکێکن لە هۆزانڤانە مەزنە هاوچەرخەکانی کوردستان، بەڵام لەبەر هەر هۆکارێک، کە بەڕێزتان باشتری دەزانن، دامێنانە قەڵەمییەکانت لە هەموو کوردستاندا بڵاو نەکراونەتەوە و نەگەیشتوونەتە دەستی خەڵکی تامەزرۆی هۆنراوەکانت، لەبەر ئەوەیە، کە زۆرێک لە خەڵکی کوردستان هەر تەنیا ناویان بیستوویت و لە ژیان و ڕابردووتان زۆر ئاگادار نین، بۆیە بەر لە هەر شتێک داواکارین، کە بە کورتی باسی ژیانی خۆتمان بۆ بکەیت.**

+ من ساڵی ٤٦-١٩٤٧، لە گوندی ‹بیرکوت›ی سەر بە شاری هەولێر، لە خێزانێکی ئایینیدا هاتوومەتە دونیا. وەکو دەڵێن هێشتا تەمەنم دوو ساڵ تێنەپەڕیبوو، کە باوکم کۆچی دوایی کردووە. ڕاستییەکەی کاتی منداڵیی خۆمم هیچ لە یاد نییە، تەنیا شتێک، کە هەندێک جار دێتەوە یادم، تاڵی و نەداری و دەستکورتیی ئەوکاتەیە، هەرکاتێک ئەمانەم بە بیر دێنەوە، زۆر دڵتەنگ دەبم. بەهەرحاڵ پاش مەرگی باوکم چوومەتە ماڵی مامم لە هەولێر و درێژەم بە خوێندنم داوە. یەکەمین هۆنراوەم لە ساڵی ١٩٦١ نووسی و لە گۆڤاری ‹هەولێر›دا چاپ کرا. ئەو هۆنراوەیەم بووە هۆی ئەوەی، کە گۆڤارەکە ڕابگیردرێت. ئەو شاعیرانەی کە من پێیانەوە کارانگاز بووم و هۆگری هۆنراوەکانیانم، ‹حاجی قادری کۆیی› و ‹مەلای جەباری› بوون. شیعرەکانی حاجی منیان لەگەڵ ڕێبازی کوردایەتیدا ئاشنا کرد.

ساڵی ١٩٦٣ پەیوەندیم بە شۆڕشی کوردستانەوە کرد، بەڵام دوای ماوەیەکی کورت ڕێبەرانی شۆڕش لەگەڵ ڕژێمی ‹عارف›دا دانوستانیان کرد و منیش گەڕامەوە هەولێر. هەرچەندە ماوەیەکی کەم بوو، کە لەنێو ڕیزەکانی شۆڕشی کوردستاندا بووم، بەڵام ئەزموونێکی باشم وەرگرت، هەر بۆیە خەباتی سیاسییانەی خۆم دەست پێکرد.

ئەوکات بەلاڤوک و ڕاگەیاندن بە زمانی کوردی زۆر کەم و دەگمەن بوون، بۆیە زۆربەی هۆنراوەکانی ئەوکاتم بە ڕێکوپێکی بڵاونەبوونەوە، ئەمە بووە هۆی ئەوەی هەندێک لە هۆنراوەی ساڵانی ‹١٩٦١-١٩٦٥›م لەنێو بچن. هەر هەمان ساڵیش، ڕۆژێک پۆلیس بە ماڵمانی وەرکرد، بە ناچاری بۆ ئەوەی هۆنراوەکانم نەکەونە دەستی پۆلیس، هەموویانم سووتاندن، ئەگەر ئەو ڕووداوە نەبایە، لەو هۆنراوانە ئێستا دەمتوانی هەندێکیان بڵاوبکەمەوە.

> *ساڵی ١٩٦٣ پەیوەندیم بە شۆڕشی کوردستانەوە کرد، بەڵام دوای ماوەیەکی کورت ڕێبەرانی شۆڕش لەگەڵ ڕژێمی ‹عارف›دا دانوستانیان کرد و منیش گەڕامەوە هەولێر*

یەکەمین کۆمەڵە لە هۆنراوەکانم بە ناوی ‹فرمێسک و زام› ساڵی ١٩٦٧ بڵاو کردەوە، کە هۆنراوەکانی زیاتر نەتەوایەتی و دڵداری بوون و ناوەڕۆکیان سادە و ساکار بوون. دوای ئەو کۆمەڵە هۆنراوەیە، زیاتر ڕووم کردە خوێندنەوەی شاعیرانی کلاسیک، وەکو جزیری و خانی و نالی و وەفایی و دواتریش گۆران. هۆنراوەکانی گۆران کاریگەرییەکی قووڵیان تێ کردم.

**- ئایا ئەوکات هۆنراوەکانت لەژێر کاریگەریی ئەو شاعیرانەدا بوون کە خۆشتدەویستن؟**

+ تا ڕادەیەک بەڵێ، بەتایبەتی کۆمەڵە هۆنراوەی دووەمم بە ناوی ‹بتی شکاو› کە لە ساڵی ١٩٦٨ لە کەرکووک بڵاوکرایەوە، لە کارتێکردنی شاعیرانی دیکە بێبەش نەبوو،

بەلام کۆمەڵە هۆنراوەی سێیەمم، کە لە ساڵی ١٩٧٢ بە ناوی (شەونامەی شاعیرێکی تینوو) کە لە بەغدا چاپ کرا، وەکو کۆمەڵە هۆنراوەکانی دیکەم نەبوو، بەڵکوو لە هەر ڕوویێکەوە سەربەخۆ و زادەی بیر و بۆچوونی خۆم بوو، ڕاستییەکەی دەتوانم بڵێم ژیانی ئەدەبیی من لەگەڵ ئەو کۆمەڵە هۆنراوەیەمدا دەستی پێکرد و لەگەڵ ئەوەیدا کە هەژدە ساڵ بەسەر بڵاوکردنەوەیاندا تێپەڕیوە، بەلام هێشتە هەندێک لە هۆنراوەکانیم خۆش دەوێن.



**- کاک پەشێو، هەر وەکو هەمووومان دەزانین کۆمەڵە هۆنراوەیەکت هەیە بە ناوی (دوازدە وانە بۆ منداڵان) کە زادەی بیروباوەڕی ئەوکاتی خۆتن، بۆ ئەو کۆمەڵە هۆنراوەیە بڵاونەکرایەوە؟**

+ باسی ئەو کۆمەڵە هۆنراوەیە دوور و قووڵە. لەو دوازدە وانەیەدا دوو دانە، یان دوو پارچەیان لە شەونامەی شاعیرێکی تینوودا بڵاوکرانەوە و دوای ئەو دوو دانەیە ئیدی نە لە ڕۆژنامەکان و نە لە گۆڤارەکاندا ڕێگە نەدرا، دە دانەکەی دیکە بڵاوبکرێنەوە، بەلام من ساڵی ١٩٧٩ لە بەرلین ئەو کۆمەڵەیەم بڵاوکردەوە. چوارەمین کۆمەڵە هۆنراوەم، بە ناوی (شەو نییە خەونتان پێوە نەبینم)، ساڵی ١٩٨٠ لە بەغدا چاپ کرا، بەلام سانسۆرچییەکانی بەغدا هەندێک لە هۆنراوەکانی ئەو کۆمەڵەیەشیان لابردبوون. دوایین کۆمەڵە هۆنراوەم بە ناوی (سەدان ساڵە) لەم دواییانەدا لە ئەورووپا بڵاوکراوەتەوە.



**- گوتتان کە بە بڵاوکردنەوەی کۆمەڵەی سێیەم لە هۆنراوەکانت، پێت نایە قۆناغی تازەوە، ئایا ئەو نوێبیری و نوێخوازییەی کە قسەت لێ کرد، لەژێر کاریگەریی گرووپە ئەدەبییەکانەوە بوو، یان ناسین و شارەزاییت لە کێشە نەتەوەییەکان هۆ و پاڵنەر بوون؟**

+ بێگومان من لەژێر کاریگەریتیی هەردوو ڕەوتدا بووم، ئەو کاریگەرییە، لەلایەک دەگەڕێتەوە بۆ دید و جیهانبینیی سیاسیی خۆم و لەلایەکی دیکەش ڕەوت و گرووپە ئەدەبییەکانی، کە هاتبوونە کایە، کاریان لێ کردووم.

**- مەبەستی ئێوە لە ڕەوتی سیاسی، هەمان ئازادیی بوو کە بەیاننامەی ١١ی ئازار هێنایە کایەوە؟**

+ بە لای منەوە، تا ڕادەیەک بەیاننامەی ١١ی ئازار بە قازانجی کورد نەبوو، تەنیا ئامانجی ئەوە بوو، کە سەر لە ڕۆشنبیرانی کورد و شۆڕشی کوردستان بشێوێنێت. ئەو بەیاننامەیە زیانی پتر بوو لە سوودی.



**- زۆر باشە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا بەیاننامەی ١١ی ئازار بووە هۆی ئەوەی، کە ئەدەبی کوردی تا ڕادەیەک گەشە بکات و بیووژێتەوە، بۆچوونتان لەو بارەیەوە چۆنە؟**

+ نا، ڕاستییەکەی ئەو شتانە ئامانجی بنەڕەتی شۆڕشی کوردستان نەبوون، ئەمانە زۆر کەمبایەختر بوون لە ئامانجە سەرەکییەکە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا کەمێک مەیدان بۆ ئەدەبی کوردی کرایەوە و ئازادییەکی ڕێژەیی لە چاپەمەنیدا بە کورد درا، ئەمەش لە کاتێکدا بوو، کە زۆربەی خەڵکی لە چیاکان چەکدار بوون، ئێمەش ڕاستییەکەی ئەدیبی ئەوان بووین، نەدەبوو بەو شتە کەمە ڕازی بابین.

با ئێستا بگەڕێینەوە سەر کەشە سیاسییەکەی ئەوکات. چەندین گرووپ و دەستەی ئەدەبیی دامەزران، کە هەر یەکەیان پەیڕەوی لە ڕێبازێکی سیاسیی دەکرد، بەلام

لەمانە گرووپی سەربەخۆش هەبوون، کە ئامانج و مەبەستی دیکەیان هەبوو. یەکێک لەو گروپانە ‹ڕوانگە› بوو، کە پێیوابوو دەبێت ڕەوتێکی ئەدەبیی بەهێز لە کوردستان بێتە کایە و پەیڕەو لە ڕێبازە ئەدەبییە نوێخوازییەکان بکات. ئەو خەڵکە لەژێر کاریگەریی ئەدەبیاتی نوێی ئەورووپا و فارسیدا بوون و لە ساڵی ١٩٦٩ بەدواوە تێکۆشانێکی بەربڵاویان کرد.

**- ئێوە خۆتان لە گرووپی ‹ڕوانگە›دا کارتان دەکرد؟**

+ من لە ڕوانگەدا ئەندام نەبووم، بەڵام هاوکاریم لەگەڵیاندا دەکرد و نووسینەکانی خۆم لە بڵاوکراوەی ئەواندا چاپ دەکرد.

**- بە لای ئێوەوە هۆنراوە دەبێت سادە و بە زمانی خەڵکەوە بنووسرێت؟**

+ بەڵێ، هەڵبەت.

**- هۆنراوەی کوردی لە ساڵەکانی حەفتا چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟**

+ هۆنراوەی کوردی لە دەیەی حەفتادا تازە خەریک بوو بکەوێتە سەر شارێی ڕاستەقینەی خۆی و ناسنامەی خۆی پەیدا دەکرد. ئەوکات بتەوێت، یان نا دەبایە سیاسەت و ئەدەب تێکبەسترابانەوە. شاعیرێکی ‹کۆمەنیست› دەبا شیعری دەربارەی کێشە چینایەتییەکان بنووسیبا و شاعیری ‹پارتی› دەبا لە بارەی پرسە نەتەوەییەکانەوە بنووسێت، بەڵام ئێستا وانییە، هۆنراوەی کوردی ناسنامەی تایبەتی خۆی دۆزیوەتەوە.

**- لە دەیەکانی ڕابردوودا بەشێکی زۆر لە ئەدیب و ڕۆشنبیرانی کورد لە هەندەران دەژین، ئایا دەکرێت بڵێین ئەدەبی کوردی لە ئاوارەییدا درێژەپێدەری هەمان ئەدەبی کوردییە لە کوردستان؟**

+ بەڵێ، درێژەپێدەری هەمان ئەدەبە و پەلێکە لەودا. ئەگەر ئەدەبیات لە کوردستان دیالۆگ بێت، ئەوا لە ئاوارەییدا مۆنۆلۆگە و هەمان ڕێگەی گرتووەتەبەر، بەڵام لە چاو ئەدەبیاتی خەڵکانی دیکە، کە لە ئاوارەییدا گەشە دەکات و پێدەگات، ئەدەبی کوردی ئێستا منداڵێکی سێوییە و بەس، بۆ نموونە ئەدەبیاتی ڕووسی، کاتێک کە لە ئاوارەییدا گەشەی دەکرد، لە ناوەوەی ڕووسیاشدا فەرهەنگ و ئەدەبیاتی ئەو گەلە لە پێگەیشتن و گەشەکردندا بوو، بەڵام ئەدەبیاتی کوردی وا نییە و پشتیوانێکی بەهێزی ناوەوەی نییە.

**- ئێوە باش دەزانن، کە تێکۆشانی ئەدەبی لە ئاوارەییدا بۆ یەکبوون و گەشەپێدانی ئەدەبییە لە**



**شیعر ئەگەرچی کاتی خۆی خوانی پڕ نان دەکرد، بەڵام ئێستا وانییە، کارێکە، بەهرەیەکە تایبەت، کە لەنێو دەروونی مرۆڤەوە سەر هەڵدەدات**

**کوردستان، تا ئەو شوێنەی من ئاگام لێ بێت لە بواری شیعردا (مونەیەد تەیب) بەو ئومێدە هەندێک کاری کردووە، ئێوە لەو بارەیەوە چیتان کردووە؟**

+ منیش چەندین هەنگاوم ناوە.

**- بۆ نموونە؟**

+ (ئەگەر ئەمجارە بیمەوە، لە نوێژی شێوان دەزانم چ دەڵێم) و...

**- من ناتوانم واز لەم پرسیارە بێنم، کە هەندێک نووسەر و ئەدیب هەن خۆیان بە کورد دەزانن، بەڵام بە زمانی بێگانە دەنووسن، لەوان یەشار کەمال، ییلماز گیونەی، عەبدولمەجید، م مەسعوود، سەلیم بەرەکات و... کە ڕۆمان و نووسینەکانیان لەسەر ئاستی جیهانیدا حسابیان بۆ دەکرێت، بەڵام زۆر لە نووسەرانی دیکە، کە بە کوردی دەنووسن، نووسینەکانیان زۆر لەسەر ئاستی جیهانیدا نەناسراون، یان باشترە بڵێم باش نانووسن؟**

+ ئەگەر بنۆڕیە شیعری کوردی، دەبینیت، کە شیعرگوتن



و شیعرنووسین لە کوردستان مێژوویێکی دوورودرێژ و گەشەداری هەیە، تا گەیشتووەتە ئەمڕۆ، بەڵام ڕۆماننووسین لەنێو کورددا ئەو پێشینە مێژووییەی نییە. ڕۆماننووسین لاساییکردنەوەیەکە، کە لە ئەورووپاوە وەرگیراوە. پەخشاننووسین خۆی زمانێکی تایبەتی هەیە، کە ئەو زمانە هێشتە لەنێو ئێمەدا جێی خۆی نەگرتووە، لە حاڵەتی پێگەیشتندایە، بۆیە دەبینین ئەوانەی، کە بە زمانی عەرەبیی، یان تورکیی دەنووسن، داهێنانەکانیان بەرجەستەتر و جوانتر خۆی دەنوێنێت، بەڵام دەبێت بڵێم، کە زمانی ڕۆماننووسین لە کوردیدا خەریکی گەشەکردن و پێگەیشتنە و دەبینین، کە نووسینەکانی (حوسێن عارف) هیچی وا کەمتر نین لە نووسینەکانی ئەوان.

**- من ڕۆمانەکانی حوسێن عارفم بە زمانی عەرەبی خوێندوونەتەوە، بۆیە ناتوانم لە ڕووی زمانی نووسینیانەوە لەگەڵ نووسینەکانی (زەکەریا تامر) و (یوسف ئیدریس) بەراوردیان بکەم.**

+ ئەمە بابەتێکی دیکەیە.

**- کاک پەشێو پرسیارێکی تا رادەیەک تایبەتیت لێ دەکەم، ئایا ئەگەر شاعیر نەبایت، ئارەزووتان دەکرد چیبان؟**

+ ئەگەر شاعیریش نەبام، دیسان هەر ئارەزووم ئەوە بوو شاعیربام.

**- ئایا تۆ وەکو پیشەیەک دەڕوانیتە شیعر؟**

+ نا، شیعر ئەگەرچی کاتی خۆی خوانی پڕ نان دەکرد، بەڵام ئێستا وانییە، کارێکە، بەهرەیەکە تایبەت، کە لەنێو دەروونی مرۆڤەوە سەر هەڵدەدات.

**- باشە دوایین پرسیار، ئێستا نزیکەی پێنج ساڵە کە خوێنەرانی کورد شتێکی تازەی ئێوەیان نەبینیوە، هۆی چییە؟**

+ من کە ناتوانم نەنووسم، بەڵام بەداخەوە هۆیەکەی دووریمە لە ناوەندەکانی بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری و ئەدەبی کوردی، دەنا شتم هەیە بۆ بڵاوکردنەوە.

**• ئەم چاوپێکەوتنە بە زمانی فارسی لە ڕۆژنامەی (ئیتیلاعات)ی چاپی تاران بڵاو کراوەتەوە و ئێمە لە ساڵی ١٩٩١ کردمانە کوردی و لە ژمارە ٨ی گۆڤاری قەڵادا بڵاو کرایەوە. بەڵام بەداخەوە ئەوکات بەهۆی کەمتەرخەمیی و درک پێنەکردنی، ژمارە و ڕۆژی بڵاوبوونەوەی ڕۆژنامەکەمان تۆمار نەکردووە.       وەرگێڕ**

# حوجرە (کون تێیە)کەی نالی لە باڵەکەتی بووە؟

وەک دیارە ئەو ژوورەی لەپاڵ مزگەوت، بەتایبەت بۆ ژیان و خوێندنی فەقێیان تەرخانکراوە و حوجرەی پێدەگوترێت، ڕەنگدانەوەی گەورەی بووە لە خەیاڵ و بەرهەمی شیعریی ئەو فەقێیانەی دواتر بێجگە لە گەیشتن بە پلەی مەلایەتی و زانای ئایینیی، بوونەتە شاعیری لێهاتووش. نووکی خامەی شاعیر و مەلایەکی وەکوو نالی ١٨٠٠-١٨٧٧ز لە دیوانەکەیدا، بە شیعرێکی درێژ و بەشێوەیەکی گاڵتەئامێز وەسفی حوجرەیەک دەکات.

تا ئێستەش گەلێکجار و بەردەوام ئەو پرسیارە لای خوێنەر و توێژەران سەرهەڵدەدا، دەبێت ئەم حوجرەیە هی کام مزگەوت و کامە شوێن بووبێت، کە بەوچەشنە نالی باسی لێوە کردووە؟ ئەم گوتارەش هەوڵێکی دیکەیە بۆ بەدەستهێنانی وەڵامێک بۆ ئەو پرسیارە.

شیعرەکە بیست و سێ دێڕە و لەسەر کێشی عەرووزی ڕەمەلە، سەرەتاکەی بەم دێڕە دەستی پێکردووە:

***وەک قەفەس ئەم حوجرە کون تێیە کە وا کرتوومیە ناو***

***تار و پۆیی عەنکەبووتە، زۆرە لێی کردوومە داو***
*(دیوان، ل ٣٥٥)*

*تاوەکوو دەڵێت:*

***چونکە نەتکرد قوڕ بە سەریا تاوەکوو تەسکین بێ***
***مەیەرە بەر پێلاقە توخودا، بلا بگری بە تاو!***
(دیوان، ل ٣٦٦)

ئاشکرایە لەدوای موسڵمانبوونی کورد، حوجرە و مزگەوت وەکوو پێگەی سەرهەڵدانی خوێندەواریی و پێگەیاندنی فەقێ و مەلا، پانتاییەکی گەورە لە ژیانی کولتووریی و وشیاریی کۆمەڵی کوردەواری بۆ خۆیان دەبەن، ئەم کاریگەرییە ڕۆڵی گرنگ دەبینێت لە هاتنە مەیدانی مەلا و پیاوانی ئایینیی گەورەی وا، کە نەک هەر لە کوردستان، بەڵکوو لەنێو هەموو جیهانیی ئیسلامیدا ناوبانگیان بڵاودەبێتەوە و بەشدارییەکی بەرچاو دەکەن لە دەوڵەمەندکردنی گشت زانستەکانی پەیوەست بە زمانی عەرەبیی و ئایینی ئیسلام. هەر لەنێو ئەم مەلا گەورانەشدا، هەندێکیان وێڕای ئەوەی پلەی زانستیی مەلایەتییان گەیشتووەتە ئاستێکی زۆر تۆکمە و باڵا، لە هەمانکات ژیانی خوێندەوارییان بۆ خزمەتی زمان و وێژەی کوردیی تەرخانکردووە و ناو و ناوبانگیان وەکوو شاعیری داهێنەر و بلیمەت لەنێو لاپەڕە درەوشاوەکانی (مێژووی ئەدەبیاتی کوردیی) تۆمارکردووە.

ژووری حوجرەی مزگەوت جێگەی مەلای مزگەوت و دەرسدانی فەقێیان بووە. هەر لەزووەوە حوجرە وەکوو مەڵبەندێکی گرینگی فێربوونی خوێندن و نووسین و زانستەکانی دیکە، لە گشت شار و زۆربەی دێهات و ئاواییەکانی کوردستاندا هەبووە. وەک نەریتێکی باوی خوێندنی ئایینیی.

بەزۆری فەقێ بۆ تەواوکردنی پلەکانی خوێندنی حوجرە و بەدەستهێنانی ئیجازەی مەلایەتی، لە یەک جێگە و حوجرەدا نەماوەتەوە، بەڵکوو بەردەوام لە گەڕاندا بووە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە، بەدوای مەلای چاک و پڕ زانستدا گەڕاوە، بۆئەوەی لەلای ئەو مەلایانە زانستە شەرعییەکان بخوێنێت، تەنانەت



محەمەد عەبدولڕەحمان مێرگەیی*

منداڵەکانی مەلا و شێخەکان، خۆیشیان دەنێردرانە حوجرە و مەدرەسەی مەلای دی بۆ خوێندن[١].

شاعیر و زانایەکی ناودار و گەڕیدەی وەکوو مەلا خدری شارەزووری ناسراو بە (نالی) بۆ تەواوکردنی خوێندنی مەلایەتی چووەتە شوێنەکانی وەکوو سنە، سابلاغ، قەرەداخ، هەڵەبجە و سلێمانی. لە قەرەداخ لەلای شێخ موحەممەدی (ابن الخیاط) خوێندوویەتی، لە سلێمانی لە مزگەوتی سەید حەسەن لەلای مەلا عەبدوڵلای ڕەش بووە و پلەی موستەعیدیی لە خانەقای مەولانا خالید لە سلێمانی وەرگرتووە، لە هەڵەبجە و سلێمانی لەلای شێخ عەبدوڵلای خەرپانی خوێندوویەتی[٢].

یەکێک لەو مەڵبەندە گرینگانەی ئەو سەردەمەی نالی تێیدا ژیاوە، حوجرە و مەدرەسەکانی وڵاتی باڵەکەتی بووە، بەتایبەتی حوجرەکانی گوندی شێخوەتمان و گرتک و ڕوست، لەلای مەلا و زانایانی وەکوو مەلا موحەممەدی کاک عەبدوڵلای شێخوەتمان ١٧٨٩-١٨٦٧ز[٣] و زانای بەناوبانگ ئیبنوئادەم ١٧٥٠-١٨٢٢ز[٤].

> ***بەگوێرەی سەرچاوەیەکی وەکوو کتێبی (مێژووی زانایانی کورد، بەرگی یەکەم) لە دەوروبەری ساڵی ١٨٢٠ی زایینی، نالی شاعیر جگە لەو جێیانەی ناوبران و هەر لەمیانی خوێندنی فەقێیەتیدا، چووەتە باڵەکەتی و لە گوندی شێخوەتمان خوێندوویەتی***

باڵەکەتی ئەو ناوچە شاخاوییەیە، کە عەشیرەتی (باڵەک)ی تێدا نیشتەجێیە، لەڕووی جوگرافییەوە دەکەوێتە باکووری خۆرهەڵاتی ڕواندز، سنوورەکانی لە سەرووی ڕواندزەوە لە نزیک گوندی (بەرسیرین) بەدرێژایی ڕێگەی هاملتۆن تاکوو نزیک سنووری حاجی ئۆمەران درێژدەبێتەوە.

گوندی (شێخوەتمان)یش دەکەوێتە سەرەتای یەکێک لە دۆڵەکانی دەڤەرەکە، بەناوی دۆڵی (سەکران) لە نزیک قەزای چۆمان.

بەگوێرەی سەرچاوەیەکی وەکوو کتێبی (مێژووی زانایانی کورد، بەرگی یەکەم) لە دەوروبەری ساڵی ١٨٢٠ی زایینی، نالی شاعیر جگە لەو جێیانەی ناوبران و هەر لەمیانی خوێندنی فەقێیەتیدا، چووەتە باڵەکەتی و لە گوندی شێخوەتمان خوێندوویەتی[٥] تەنانەت لەو گوندانەی دەوروبەری ئەوێ، نالی یارێکی هەبووە بەناوی (شەم) ڕۆژێکیان بەسەرهاتێک ڕوویداوە[٦] بۆ ئەم مەبەستە نالی غەزەلێکی هۆنیوەتەوە و لە دوایین دێڕدا ناوی (شەم) هاتووە[٧] وەک دەڵێت:

***نالی چییە وا میثلی جوعەل غەرقی شیاکەی،***

***خۆ تۆ بە حیسابی وەکوو پەروانە شەمت بوو؟!*** (دیوان: ل٣٧٠)

سەرەتا با بزانین ئایە بە واقیعی نالی لە باڵەکەتی خوێندوویەتی و لە سەردەمی ئەودا ئەم ناوچەیە ئەوەندە زانا و مەلای چاک و حوجرەی بەناوبانگی تێدا هەبووە کەوا نالی هان بدەن ڕووبکاتە ئەوێ و ئەو ڕێگە دوورەی بۆ ببڕێت، چونکە دیارە فەقێی قابیل و زیرەک لە حوجرە و لەلای مەلای بەناوبانگ نەبێت ناخوێنێت.

بەگوێرەی سەرچاوەکان لە سەدەی نۆزدەدا ڕێژەیەکی زۆری مزگەوت و خوێندنگە و مەلا و فەقێ لە باڵەکەتی هەبووە، هۆکارێکی دروستبوونی ئەم دیاردەش بۆ دۆخ و وەختێکی زۆر زووتر دەگەڕێتەوە، بەوەی گوایە لەوکاتەی شاعەباسی سەفەوی قەتڵوعامێکی گەورەی بەسەر ناوچەیەکی وەکوو موکریاندا هێناوە، ئەو کارەساتە تا ئەو رادەیە بووە، کە ناوچەکە چۆڵبووە و بووەتە هۆی ئەوەی دانیشتووانی موکریان، ئەوانەی توانیویانە ڕزگاربن لەو کوشتوبڕە، بە ناوچەکانی دیکەی کوردستانی دەرەوەی ئێراندا بڵاوبوونەتەوە، کە ژمارەیەکی زۆریان لە باڵەکەتیدا نیشتەجێ بوونە، ئەمەش بەهۆکاری دراوسێیەتی جوگرافیی هەر دوو ناوچەکە. ئیدی موکریان، کە وڵاتێکی پڕ مەلا و مەدرەسەی دینی بووە، لەوە بەدواوە وا پێدەچێ زۆربەی مەلا و مودەڕیسەکانی ئەوسای موکریان ڕوویان کردبێتە باڵەکەتی و بەناچاریی تێیدا مابنەوە و بووبنە سەرەتای زۆربوونی مەلا و مزگەوت و مەدرەسە لەو دەڤەرەدا[٨] [٩].

ئینجا وەک لە بەرگی یەکەمی (یادی مەردان)دا هاتووە، زانا و کەسایەتییەکی ناوداری وەکوو مەولانا

خالیدی نەقشبەندیی ١٧٧٩-١٨٢٧ز، بە فەقێیەتی لەلای زانایەکی ئایینیی وەکوو مەلا موحەممەدی مەشهوور بە ئیبنوئادەم خوێندوویەتی[10] کە یەکێکە لە مەلا هەرە بەناوبانگەکانی سەردەمی خۆی و نیشتەجێی و خەڵکی باڵەکەتی بووە، ئیبنوئادەم لە حوجرەکەی خۆی فەقێی زۆر چاکی هەبووە و لە هەموو لایەکی کوردستانەوە روویان تێکردووە، هەروەک لەلای میری سۆران موحەممەد پاشای رواندوز پایەی بڵندی هەبووە.

لەلایەکی دیکەوە شاعیرێکی ناوداری وەکوو حاجی قادری کۆیی ١٨١٦-١٨٩٧ز لە هاوینی ساڵی ١٨٥٣ز لەگەڵ حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە ١٨٣٤-١٩٠٨ز، گەشتێکی خوێندنی فەقێیەتی بۆ دەڤەری باڵەکەتی دەکەن و لە گوندی شێخوەتمان هەردووکیان پێکەوە لەلای مەلا موحەممەدی کاک عەبدوڵلا دەخوێنن[11][12].

هەبوونی دۆخی لەباری ژیان و بوونی رێژەیەکی زۆری مزگەوت و حوجرە، ئینجا هاتنی کەسایەتی وەکوو مەولانا خالید بۆ باڵەکەتی، پێش سەردەمی هاتنی نالی، هەروەها هاتنی حاجی قادر و مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادەش بە هەمان شێوە بۆ باڵەکەتی لە دوای هاتنی نالی، دەکرێت ببنە بەڵگەی بەهێز بۆ وەراستگەرانی ئەو زانیارییەی لە سەرچاوەیەکی وەکوو کتێبی (مێژووی زانایانی کورد)دا هاتووە لەمەڕ ئەوەی فەقێیەکی زیرەک و گەڕۆکی وەکوو نال-یش بەهەمان شێوە هاتبێتە باڵەکەتی بۆ خوێندن لە حوجرەکەی شێخوەتمان[13].

کەوابێت، ئەگەر نالی لە حوجرەی شێخوەتمان خوێندوویەتی، ئایە ئەو (حوجرە کون تێیە)ی نالی لە شیعرەکەیدا وەسفی دەکات، حوجرەکەی شێخوەتمان بووە؟ ئایە ئەو وەسفانەی حوجرەی نێو قەسیدەکە، دەگونجێن لەگەڵ وەسفی حوجرەی ناوبراو؟

بۆ وەڵامی ئەم پرسیار و ئەم ئەگەرە، دەکرێت چەند ئاماژە و مەزەندەیەک بکەینە بەڵگە و بنەما بۆ نزیکیی ئەو گریمانەیە و سەلماندنی.

سەرەتا دەبێت ئەوە بڵێین، کە سەبارەت بەو (حوجرە کون تێیە)ی نالی شاعیر لەم شیعرەیدا وەسفی کردووە، شەرحدەرانی دیوانی نالی؛ مامۆستا مودەڕیس و کوڕەکانی، وەهای بۆدەچن ئەم حوجرەیەی نالی بەوچەشنە گاڵتەئامێزە وەسفی کردووە، بە تەواوی دیارنییە کامە حوجرەیە لەو حوجرانەی مەلا خدری شارەزووری بەدرێژایی سەردەمی خوێندنی فەقێیەتی تێیدا ماوەتەوە و ژیانی فەقێیەتی تێدا بەسەربردووە. لە شەرحی دێڕەکانی شیعرەکەدا، سەرەتا ئەوان پێیان وایە ئەم حوجرەیە، حوجرەکەی خانەقای مەولانا خالیدی نەقشبەندیی نییە، ئەوەی نالی لە قەسیدە بەناوبانگەکەیدا (قوربانی تۆزی رێگەتم) باسی لێوەکردووە. بەڵگەی ئەم بۆچوونەشیان ئەوەیە کە هەم نالی لەلایەک لەو قەسیدەدا ستایشی حوجرەکەی کردووە نەوەک بە گاڵتەوە باسی کردبێت، لەلایەکی دیکەشەوە ئەو وەسفەی نالی بۆ وەرزی زستانی ئەو جێگەیەی حوجرەکەی لێبووە، لەگەڵ زستانی شاری سلێمانیدا ناگونجێت، لەبەرئەوەی زستانی سلێمانی تا ئەو رادەیە سارد و دژوار نییە بە بەراورد لەگەڵ ئەوەی لەنێو شیعرەکەدا هەیە. هەروەک لەوێ خەڵووزگەشکردنەوە باوبووە.

هەروەک شەرحدەران باوەڕیان وایە ناکرێت ئەم وەسفە هی حوجرەکەی شاری سنەش بووبێت، کە هەمدیسان سەردەمێک نالی لەوێ خوێندوویەتی، لەبەرئەوەی گوایە حوجرەکانی ئەو سەردەمی باژێڕی (سنە) هەم پۆشتە و پەرداخ بوونە، هەم لە فەسڵی زستاندا ئاگریان لە بوخاریدا تێدا کراوەتەوە، نەوەک بەشێوەی ئاگرکردنەوەی نێو ئاگردان، کە نالی لە دێڕی دووەمدا باس و وەسفی کردووە و دەڵێت:



***سەرمیچی کوڵەنگی لەت لەتی دەسرازە کۆن***

***بان و دیواری بە میثلی لانکەی ئەجزا شکاو*** (دیوان، ل٣٥٦)

بەم چەشنە شەرحدەران دەگەنە ئەو باوەڕەی حوجرەکەی دووتوێی ئەم پارچە شیعرەی نالی لە هیچ یەکێک لەم دوو شارە، واتە لە سلێمانی و سنە نەبووە، بەتایبەتی، لەبەرئەوەی باسی (گەرمای بەگوڕی هاوین و سەرمای دژواری زستان) لە شیعرەکەدا هاتووە. دواتر هەر لە درێژەی شەرحەکەدا، ئەوان پێیان وایە، لەبەر ئەو وەسفی گەرما و سەرمایە، ڕێی تێدەچوو و دەگونجا حوجرەکەی مزگەوتی گوندی (خەرپانی) ی بووایە، کە نالی لەوێ لەلای زانای گەورە (شێخ عەبدوڵڵای خەرپانی)ی خوێندوویەتی، بەڵام بە ڕای ئەوان ناکرێت ئەم حوجرەیەش بووبێت، چونکە

> ***سەبارەت بەو (حوجرە کۆن تێیە)ی نالی شاعیر لەم شیعرەیدا وەسفی کردووە، شەرحدەرانی دیوانی نالی؛ مامۆستا مودەڕیس و کوڕەکانی، وەهای بۆدەچن ئەم حوجرەیەی نالی بەوچەشنە گاڵتەئامێزە وەسفی کردووە، بە تەواوی دیارنییە کامە حوجرەیە***

ناگونجێ لە کوێرەدێیەکی ئەوهادا دووکانی (جەڕڕاح و طەبیب) هەبووبێت، هەروەکوو لە دێڕێکدا نالی باسی ئەو دووکانە دەکات و دەڵێت: سوختەکان لەدوای بارینی تەزرەدا غاردەدەنە دووکانی طەبیب و جەڕڕاح بۆ تیماری سەری شکاویان:

***ڕادەکەن بۆ جانیبی دوککانی جەڕڕاح و طەبیب***

***چاک و دامەن مەلکراو و، سەر شکاو و تەنگەتاو*** (دیوان، ل٣٦٥)

لەبەرئەوەی گوایە هەبوونی ئەمجۆرە دووکانە لە هەر شوێنێکی ئەو سەردەمدا، مانای ئەوەیە پێویست دەکات شوێنەکە (ئاوەدانییەکی پێشکەوتوو) بووبێت، نەوەک گوندێکی بچووکی دوورەدەست. لە ئەنجامدا شەرحدەران دەگەنە ئەوەی بڵێن: (هەر چۆن بێ ئێستا ناتوانین بڕیاربدەین حوجرەکە حوجرەی کوێ بووە، مەگەر لەمەوپاش بە تەواوی بۆمان ڕوون بێتەوە)[١٤]

ئەوەی جێی سەرنجە شەرحدەرانی دیوان، لە باسی ژیانی نالی و شەرح و ڕاڤەی دێڕەکانی ئەم شیعرەوە، بە هیچ جۆرێک باسیان لە چوونی نالی بۆ باڵەکەتی، یان جێی دیکەی وەکوو وڵاتی کۆیێ نەکردووە، کە بەگوێرەی هەندێک سەرچاوە، گوایە نالی جگە لە باڵەکەتی، لە کۆیەش خوێندوویەتی و ئەم شیعرەی لە (هەجووی حوجرەی مزگەوتی کۆنە جومعەی کۆیە)[١٥] نووسیوە.

بەرلەوەی بگەڕێینەوە سەر وەڵامی ئەوەی ئایە دەگونجێ و ڕێی تێدەچێت (ئەم حوجرە کۆن تێیە) باسی حوجرەکەی شێخوەتمان بێت. سەرەتا دەبێت ئاماژە بەوە بدەین، کە حاجی قادری کۆیی لە پارچە هۆنراوەیەکیدا ناوی هەندێک لە شاعیرانی هێناوە و بە نیوە دێڕی (شەهسەواری بەلاغەتی کوردان) دەست پێدەکات، گوایە ئەو شاعیرانە و چەندێکی دیکەش هەر لەو سەردەمەدا لەگەڵ ئەوان لە گوندی شێخوەتمان و لای مەلا موحەممەدی کاک عەبدوڵڵا خوێندوویانە، حاجی قادر لە دێڕێکدا دەڵێت:

***(مەلکە قوڕ) و (حیماری) و (کیسەشکەل)***

***(قس من اسمائهم و لا تسأل)*** (دیوان، ل ٢١٨)

هۆنەرانی وەکوو مەلکەقوڕ و حیماری و کیسەشکەل و هەندێکی دیکە، کۆمەڵە فەقێیەک بووینە لە مزگەوتەکەی مەلا موحەممەدی شێخوەتمان و چەند مزگەوتێکی دیکەی باڵەکەتی، هەموویان شاعیر و گاڵتەچی، زۆربەی ڕۆژانی سێشەممە و هەینی، کە دەرسیان نەبووە، چوونەتە لای یەکدی و کۆڕی گاڵتە و جەفەنگیان سازکردووە. ئەم شاعیرانە ڕێکەوتی خوێندنی فەقێیەتی کۆی کردوونەتەوە و لە گشت ناوچەکانی کوردستانەوە هاتوون، ئەوکاتەی عەبدوڵڵای جەلیزادە و حاجی قادر دەچنە باڵەکەتی، زۆربەی ئەوانە پێشتر لەوێ خوێندوویانە و لای مەلا موحەممەدی شێخوەتمان لە پلەی موستەعیدیی بووینە. حاجی و جەلیزادەش دەبن بە هاوڕێی خوێندنی فەقێیەتیان. هەروەکوو مامۆستا مەسعوود موحەممەد دەڵێت: ڕەنگە ئەم شاعیرانە (پتر لەوەی خەریکی خوێندن بووبن، خوویان داوەتە

شیعر و لەتیفە و گەپ. بە خۆڕایی نییە حاجی قادر سێ کەسیان لە جوملەی شاعیرە ناودارەکانی کورد دەژمێرێ، دیارە دەبێ ئەوەندە شیعریان دانابێ پێیان بگوترێ شاعیر)[١٦].

خڕبوونەوەی ئەو شاعیرانە لەو ناوچەیەدا بۆ خوێندن لەگەڵ چەندین فەقێ و مەلای دیکەی وەکوو خۆیان، وەها دەخاتەڕوو ئەوکات وڵاتی باڵەکەتی، لەلایەنی ژیاریی و خوێندەواری و هەم گوزەرانیشەوە، مەڵبەندێکی پێشکەوتووی کوردستان بووە. هەروەک چوونی ئەوانە بۆ ئەوێ، بەڵگەی بوونی کەش و زەمینەیەکی شیاو و گونجاوبووە بۆ خوێندنی زانستەکانی مەلایەتی لەو دەڤەرە[١٧].

بە پشتبەستن و گەڕانەوە بۆ ئەو زانیارییانەی لە سەرەوە خرانە بەرباس، دەتوانین بڵێین ئەو حوجرەیەی نالی بەوچەشنە گاڵتەئامێزە لەو شیعرەدا باسی لێوە دەکات، زۆر ڕێی تێدەچێت مەبەستی لە حوجرەکەی گوندی شێخوەتمان بێت، لەبەرئەوەی:

_ وەسفەکەی نالی بۆ وەرزی زستانی ئەو جێگەیەی حوجرەکەی لێبووە، لەگەڵ زستانی باڵەکەتیدا دەگونجێت و زستانی باڵەکەتی بەفراویی و سەختە، هەروەها هاوینەکەشی تا ڕادەیەک گەرمە.

_ لە گوندەکانی باڵەکەتی و مزگەوت و حوجرەکانیدا وەها باوبووە، کە ئاگرکردنەوە لە زستاندا، پتر بە شێوەی ئاگردان و سۆبەی داران بووە، نەوەک بەشێوەی خەڵووزگەشکردنەوە و بوخاری.

_ هەموو ئەو وەسفەی نالی باسی دەکات لە (ئەنهار و جۆگە و هاژە هاژ) لە ڕۆژدا و (قرژاڵ و بۆق و ژاوە ژاو) لە شەودا، ڕێک لەگەڵ ژینگە و جوگرافیای شێخوەتمان و گوندەکانی دەوروبەریدا دینەوە، لەبەرئەوەی ناوچەکە بەگشتیی پڕیەتی لە کانیاو و هاژەی ڕووبار و گۆم و ئاوەزێ و قامیشەڵان و دار و دەوەن، کە ئەمانەش مۆڵگەی قرژاڵ و بۆق و کیسەڵ و حەربا و جۆرەها گیانەوەری دیکەی بە جووڵە و ژاوەژاون.

_ ئینجا سەبارەت بە هەبوونی دووکانی (جەڕراح و طەبیب) لە باڵەکەتی، کە بوونی ئەمجۆرە دووکانە وەها پێویست دەکات شوێنەکە پێشکەوتووبووبێت، دەتوانین بڵێین بەگوێرەی ئەو زانیارییانەی پێشتر ئاماژەیان پێدرا لەبارەی دۆخی پێشکەوتووی باڵەکەتی لەڕووی ژیان و گوزەرانەوە، هەروەک ئەو قەڵەباڵغییەی لەوێ هەبووە، لە سەردەمی حاجی قادر و جەلیزادە و شاعیرانی دیکەی هاوڕێی خوێندنیان وەکوو درێژبووەوەی سەردەمی نالی، ئەگەری زۆر هەیە و وەها پێویست دەکات هەر لە زووەوە لەو شوێنەدا دووکانی (جەڕراح و طەبیب) هەبووبێت تاوەکوو خەڵک و سوختەکان بۆ تیماری دەست



وێنە: باڵەکەتی، گوندی شێخوەتمان، هاوینی ساڵی ٢٠٠٧ گیراوە.

و قاچ و سەری شکاویان ڕووی تێبکەن. جگەلەوە ڕەنگە ئەم تەعبیری (جەڕڕاح و طەبیب)ە هەر تەنیا وەکوو قاڵبێک بووبێت و شاعیرانی کلاسیک لە شیعردا بەکاریان هێنابێت، بەدەر لە مەرجی پیشکەوتوویی ئەو جێگەیەی وەسفیان کردووە[١٨].

_ خاڵێکی دیکەی زۆر گرینگ ئاماژەی پێبدەین ئەوەیە، کە بە پشتبەستن بەو باس و خواسانەی لە شیعرەکەی حاجی قادر لەبارەی ناوهێنانی شاعیرەکان و ئەوەی باس دەکرێت لەبارەی ئەو فەقێ و مەلا و شاعیرانە لەو سەردەمەی خوێندنی شێخوەتمان، کەوا بەو شێوە و تا ئەو ڕادەیە قۆشمە و گاڵتەچی بوونە و بەردەوام لەگەڵ خوێندنەکەیاندا بەزم و ڕەزم و گاڵتەوگەپەکەی خۆیشیان هەر ئەنجامداوە، دەکرێت ئەو دۆخە پێشینەی دوورتـری هەبووبێت و لـە پێش ئـەوانیشـەوە ئەم دیاردەی گاڵتەوگەپەی ئەوان درێژبووەوەی سەردەمی

**بەگوێرەی سەرچاوەکان لە سەدەی نۆزدەدا ڕێژەیەکی زۆری مزگەوت و خوێندنگە و مەلا و فەقێ لە باڵەکەتی هەبووە**

پێش خۆیان بووبێت، ئەو سەردەمەی، کە نالی-ش لە پێش ئەواندا هاتۆتە ئەوێ و تەنانەت لە پێش هاتنی نالی-ش، واتە ئەو زەمینە و ژینگە کۆمەڵایەتییە پڕ لە کەیفخۆشیی و گاڵتەئامێزە، وجـودی هـەبووە و درێژەی سەردەمێکی پێشووتربووە، هەر بۆیە کاتێک نالی شاعیریش لە حوجرەکەی شێخوەتمان فەقێ بووە، ئیلهامی نووسینی شیعرێکی گاڵتەئامێزی بەچەشنی (ئەم حوجرە کون تێیە)ی بۆ هاتووە، ئەمەش وەکوو شیعرێکی گاڵتەئامێزی لەدایکبووی نێو ژینگەیەکی خودان گاڵتەچی.

_سەرنجێکی دیکەی پێویست لەبارەی هەندێک وشە و زمانی تەعبیری نێو شیعرەکە، وەک لە کۆتایی شەرحی دێرەکاندا هاتووە، شەرحدەران پێیانوایە لەم شیعرەدا نالی چەند تەعبیرێکی نوێ و نامۆی بەکارهێناوە، بۆ نموونە لە بەیتی یەکەمدا نالی لەباتی بڵێت: (کونی تیایە)

تەعبیری (کون تێیە)ی بەکارهێناوە، هەروەها لە بەیتی پێنجەم لەباتی (وەها سەرما تێیدا سەرمای دەبێ) نالی هاتووە تەعبیری (وەهـا سەرمای تێدا سەرما دەبێ) ی بەکارهێناوە. دەکرێت بەکارهێنانی ئـەم وشـە و تەعبیرانەش بەم چەشنە تازەیە، بکرێنە بەڵگەی دیکە بۆ ئەگەری پەیوەندی ئیلهامی نووسینی ئەم شیعرە بە حوجرەی شێخوەتمانەوە، لەبەرئەوەی ئەم شێوازە وشە و تەعبیرانە لەنێو شێوە ئاخاوتنی باڵەکەتی بە ئاسایی بەکاردەهێنرێن. هەمدیسان لە دیوانەکەیدا دێڕە شیعر هەیە، نالی تێیدا وشەی (نزانم)ی بەکارهێناوە، ئەم پەیڤەش زۆر پتر لە ئاخاوتنی باڵەکەتی بەکاردەهێنرێت لـەچاو جێی دیکـەی سـەر بـە شـێوەزاری سۆرانـی (کوردیی ناوەڕاست) ئەمەش دەکرێت ببێتە نیشانەیەکی ئاگاداربوونی نالی لە شێوەی قسەکردن و ئاخاوتنی خەڵکی باڵەکەتی، وەک دەڵێت:

بە نەشئەی سستیی و مەستیی وەهـا مەستوور و مەخموورە

نزانم خەو لە چاوتدایە یا چاوت لە خەودایە! (دیوان: ل٥٥٧)

**ئەنجام**

بەپێی سەرچاوەکان مەلا و شاعیرانی ناوداری وەکوو (نالی، مەولانا خالید، حاجی قادر و عەبدوڵڵای جەلیزادە) لە وەختێکی جودای سەرەتا و ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە لە میانی گەشتی خوێندنی فەقێیەتی هاتوونەتە حوجرە و مەدرەسەکانی وڵاتی باڵەکەتی، لە دێیەکانی شێخوەتمان و گرتک و ڕوست، لەکن مەلا و زانایانی بەناوبانگی وەکوو مەلا موحەممەدی کاک عەبدوڵڵا و ئیبنوئادەم، زانستە شەرعییەکانی بەدەستهێنانی ئیجازەی مەلایەتییان خوێندووە. بەگوێرەی ئەو وەسفانەی لە شیعرەکەی (ئـەم حوجرە کون تێیە) ی نالیدا هاتوون و بە لێکدانەوەی زانیاریی دیکەی مێژوویی، زۆر ڕێی تێدەچێت مەبەستی نالی یەکێک لە حوجرەکانی باڵەکەتی و حوجرەکەی شێخوەتمان بووبێت.

**پەراوێزەکان:**

**• سەرنج و ڕوونکردنەوە:**

لەم گوتارەدا واژەی (باڵەکەتی) بۆ ناوهێنانی دەڤەری (باڵەک) لەباتی باڵەکایەتی بەکارهاتووە، لەبەر چەند

هۆیەک:

- لە سەردەمی پێشوودا لەلایەن خەڵکی ڕەسەن و کەسانی بەساڵاچووی ناوچەکە هەر واژەی (باڵەکەتی) بەکارهێنراوە، بۆ نموونە کەسایەتییەکی وەکوو باپیرم (خدر ئەحمەد مەحموود) ١٩٠٤-١٩٩٢ هەتا لە ژیاندا بوو، لەناو قسە و باسی مەجلیسی میوانەکانیدا، یان لە دانیشتنەکانی خۆبەخۆ لەگەڵ خزماندا، هەر کاتێک باسی بابەتێک کرابێت پەیوەندی هەبووبێت بە عەشیرەتی (باڵەک) و سنووره جوگرافییەکەیەوە، هەمیشە دەیگوت (باڵەکەتی) و هەر ئەوەم لە باپیرم و میوانەکانی گوێلێبووە، نەوەک (باڵەکایەتی).

- نووسەرێکی وەکوو مامۆستا (مەسعوود محەمەد) لە هەر سێ بەشی کتێبەکەیدا (حاجی قادری کۆیی) لە دەیان جێگەدا پتر (باڵەکەتی) نووسیوە و بەکارهێناوە. بۆ ئەمە بڕوانە: بەشی یەکەم لاپەڕەکانی: ٣٣، ٧٦، ١٠٠، ١٠١، ١١٠، ١١٢، ١٢٤، ١٢٨، ١٦٢، ١٩٣، ١٩٤، بۆ نموونە لە پەراوێزی لاپەڕە ٧٨ی بەشی دووەمدا نووسەر دەڵێ: (لە هاوینی ١٩٧٢دا دوای (کۆڕی شەقڵاوە) کە بۆ لێکۆڵینەوە لە گیروگرفتی کتێبەکانی قوتابخانەی کوردی بەسترا، سەردانێکی باڵەکەتیم کرد، لە گەلاڵە چوومە دیدەنیی جەنابی مەلا وەیسی کە لە نەوەی ئیبنوئادەمە و پێشتریش بە نامە و ڕاسپاردە لە یەکتر خەبەردار بووین،...).

- د. مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، ب ١، ل ٧٥-٨٠.

- دیوانی نالی، ل ٢٤.

- لەبارەی (مەلا محەمەدی کاک عەبدوڵڵا)وە، بڕوانە: مەلا طاهیر مەلا عبدالله بەحرکەیی، مێژووی زانایانی کورد، بەرگی سێیەم، ل ١٥٦-١٥٧.

- لەبارەی (ئیبنوئادەم)ەوە، بڕوانە: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، یادی مەردان، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، ل ١٦-٢٠.

- هەر سەبارەت بەو نووسراوەی بنەماڵەی شێخوەتمانیان، کە دانەری کتێب (مەلا طاهیر مەلا عبدالله بەحرکەیی) لە کتێبەکەیدا (مێژووی زانایانی کورد، بەرگی یەکەم) پشتی پێبەستووە و ئاماژەی بەوە داوە و دەڵێت: (حاجی مەلا محەممەدی حاجی عبدالرحمان بۆی هێنام)، ئەمە و بۆ بەدەستهێنانی زانیاری پتر لەبارەی ئەو نووسراوەوە، بەرواری ٢٤ی شوباتی ٢٠٢٣ چوومە سەردانی بەڕێز مامۆستا (حاجی مەلا محەممەدی حاجی عبدالرحمان) شێخوەتمانی، لەدوای نوێژی عەسر هەر لە مزگەوتەکەی خۆی لە پیرزین، پرسیاری ئەوەم لێ کرد ئاخۆ ئەم زانیارییەی ئەوان بەشێوەی دەستنووس، یانیش بە زارەکیی و دەماودەم ماوەتەوە؟ پاش قسە و گفتوگۆ لەگەڵ بەڕێزیان، ئەو دووپاتی کردەوە، کە ئەم باسەی (خوێندنی نالی لە حوجرەی شێخوەتمان و بەسەرهاتەکەی لەوێدا)، بەشێوەی زارەکیی و دەماودەم بەوان گەیشتووە و ماوەتەوە.

- بۆ زانیاری لەبارەی بەسەرهاتەکە، بڕوانە: مەلا طاهیر مەلا عبدالله بەحرکەیی، مێژووی زانایانی کورد، بەرگی یەکەم، ل ٣٣٦-٣٣٧.




- وەک بڵێی شەم و شۆخ و شەنگەکانی دی ئەو دەڤەرە، کاریان کردۆتە سەر هۆش و هەستی ناسکی گەلێک لە فەقێیە شاعیرەکانی دی وەکوو نالی، ئەوەتا عەبدوڵڵای جەلیزادەش داستانێکی ئەویندداری قووڵیی لەگەڵ حەلیمەی شێخوەتماندا هەبووە. لەبارەی ئەوینداریی جەلیزادە و حەلیمە، بڕوانە: د. کەمال مەعروف، سەرجەم بەرهەمەکانی حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە، چاپی یەکەم، ٢٠١٣، ل ٣٣-٣٨.

- بڕوانە: مەسعوود محەمەد، حاجی قادری کۆیی، بەشی دووەم، چاپی دووەم، ئاراس، ٢٠١٠، ل ٢٠٧-٢٠٨.

- جێی سەرنجە گەلێک وشەی لێکچوو و هاوبەش تێبینی دەکرێن لە نێوان شێوە ئاخاوتنی باڵەکەتی و

شێوەزاری موکریان، ڕەنگە ئەم دیاردەیە جگە لەلایەنی جوگرفییەوە، پەیوەندیی توندی هەبێت بەو ڕووداوە مێژووییەی کۆچکردنەکەوە.

- گوایە ئیبنوئادەم هەموو جار بە مەولانای گوتووە: (خالید تۆ فەقێیەکی تێگەیشتوویت و ئەبێ بە مەلایەکی چاک)، بۆ زانیاری پتر، بڕوانە: مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، یادی مەردان، ل ٢٠.

- دیوانی حاجی قادری کۆیی، ل ٢١.

- حاجی قادر لەو نامە شیعرییەی لە (ئەستەمبوڵ)ەوە، بۆ (حاجی مەلا عەبدوڵڵا)ی هاوڕێی خوێندنی (باڵەکەتی) نووسیوە، باسی یادەکانی عەیش و ئەییامی جەوانییان لەو ناوچەیە دەکات و سەرەتاکەی بە نیوە دێڕی (لە جوملەی ماجەرای دووری ویلایەت) دەست پێدەکات و دەڵێت:

بە فیکرت دێ زەمانی چووینە (باڵەک)

بە پێ خاوسی نە کەوشم بوو نە کاڵەک (دیوان، ل ٢٤٤)

- بەمدواییانە لەلایەن توێژەرانەوە باس لە هەبوونی پەیوەندی خزمایەتی نێوان مەولانا و نالی و حاجی قادر لەلایەک و پەیوەندی خزمایەتی هەرسێکیان لەگەڵ بنەماڵەی (خادم السجاد)ەوە دەکرێت، دەگوترێت گوایە ئەم سێکوچکەیە (مەولانا، نالی، حاجی) هەم شاگرد و فەقێی مەلا سەعید بوون (لە وەختی جیاوازدا)، هەم پێوەندی خزمایەتی لەنێوانیاندا هەبووە. بۆ زانیاری لەمبارەیەوە، بڕوانە: بابەتێکی گۆڤاری ڕامان، لە دوو بەشی ژمارەکانی ٣١٢ و ٣١٣، مانگەکانی ١٠و١١ی ساڵی ٢٠٢٣.

- دیوانی نالی، پەراوێزی ل ٣٥٥ و ٣٥٦.

- مەسعوود محەمەد، دەستەودامانی نالی، چاپی سێیەم، ئاراس، ٢٠١٠، ل ١٤٠.

- هەمان سەرچاوە، ل ٣٧ و ٦٠.

- هەمان سەرچاوە، ل ٦١.

- بۆ نموونە شاعیر مستەفا بەگی کوردی ١٨١٢-١٨٥٠ز لە دێڕێکدا ئەم تەعبیری (جەڕڕاح و طەبیب)ەی بەکارهێناوە و دەڵێت:

ئومێدی زیندەگیم ناوە بە لاوە

کە قاتڵ بوو بە جەڕڕاح و تەبیبم (دیوان، ب ١، ل ٣٠٧)

**سەرچاوەکان:**


١- دیوانی نالی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی: مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتح عبدالکریم، چاپی سێیەم، پیاچونەوەی محمدی مەلاکریم، انتشارات کردستان، ١٣٨٣.

٢- دیوانی حاجی قادری کۆیی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی: سەردار حەمید میران و کەریم موستەفا شارەزا، چاپی دووەم، انتشارات کردستان، ١٣٩١.

٣- دیوانی کوردی، لێکۆڵینەوەی: محەمەد مستەفا - حەمەبۆر، بەرگی یەکەم، چاپی یەکەم، ئاراس، ٢٠١٠.

٤- د. کەمال مەعروف، سەرجەم بەرهەمەکانی حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە، چاپی یەکەم، نووسینگەی تەفسیر، ٢٠١٣.

٥- د. مارف خەزنەدار، مێژووی ئەدەبی کوردی، بەرگی یەکەم، دووەم، سێیەم، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، ٢٠١٠.

٦- محەمەدی مەلاکریم، نالی لە کلاورۆژنەی شیعرەکانییەوە، چاپخانەی ئەکادیمیای عێراق، بەغدا، ١٩٧٩.

٧- مەسعوود محەمەد، حاجی قادری کۆیی، بەشی یەکەم، دووەم، سێیەم، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠١٠.

٨- مەسعوود محەمەد، دەستەودامانی نالی، چاپی سێیەم، دەزگای ئاراس، هەولێر، ساڵی ٢٠١٠.

٩- مەلا طاهیر مەلا عبداللە بەحرکەیی، مێژووی زانایانی کورد، بەرگی یەکەم، دووەم، سێیەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی ئاراس، ٢٠١٠.

١٠- مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، یادی مەردان، بەرگی یەکەم، چاپی دووەم، ئاراس، ٢٠١١.


* ماستەر لە زمان و ئەدەبی کوردی

# دەمێک لەگەڵ مارف خەزنەدار

یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی چیرۆکی ریالیستی ئەوەیە، کە بە خوێندنەوەی دۆخی ئەو سەردەمەی وا چیرۆکەکە دەربارەی دەدوێ، تا رادەیەکی باش راستەوخۆ دێتە بەرچاوت. لانیکەم لە هەندێک بواردا، لەو بوارەدا وا چیرۆکەکە پێیەوە سەرقاڵە. ئەدەبی ریالیستی بە جوانترین شێوە دۆخە کۆمەڵایەتی، ئابوری و چینایەتییەکان دەنوێنێتەوە، جگە لەمە لە باری دەروونیشەوە بە گوێرەی پێویست لەگەڵ مرۆڤی سەردەمی خۆی ئاشنامان دەکا.

بە گشتی، ئەدەبی ریالستی زیاتر لە فۆرمەکانی دی لەگەڵ توخمی ‹ناسین› پێوەندی بەرقەراردەکا. لە راستیدا جوانناسیی ریالیزم شان بە شانی ئەم تایبەتمەندییە رێدەکا و خۆی لێ جیاناکاتەوە. ئەدەبی ریالیزم، ئەدەبی پێوەندی نێوان جوانناسی و واقیعی دەورووبەرە.

کۆمەڵە چیرۆکی ‹بەرەو رۆژ› لە نووسینی زیندەیاد دکتور مارف خەزنەداریش لەم تایبەتمەندییە بێ بەری نییە. زۆربەی چیرۆکەکان بە جوانی ئاوێنەی کێشە کۆمەڵایەتی، چینایەتی و دەروونییەکانی مرۆڤی کورد لە دواقۆناغەکانی رژێمی پاشایەتی لە عێراق و بەو پێیە لە هەرێمی کوردستانن و وەک ئاوێنەیەکی باڵانمای ئەو سەردەمە خۆیان دەنوێننەوە. دیارە بە رەچاوکردنی ئەوەش کە چیرۆکێک لەم کۆمەڵەیەدا باس لە رووداوێک لە یەکیەتی سۆڤیەت دەکا. دیارە دەبێ بێ لەسەر ئەوە دابگرین، کە لەم کۆمەڵەچیرۆکەدا جیاوازییە چینایەتییەکان بەجوانی دەربڕی جۆری جیهانبینیی نووسەرن سەبارەت بە ژیان.

مارف، کە لە بواری ئایدیۆلۆژیادا چەپە و هاوکات لەم روانگەیەوە باوەڕی بە چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی کوردیشە، بەهۆی هەڵوێستی ئایدیۆلۆژیی خۆیەوە، تۆختر لە چیرۆکەکانیدا دەردەکەوێ، لە راستیدا لە زۆربەی داستانەکاندا ئەم مەیلە دەبینینەوە. واتە زۆر جار مارف تەنیا پیشان نادا، بەڵکو شێدەکاتەوە و هەڵوێست دەگرێ، بەجۆرێک هەست دەکەین، کە لەپاڵ قارەمانی سەرەکیی چیرۆکەکانیدا، کە کەسانی هەژار و زوڵم لێکراون راوەستاوە. دەقەکان زۆربەی کات لەم بارەیەوە بێ هەڵوێستکی راستەوخۆ نین. دەبێ بڵێین دەقی ئەدەبیی پێش هەر شتێک، دەقی ئەدەبییە، هەموو هەڵوێستە ئایدیۆلۆژییەکانی نووسەر دەبێ لەبن لایەنییەکی شاراوەوە خۆیان لە دەقدا بنوێننەوە. لە راستیدا لە رێگەی کاریگەرییە جوانناسییەکانی خۆیانەوە ئەو ئێزنە بە خوێنەر بدەن، کە خۆی رێگەی خۆی بدۆزێتەوە. ئەوەیە کە داخۆ خوێنەر دەیەوێ چۆن تەعبیر لە گشتییەتی چیرۆکەکە بکات. ریالیزم لەگەڵ ئەوەی بە توندی پابەندی کێشە کۆمەڵایەتی و چینایەتییەکانە، بەڵام هاوکات بە شێوەیەکی بێلایەنانە پێوەندیان لەگەڵ بەرقەراردەکا. ئەمە زاتی هونەرە.

وەک دەگوترێ، بە گشتی نووسین لەسەر کۆمەڵەچیرۆک دژوارە. بۆیە من لێرەدا چیرۆکی ‹چاوەڕووانی›م لە لاپەڕەی ١٤٥ هەڵبژاردووە و، هەوڵدەدەم لێرەدا کەمێک دەربارەی بدوێم.

**پلۆتی چیرۆکەکە:**

ـ باس لە مەلایەک و ژنەکەی دەکا. مەلاعەلی کۆلکە مەلایە و خاوەن مزگەوت و میحراب نییە. ئەو مردەشۆری هەژارانە. شەوێکی تاریک لەماڵەوە دانیشتووە و خەمی سبەیەتی. سبەی جومعەیە و بارانێکی زۆریش چەند رۆژێکە خەریکە دەبارێ، بۆیە خەمی ئەوەی لێدەنیشێ، کە تەنانەت رۆژی جومعەیش نەتوانێ بچێ بۆ گۆرستان و تیکە نانێکی دەستکەوێ. ژنەکەی لای وایە بە هۆی بارانەوە تەنانەت خاوەن مردوویش ناچن بۆ گۆرستان. مەلاعەلی دژی ئەم باوەڕەیە. لەڕاستیدا ماوەیەکە کەس نامرێ و مەلا خەم


فەرزاد نیعمەتپوور

لەبێ ئیشی خۆی دەخوا. هاوکات نیگەرانیشە، کە بەهۆی باران و هەورەگرمەوە ئەگەر خاوەن مردوویەک شەو لە درگایان بدا گوێی لێ نەبێت، بەم شێوەیە نانبڕاو بێت.

لەنێو جێگا دایە ژنەکەی خەبەری پێدەدا، کە حاجی عەولا (کە پیاوێکی دەوڵەمەندە) نەخۆشە و ڕەنگە بمرێ. مەلا لە وەڵامدا دەڵێ: بە ئێمە چی. ئەمەیش لەبەر ئەوەی حاجی دەوڵەمەندە و مەلا دەزانێ، کە بۆ ناشتنەکەی ڕوو ناکەنە کۆلکە مەلایەکی وەک ئەو. کتوپڕ پاش نیوەشەو لە دەرگا دەدەن! کەسوکاری حاجین، کە هاتوون بە شوێن مەلا عەلی دا. مەلا کە حەپەساوە، سەرئەنجام بۆ یاسین خوێندنی سەر تەرمی حاجی، لەگەڵیان دەڕوا. مەلا عەلی، کە لای وایە خوا دەرووی ڕەحمەتی لێکردووەتەوە و ئیدی لەمە بەولا تەنیا مەلای ڕەش و ڕووتەکان نابێ، زۆر خێرا خەونەکەی بەتاڵ دەبێتەوە. ئەوەندەی پێناچێ مەلای مزگەوت خۆی بە ژوورەوەدا دەکا، ئیدی ئەرکی ئەو لێرەدا کۆتایی پێدێ، لە کۆتاییدا یەکێک لە خاوەن مردووەکان دوو پەنجایی دەخاتە مشتییەوە.

### سەبارەت بە ڕووداوی نێو چیرۆکەکە:

- لەڕاستیدا هۆکاری ڕووکردن لە مەلا عەلی، درەنگیی شەو و باران بارینی چەند ڕۆژەیە. خاوەن مردوو، کە لە چینی باڵادەستە، دەزانن کە دەستخستنی مەلای مزگەوت بەو نیوەشەوە ئاسان نییە، بۆیە ڕوو لە مەلا عەلی دەکەن. ئەوان مەلا عەلیان دەوێ، تەنیا تا ئەوکاتەی مەلای مزگەوت پەیدادەبێ. وەک بڵێی جێهێشتنی تەرمی مردوو بەبێ یاسین خوێندن گوناحە. لێرەدا هیوایەتێک لە دڵی مەلاعەلی دەگەڕێ بۆ ئەوەی ئەمە وەک سەرەتایەک لێک بداتەوە، بۆ ئەوەی بتوانێ خۆی لە نێو چینی دەوڵەمەندیشدا بدۆزێتەوە و ببێ بە مەلای ئەوانیش. لە ڕاستیدا دۆخێکی خراپی کەش و هەوایی و مردنێکی ناوەخت، ئومێدێک لە دڵی ئەودا دەخولقێنێ، بەڵام هەر بەو خێراییەیش لەنێوی دەباتەوە!

### لە دریژەی ناوەڕۆکدا:

- لە دونیای چینایەتیدا تەنانەت شتە موقەدەسەکانیش لێی بێبەری نین و، ئەوانیش سەرەڕای هەموو موقەدەسبوونیان تایبەتمەندیی چینایەتی وەردەگرن. لەنێو مەلاکانیش، وەکوو هەموو توێژە کۆمەڵایەتییەکانی دی، وەهایە کە یەک وەزعی باشە و مەلای دەوڵەمەندەکانە و یەکی دیکە هەژارە و کۆلکە مەلایە و مەلای خەڵکی فەقیر و بێ دەرەتانە. یەک خاوەن مزگەوتە و یەک بێ مزگەوت.

### تەکنیک لە چیرۆکەکەدا:

- گێڕەرەوە سێهەم کەسی تاکە، بەم پێیە زانای گشتییە.
- لە وەسفی نێوماڵ و ڕووخسار و ڕواڵەتی کاراکتێرەکان خەبەرێکی ئەوتۆ نییە. نووسەر خۆی لەمە دەبوێرێ.
- تەنیا وەسفێک، کە دەبینرێ، وەسفی کەشوهەوای ئەو شەوەیە، کە باراناوییە.
- بەم پێیە چیرۆکەکە کردە - بابەتە. واتە زیاتر لەسەر کردە و ڕووداو پێ داگیراوە.
- گرێی (بێ مردوویی) بە مردنی حاجی عەولا دەگاتە ترۆپک و هاوکات بە بانگهێشتنی مەلا عەلی دەکرێتەوە، بەڵام کردنەوەکەی لە ڕاستیدا هیچ دەستکەوتێکی بۆ مەلا عەلی تیا نییە.
- لە کۆتاییدا مەلای هەژار هەروا هەژار دەمێنێتەوە، مەلای دەوڵەمەندیش، دەوڵەمەند. لە ڕاستیدا قەدەرێکی چارەنووسیانە بەسەر چیرۆکەکەدا زاڵە و جێگەی بۆ هیچ گۆڕان و بزاوتێک نەهێشتووەتەوە.

### پەیام:

- لە کۆمەڵگەی چینایەتیدا دیاردە موقەدەسەکانیش بەچینایەتی دەبن. دەوڵەمەند خاوەن مەلای خۆی و هەژار خاوەن مەلای خۆی.

### دواوتە:

چیرۆکی (چاوەڕوانی) یەکێک لە باشترین چیرۆکەکانی ناو کۆمەڵەچیرۆکی (بەرەوڕۆژ)ە کە تێیدا دەخالەتی ئایدیۆلۆژیی نووسەر لە دەقەکەدا نییە، بۆیە ستاتیکای دەق دەگاتە ترۆپکی خۆی.

مارف خەزنەدار لەم چیرۆکەدا نیشانی دەدا، کە وەک زۆربەی چیرۆکنووسە ڕیالیستەکانی کورد لە کاتی نووسینی چیرۆکدا بە هەموو توخمەکانی ئەم فۆرمە ئەدەبییە پابەند نینە، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی، کە دەقەکان لە گشتییەتی خۆیاندا لەو خۆکاملییەی بەهرەمەند نەبن، کە دەبێ ببن. بابەتی نێو چیرۆکی (چاوەڕووانی) بابەتێکی جوان و سەرنجڕاکێشە، بریا نووسەر بە خەملاندنی زیاتری تەکنیک مەودای زیاتری بۆ دەربڕینی جوانناسیانە بکردایەتەوە.

# پەیمانی ئەلەست لە شیعری کوردیدا

وشـەی (ئـەلـەست) وشـەیـەکی عـەرەبییـە، لە شێوازی نەرێیدا دارێژراوە، ئەویش لە قورئانی پیرۆز و سوورەتی (الاعـراف) ئایەتی (١٧٢)دا هاتووە، خوای گـەورە دەفەرموێت: (وإذ أخذ ربک من بني آدم من ظهورهم ذريتهم وأشهدهم على أنفسهم ألست بربكم قالوا بلى شهدنا أن تقولوا يوم القيامة إنا كنا عن هذا غافلين)

واتە (کاتێک پەروەردگارت وەریگرت لە پشتی وەچـە و نـەوەکـانـی ئـادەمــەوە و کـردنـی بە گەواهیدەر بەسەر خۆیانەوە پێی فەرموون: ئایا پەروەردگارتان نیم؟ گوتیان: بەڵێ گەواهیماندا، نـەوەکـوو لە ڕۆژی دواییدا بڵێن ئێمە لەمەدا بێئاگا بووین) ئەو ئایەتەش باسوخواسی ئەو وتووێژ و پرسیار و وەڵامەیە، کە خوای گەورە هـەر لە سـەرەتـای بەدیهێنان و دروستکردنی جیهانی گیانـەکی تێکڕای مـرۆڤـەکـان، وەک بەڵێن و پەیمانێک لەگەڵیاندا بەستوویەتی؛ پێی گوتوون: ئایا من پەروەردگارتان نیم؟ ئەوانیش لە وەڵامدا گووتویانە: بەڵێ تۆ پەروەردگارمانی و شاهێدی دەدەین بەسەر خۆماندا. بۆیە هەموو مرۆڤایەتی بە (بەلا) واتە (بەڵێ) وەڵامی داوەتەوە، ڕەزامەندیی خۆی پیشانداوە بە پەروەردگارییەتی خوای گەورە بەسەر ژیانی خۆیاندا.

ئەو ڕووداوە و ئایەتە پیرۆزەش لای زۆربەی شـاعـیـران، بـەتـایـبـەتی شـاعـیـرانی کلاسیک کاریگەریی هەبووە و بووەتە جێگەی باس و لێهەڵهێنجانی وێنەی شیعریی سەرنجڕاکێش.

ئەم وێنە شیعرییەش (الست بربکم) (قالوا بلی) بووەتە دەروازەیەک بۆ چوونە نێو جیهانی فراوانی عیرفان و تەسەووفی سێخناخ بە کەفوکوڵی عیشقی خودایی و بارگاوی بە هەستوسۆزی قووڵ. هەندێک جار شاعیران بە (بادەی ئەلەست) یان (جامی ئەلەست) بەکاریانهێناوە، هەندێکی دیکە بە (پەیمانی ئەلەست) لە شیعرەکانیاندا تەوزیفیان کردووە، بە واتا و گوزارشتگەلێکی عیشق ناودێریان کردووە، چەندین واتا و خوازە و درکە و لێکچواندنیان لێ چنیوەتەوە. ئێمە لەم باسەدا نموونەی چەند شاعیرێک باس دەکەین و وێنە شیعرییەکانیان دەخەینەڕوو، تاکوو بزانین هەر شاعیرە و چۆن مامەڵەی لەگەڵ ئەو ڕووداوە کردووە و چۆن لەمیانەی وشە و دێڕە جوان و دڵگیرەکانیانەوە دەریانبڕیوە، واتای قووڵ و سیمبوڵی شاراوە و مەغزای وردیان دارشتووە، وردەکاریی و لێزانییەکی تێروتەسەلیان تێیدا کردووە. شاعیر هەیە یەک جار وشەی (ئەلەست)ی بەکارهێناوە، شاعیری دیکە هەیە چەند جارێک بەکاریهێناوە.

لێرەدا ئێمە بۆ هەر شاعیرێک تەنیا یەک وێنەی شیعریی دێنینەوە:

**مەلا پەرێشان:**

***ژ گوفتەی ڕاسان شنەفتم نەوید***
***کوشتەی عیشق ئەو شەهیدەن شەهید***
***تو کە دەسرەسی بوینی وە چەم***
***بێ سەر و سەردار نە سەحرای ستەم***
***سەران وە نێزەی ئەعدا بێ بەدەن***
***تەنان نە سەحرای میحەن بێ کەفەن***
***ژ خون وێشان ڕەنگین پاو دەست***
***خـەزمـاب مـەنـمـوش ژ بـادەی ئـەلـەست***

واتە: ئەو موژدەیەم لە پیاوانی ڕاستگۆ بیستووە،



سەرتیپ ئاغا واحد بەگ

کوژراوانی عیشق (حوسێن و یاران)ی کە شەهیدن. تۆ کە نەتتوانیوە بە چاو دیمەن و ڕووداوەکە ببینیت؛ کاتێک بیابانی ستەم و زۆرداری (کەربەلا) بێ گەورە و سەروەر مایەوە، سەری بێ لاشەی یاران بە نیزە و چەقۆی دوژمنانەوە بوو، جەستەیان لە بیابانی ئازار و مەینەتییدا بێ کفن مایەوە؛ بە خوێنی خۆیان دەستوپێیان ڕەنگین کرد لە (خەنە) گرت، بە بادەی (الست) سەرمەست و مەدهۆش بوون.

**ئەحمەدی خانی:**

***ئەم عاشق ئەگەر چ مەی پەرەستن***

***اما ژ مەیا الستی مەستن***

***ئەو مەی نە وەکی مەیا تە ئالە***

***ئەو مەی ژ جەمالێ ذوالجلالە***

**فەقێ تەیران:**

**ئانینە دیوانا مەزن، فەرمان تە کر، وان دا ختاب**

**ژێ کر سوئال لەفزا ئەلەست، قەد یەک نەبوو جوزئەک د دەست**

**مەولەوی:**

**خۆ من هەر جە زوو وە مەیلت مەستم**

**هەر جان فیداکەی ڕۆکەی ئەلەستم**

واتە: خۆ من هەر لە کۆنەوە سەرخۆش و سەرمەستی ئەوینی تۆم، هەر لە ئەزەلیشەوە قوربانی و گیانفیدایی تۆم.

**وەلی دێوانە:**

**شەرتە هەتاکوو ڕۆژەکەی ئەلەست**

**من دوعاگۆی تۆم شۆخی دیدە مەست**

**بێخود:**

**هێندە بێ ڕەحمن ئەڵێی ئاسنگەری ڕۆژی (الست)**

**دەرحەقی من لەوحی دڵتانی لە ئاسن کردووە**

واتە: لە بەرانبەر مندا بۆ هێندە بێبەزەیی و دڵڕەق خۆت دەنوێنی، خۆ دڵت لەوحەکەی لە ئاسن دروست نەکراوە؛ کەچی من هەر لە ڕۆژی بەستنی پەیمانی ئەلەست لە دوای تۆم و نازت هەڵدەگرم، بەڵام دڵەکەی تۆ هەمیشە توندتر دەبێ.

**حەریق:**

**بۆچ هەر ئەمن مەخموری بادەی مەستم**

**یا هەر من سەرمەست جامی ئەلەستم**

واتە: بۆ سەیر و نامۆیە من مەست و سەرخۆشی ئەو بادەیە و مەیە بم؟ یان هەر بەتەنیا من سەرمەستی ئەو بەڵێن و پەیمانەم بە خودامدا کە لە جامی ئەلەست نۆشیم. بۆیە من لەسەر وادە و بەڵێنی خۆمم و نەگۆڕاوم.

**ئەحمەدی کۆر:**

**بەو ڕاکیبی بوراق بە دەست، بەو شەهسەواری دیدە مەست**

**بەو شاهیدی ڕۆژی ئەلەست، صاحەب وەفا، عەهد و میساق**

حاجی قادری کۆیی:

**ساقی کەریمە بادەیی بەزمی (الست)ییە**

**(حاجی) لە جامی قەلبی شکاوە شیکایەتی**

**فەنایی:**

**سیپڕی مولکی ماسیوایە نیکتەکەی عەهدی ئەلەست**

**بەسیە بۆ وەسفی لە عالەم مەرتەبەی «لولا «یە ئەو**

**حەمدی:**

**قەت لە باسی عەشقەوە (حەمدی) لە دڵ تەعنە مەدە**

**ڕوحە ئەم تەوقەی لە مل کرد ڕۆژەکەی قالوبەلا**

**صافی هیرانی:**

**(اثبات)ی وجوودی تووە ئەرواحی فەریقەین**

**تەصدیقی (الست) ع (نعم) بێ ع (بلی) بێ وەفایی**

**دیسان لەسەر عەهدی ئەلەست، جامێ لە جانان بگرە دەست**

**هەر تا ئەبەد مەخموور و مەست، هذا طریق العاشقین**

واتە: بۆ جارێکی دیکە و دووبارە وەرە لەسەر پەیمان و بەڵێنی ئەلەستوی خودایی، جامێ لە یار وەربگرە و بینۆشە، جا تاهەتایە سەرمەست و خومار دەبیت، ئاوایە ڕێگای ئەوینداران و عاشقان.

**قانع**

**لە بیرم دێ ئەیا واعیز (نعم) بووی ڕۆژی ئیستیفهام**

**منم (قالوا بلی) وێرد و کەچی تۆ پێم ئەڵێی باتڵ**

**خادیم**

**لە نەشئەی مەی بوو عاشیق شاهدی عەهدی (الست)ی دی**

**وجوودی ئاو و خاکی خۆی ئەگەر سەهبا نەکا چ بکا؟**

**ئەکرەم عەنەبی:**

**من لە ڕۆحی خۆم بێئاگام**

**نازانم ئەو لە (الست)ەوە**

**چ پەیمانێکی بەستووە**

**یان بە ڕیا**

**چ درۆیەکی کردووە**

**سەرچاوە:**


١. التفسير الكبير او مفاتيح الغيب، اللامام فخرالدين الرازي، المجلد الثامن، دار الكتب العلمية, الطبعة٤, بيروت .

٢. دیوانی مەلا پەرێشان، شاعیری سەدەی چـــوارده، کـۆکـردنـەوە و ئـامـادەکـردن و ساغکردنەوەی، ڕێبوار حەمە تۆفیق

٣. دیوانی حەریق، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوە، نەوزاد کەلهور، نووسینگەی تەفسیر.

٤. دیوان و شەرحی حاڵی شێخ ئەحمەدی کۆر (موکریانی) ساغکردنەوە و ڕێکوپێکی و هێنانە سەر ڕێنوسی کوردی، چێکردنی فەرهەنگۆکە، عەزیز محەمەد پور (داشبەندێ)ەوە، لەگەڵ پێداچوونەوەی مامۆستا هەژار، ٢٠٠٠

٥. دیوانی وەلی دێوانە، سۆرانی و هەورامی، وەرگێڕاوی ڕازی.

٦. دیوانا ئەحمەدێ خانی، بەرهەڤکرن، تەحسین ئیبراهیم دۆسکی، ٢٠١٦

٧. ناڵەی دڵ، مامۆستا مەلا عبداللەی کاتب فەنایی، ئامادەکردنی، عابد بابان، ٢٠١٤

٨. دیوانی حەمدی، ساغکردنەوە و ڕێکخستن و چاپکردنی، عەبدەڵڵا خدر مەولوود، چاپی چوارەم ٢٠١٠

٩. دیوانی مەولەوی، کۆکردنەوە، لێکۆڵینەوە و لەسەر نووسینی، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، چاپی دووەم

١٠ - دیوانی صافی هیرانی، لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەی محەمەدی مەلا مستەفا هیرانی، چاپی دووەم، ٢٠١٥

١١. دیوانی وەفایی، لێکۆڵینەوە، لێکدانەوە و لەسەر نووسینی، موحومەد سەعید هجاری (ئاسۆ)

١٢. دیوانی حاجی قادری کۆیی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی، سەردار حەمید میران و کەریم مستەفا شارەزا

١٣. دیوانی قانع، شاعیری چەوساوەکانی کوردستان، کۆکردنەوەی بورهان قانع، ٢٠١٤

١٤. دیوانی خادیم، حاجی میرزا عەبدوڵڵا کۆیی، بەرگی یەکەم، ١٩٨٠

١٥. دیوانی بێخود، کۆکردنەوە و ڕێکخستن و لەسەر نووسینی، موحەمەدی مەلا عەبولکەریم

١٦. دیوانا فەقێ تەیران، پرتایەکێ، سەعید دێرەشی - پێزانی ئایخان

١٧. ئیلاهینامە، ئەکرەم عەنەبی

چیرۆک

# دە چیرۆکی زۆر کورتی پاولۆ کۆیللۆ

و: تامیر عوسمان

١

قوتابییەک لە مامۆستاکەی نزیک بووەوو پێگوت: چەندین ساڵە من بە دوای ڕۆشنگەریدا دەگەڕێم، هەست دەکەم خەریکە پێی بگەم، ئێستەش زۆر عەودالی قوناغی داهاتووم، مامۆستا پێی گوت: چۆن بەڕێوە ببەم؟ خوێندکارەکە وەڵامی دایەوە: هێشتە فێرنەبووم خۆم بەڕێوە ببەم، دایک وباوکم پارمە تیم دەدەن، بەلام ئەمانە تەنیا ڕوون کردنەوەیە.

مامۆستا گوتی: هەنگاوی داهاتوو وات لێ دەخوازێ بۆماوەی نیو خولەک ڕاستەوخۆ سەیری خۆر بکەی، ئەودەمە قوتابییەکە داواکاریکەی مامۆستای بەجێ هێنا و دوای تێپەڕبوونی نیو خولەکەکە، مامۆستا داوای لێکرد وەسفی ئەو کێلگەیە بکات، کە دەوری داون، قوتابییەکە گوتی: ناتوانم ببینم خۆر زۆر کاریگەریی لە چاوەکانم کردوە، مامۆستا گوتی: ئەو پیاوەی تەنیا بە دوای ڕووناکیدا بگەڕێ، ئەوەی خۆر لە لێپرسراویەتەکانی دۆزیوەتەوە هەرگیز ڕۆشنگەریی نابینێ، ئەوەی چاوەکانیشی تەرکیز لەسەر خۆر بکات، چارەنووسی بەوە دەگات ببێتە کەسێکی کوێر.

٢

قوتابییەک بە مامۆستاکەی گوت: بە درێژایی ئەم ڕۆژە بیرم لە شتانێک کردووتەوە پێویست ناکات بیریان لێ بکەمەوە، شتگەلێک دەکەم حەز ناکەم بیانکەم، پاشان مامۆستا داوای لە قوتابییەکە کرد بەیەکەوە پیاسەیەک بە دارستانەکەی پشت خانووەکەی بکەن، لە ڕێگایاندا مامۆستا ئاماژەی بۆ نامەیەک کرد و لە قوتابییەکەی پرسی: ئایا دەزانی ناوی چییە؟ قوتابییەکە گوتی: ناوی بیل دونایە، پاشان گوتی ئەو نەمامە لە وانەیە ئەو کەسە بکوژێ کە گەڵاکانی بخوا.

مامۆستا گوتی: بەڵام ناتوانێ ئەوکەسە بکوژێ، کە بەسادەیی تێبینی بکا، هەمان شتە، ئارەزووە نەرێنیەکان ناتوانن هیچ زیانێک بە مرۆڤ بگەیەنن، ئەگەر ملکەچی فریودانەکانی نەبی.

٣

نەخۆشێک تەمەن سی و دوو ساڵە سەردانی ڕێتشاردکراولی پزیشکی کرد، بە سکالاوە بە پزیشکەکەی گوت: ناتوانم واز لە مژینی پەنجەی گەورەم بهێنم، کراولی گوتی: بۆ ئەمە نیگەران مەبە، بەلام هەوڵبدە هەر ڕۆژەی پەنجەیەکی جیاواز بمژێت، نەخۆشەکە هەوڵیدا ئەوە بکات، کە پزیشکەکە فەرمانی پێ کردبوو، بەلام هەرجارەی دەیویست دەستی بخاتە دەمییەوە دەبوو بە هوشیارییەوە بڕیار بدات ئەمڕۆ نۆرەی کامە پەنجەیانە، تا بیخاتە دەمیەوە، لە کوتایی حەفتەکە نەخۆشەکە وازی لە چارەسەرکردنی خووەکەی هێنا و سەرکەوتوو بوو.

کراولی پزیشک پێی گوت: لە سەرمان پێویستە هەڵوێستی نوێ بگرینەبەر و بڕیاری نوێ دەربکەین و هەڵبژاردەی نوێمان هەبێت، پەی بەوە دەبەین، کەوا هەموو ئەوانە پێویستیان بە ماندووبوونێکی زۆر نییە.

٤

دۆزەرەوەیەکی سپی پێست، کە ئارەزووی دەکرد، بگاتە نێو جەرگەی ئەفریقیا، ڕێی ئەوەی بە یاوەرەکانی دا پارەی زیاتریان پێ بدات ئەگەر پەلە بکەن و کار بۆ کۆکردنەوەی کات بکەن. یاوەرە کۆل هەڵگرەکانی بۆ چەندین ڕۆژ بلەز دەڕۆیشتن، بەلام ڕۆژێکیان دوای نیوەڕۆ، لە هێکرا بارەکانیانان داگرت و لەسەر زەوی دانشتن، دۆزەرەوەکە لێی پرسین هۆکاری ئەم کردەوەیەیان چییە، وەلامەکەیان بەم جۆرە بوو، ئێمە بە هەنگاوی خێرا ڕێ دەکەین و نازانین دواتر چ کارێک بە پارەکە دەکەین، ئێشتەش پێویستە چاوەڕێ بکەین تا ڕۆحمان بێتەوە بەر .

٥

هەمیشە هەوڵ مەدە دوای هەموو شتێک گونجاو دەربکەوی، قەشە پۆلاش دەڵێ: حیکمەتی جیهان لەچاوی خودا گەمژەییە، بۆئەوەی کەسێکی گونجاو بیت دەبێت هەمیشە بۆێنباخێک ببەستی ڕەنگی لەگەڵ گۆرەویەکانت ڕێک بێ، دەبێ ڕایەکانی ئەمڕۆت هەمان ڕایەکانی بەیانیت بن، ئەی جووڵەی هەسارەکە؟ چی دەگەیەنێ؟ مادام تۆ زیان بەکەس ناگەیەنی، ناوەناوە ڕایەکانت بگۆرە، بەبێ ئەوەی هەست بە سەخلەتی بکەی، ڕکابەری خۆتبە، ئەمە مافی تۆیە، گرینگ نییە خەڵک بیر لەچی

دەکەنەوە، بەهەرحاڵ ئەمە ئەو شتەیە، کە ئەوان بیری لێ دەکەنەوە، بۆیە کچە سێوە، با گەردوون بخولێتەوە چێژ لە سیرایزی خۆت وەرگرە، خودا شتە گەمژەکانی لەبەر ئەوە بۆسەر زەوی هەڵبژادوە، تا حەکیمەکانی پێ بێزار بێت، قەشە پۆلش وای گوت .

٦

قەشە ئەنتوان لە بیابان دەژیا، کاتێک گەنجێک لیی نزیک کەوتەوە و پێی گوت: باوکە هەموو ئەوەی هەمبوو فرۆشتم و داهاتەکەیم دا بەهەژارەکان، تەنیا چەند شتێکی کەمم بۆ خۆم بەلاناوە، دەکرێ یارمەتیم بدەی لێرە بژیم، دەمەوێ ڕێگای بەرەو ڕزگاربوونم بۆ ڕوون بکەیتەوە.

قشە ئەنتوان داوای لە گەنجەکە کرد ئەو شتومەکەی، کە هیشتوویەتییەوە بیفرۆشێ و بچێتە شار، بە پارەکەی گۆشت بکرێ، لەکاتی گەڕانەوەشی دەبێ گۆشتەکە بە لەشی خۆیەوە شەتەک بدات، گەنجەکە ئەمەی کرد، کە قەشە داوای لێ کردبوو، بەڵام لە گەڕانەوەی سەگی بەڕەڵڵا و هەڵۆکان هێرشیان کردە سەر، هەرچەندە، قەشە پێی گوتبوو: ئەوانەی بۆ ئاراستەیەکە تازە کۆچ دەکەن و مەبەستیانە بەشێک لە ژیانی ڕابردوویان لەوێ بهێڵنەوە، خۆیان دەبینن ڕابردوویان هەلا بەهەلای کردوون.

٧

کە منداڵە بێ نەواکە تەمەنی گەیشتە دە ساڵان، دایکی مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی فێری وانەکانی پەروردەی جەستەیی بێت، یەکێک لەو چالاکیانەی داواشی لێ دەکرا، خۆ هەڵدان بوو لە لێورێک بۆنێو ڕووبارێک.

لە سەرەتای ڕاهێنانەکە منداڵەکە لە ترسان ئیفلیج ببوو، هەموو ڕۆژێک لەکوتایی سرەکە دەوەستا، هەموو جارێکیش ئەو بیانووەی دەهێنایەوە، کە یەکێکی دی لە نۆرکەی ئەو بازی داوە، ڕۆژێکیان ڕاهێنەرەکە تێبینی تۆقینەکەی کرد و داوای لێ کرد، یەکەم خۆ هەوڵدان ئەو جێبەجێ بکات، هەرچەندە زۆریش دەترسا، بەڵام دواجار تۆقینەکەی بۆ ئازایەتی گۆڕا مامۆستا گوتی: زۆرجار دەتوانین بەرگەی کاتەکەمان بگرین، بەڵام هەندێک کات هەن، دەبێ قۆلی لێ هەڵکەین و چارەسەرێکی بارودۆخەکە بکە ین، لەو حالەتەشدا هیچ شتێک لە دواکەوتن خراپتر نییە.

٨

کابرایەکی بێ نەوا لە ڕۆژی جەژنی قەشە یۆحننا لەنێو خیوەت و کێبڕکییەکانی تیرهاوێژی و لە گەنە ئاساییەکان دەسوڕایەوە، لەناکاو گالتەجاڕێک کەوتە لاساییکردنەوەی ئاماژەکانی، خەڵکەکەش پێکڕا دەستیان بە پێکەنین کرد، بێ نەوا، داوای لە کابرای گالتەجار کرد بەیەکەوە بخۆنەوە، کە دانیشتن گالتەجارکردکە پێی گوت: لە ژیاندا گرنگی بە خۆت بدە، ئەگەر لە ژیاندای دەبێ باڵە کانتۆیک بنێنیتەوە و لە خۆت هەڵدەی، دەنگە دەنگ بەرپا بکەی، پێبکەنی، و لەگەڵ خەڵک بدوێی، تەواو پێچەوانەی مردن، کە مردی واتە تاهەتایە لەو بارودۆخەدا دەمێنیتەوە، ئەگەر زۆر کڕوکپ بیت هەرگیز ناژیت

٩

ئەفسانەیەکی ئوسترالی باس لە سحربازێک دەکات، کە لەگەڵ سێ خوشکەکەی دەڕۆیشت، لە ڕێگا چاویان بە جەنگاوەرێک دەکەوێت، کە ئەوکاتە ناودارترین جەنگاوەر بووە، جەنگاوەرەکە دەڵێ: حەز دەکەم هاوسەرگیریی لەگەڵ یەکێک لەو سێ کچە جوانەدا بکەم، سیحربازەکە دەڵێت: ئەگەر زەماوەند لەگەڵ یەکێکیان بکەی، دوانەکەی دی لە دووری ئەودا گرفتار و مەلول دەبن، جەنگاوەرکە دەڵێت: کەواتە بەدوای هۆزێک بگەرێ، ڕێگا بە پیاوەکانی بدات سێ ژن بەیەکەوە بهێنن، سیحرباز و سێ کچەکە بۆ ماوەی چەندین ساڵ لە سەرتاسەری کیشوەری ئوستراليا دەگەڕێن بەبێ ئەوەی هیچ هۆزێکی لەم جۆرە بدۆزنەوە، یەکێک لە خوشکەکان، کە بە ساڵدا چووبوو زۆر گەڕا، تا هیلاک بوو، گوتی: بەلای کەمەوە ئەگەر یەکێک لەئیمە ئەوکات شوی بکردایە ئێستە بەختەوەر دەبوو سیحربازەکە گوتی: من هەڵە بووم، بەڵام تازە کات بەسەرچوو، بە سیحرێک سێ خوشکەکەی کردە تاشە بەردی گەورە تا هەموویان بە یەکدا ڕەت دەبن و بزانن بە ختەوەریی مروڤێک بەومانایە نایەت، ئەوانی دیکە خەمباربن

١٠

جەنگاوەرێک داوای لە سەرۆکەکەی کرد، کێ لە شمشێربازی باشترین کەسە. گەورەکە وەڵامی دایەوە بڕۆ بۆ کێلگەکەی نزیک دێرەکە، گابەردێکی لێیە دەمەوێت نەفرەتی لێ بکەی، قوتابییەکە پرسی بۆ ئەمە بکەم، خۆ گابەردەکە وەڵام ناداتەوە؟ گەورەکەی گوتی: زۆرباشە کەواتە بڕۆ بە شمشێرەکەت پەلاماری بدە، قوتابییەکە گوتی: ئەمەش ناکەم، شمشێرەکەم دەشکێ، ئەگەر بە دەستیش لێی بدەم پەنجەکانم دەشکێن و هیچ کاریگەریەکم لەسەری نابێت، من داوای ئەوەم نەکردوە، من گوتم هاوشێوەی گابەردێکە و بەبێ ئەوەی شمشێر لە کالان دەربکرێت، هیچ کەسێک ناتوانێت بیبەزێنێت .

● **سەرچاوە: القدس العربی**

شیعر

# ساڵەهایە


سەعدوڵلا پەرۆش

ئەگەر شیعر وەک نارنجۆک
دانەڕمێنێ کۆشکی فاشیزمی ترسنۆک
ئەگەر شیعر وەکو ئاگر
بەرنەبێتە مۆڵگای دوژمن چادر، چادر
ئەگەر شیعر
نەبێ بە زمانی میللەت، نەبێ بە ئاوێنەی فکر
چاکتر وایە ناوی نەنێین شیعر و هۆنراو
ناوی بنێین بەرمیلی زبڵ یان پێڵاو
ئەگەر شیعر وەک پێشمەرگەی خۆبەختکەر
دەست لە دوژمن نەوەشێنێ، چیا
چیا، سەنگەر، سەنگەر
ئەگەر شیعر وەکو تفەنگ
نەشلەقێنێ گۆمی بێ دەنگی و شەوەزەنگ
چاکتروایە ئاگری پێ بکرێتەوە
پێڵاوی پێ بسڕێتەوە
ئەگەر شیعر نەبێ بە دەنگ
نەبێ بە گوللە بۆ تفەنگ
ئەگەر شیعر بۆ برسییەکان نەبێ بە نان
بۆ ئاوارە نەبێ بە ماڵ و نیشتمان
چاکتروایە شیعری ئاوا زۆر و چڵکن
بخرێتە ناو چاڵی مردن

* * *

ساڵەهایە
سەرمان لە خزمەت شمشێری سوڵتان دایە
خوێنمان پێکی نوخبی شەوانی .........
جەللادەکانی مەحرەمی قەسر و بیلاتی تاران و
ئەنقەرە و شام و بەغدایە
خاکمان پێ شێڵی پۆستاڵی
جەندرمەکانی تەتەر و جەیشی عروبەی ئیسلام و
نیروهایە
رەنجیشمان لەسایەی سەری
هەندێ لە سەرکردە دز و شێرە بەفرینەکانماندا
وەک پووشی دەم رەشەبایە
ئەوەی خزمەتی کردین تەنیا تفەنگ و چیایە
کەچی هێشتا هەندێکمان هەر
چاویان لە دەستی کەرەمی حەزرەتی ئەم و ئەودایە

* * *

ساڵەهایە
لەم کوردستانە زیندان و ئۆردوگایە
لەم کوردستانە بێ مەرز و ئاڵایە
ناوی کوردستان تاوان و
وشەی کورد و کورد پەروەریش
تەسکی و شۆفینیەتە گوایە

* * *

ساڵەهایە
لەم کوردستانە گیرۆدە و برینداره
لەم کوردستانە دیار و نادیارە
ئەوەی پێیان رەوا دیبین
پەتی سێدارە و زیندان و
گۆڕستانی کوردی بە کۆمەڵ...... کوژراوی بێ ژمارە
ئەوەی پێیان رەوا دیبین
قامچی و کەلەپچە و زۆربوونی جەردە و سیخوڕی بێ
ئابڕوو تاوانکارە
بۆیە ئەمڕۆ
هەر بێ بەرد و هەر بێ دارە

تەنی بارود و جی خوێنی دەیان دڵی پیوە دیارە

* * *

ساڵەهایە
کردەی مەیە و
بردەی بەرەفتار دوژمن و بە گوفتار دۆست و برایە
گوتەی مەیە و
نەبیستنی ئەنجومەنی وڵاتە یەکگرتوەکان و
ئاشتی خوازانی دنیایە
گوێ مەیە و قاشوی توند وەشی
رۆژهەڵات و رۆژئاوایە
ئەوەی خزمەتی کردبین تەنیا تفەنگ و چیایە
کەچی هێشتا هەندێکمان هەر
چاویان لە دەستی کەرەمی حەزرەتی ئەم و ئەودایە

* * *

ساڵەهایە
لەم کوردستانە لەت لەت و دیل کراوە
لەم کوردستانە سەربەستی لێ دزراوە
هەر دارستانە و سەدان جار سوتێنراوە
هەر ئاواییە و سەدان جار راگوێزراوە
هەر رووبارێ
بە قوڵی خۆی خوێنی پێدا چۆتە خوارێ
هەر لوتکەیێ
سەری بێزاری شۆڕ کردووە و بە چەند بۆمبا و فرۆکەیێ

* * *

ساڵەهایە
گیانمان لە گەرووی نەهەنگ و ئەژدیهایە
نیشتمانمان رەبیە و سەیتەرەی تەفتیش و ئۆردوگایە
دوژمن لە خاکمان خاوەن و سەرکردە و فەرمانرەوایە
خۆشمان پەرتە و پەراگەندەی
سەر ئەم زەمینە جەنجاڵ و ناتەبایە
ئەوەی خزمەتی کردبین
تەنیا تفەنگ و چیایە
کەچی هێشتا هەندێکمان هەر
چاویان لە دەستی کەرەمی حەزرەتی ئەم و ئەودایە

* * *

با کوردستان پڕ کەن لە ئۆردوگا و زیندان
با قامچی و پەتی سێدارە
بکەنە گڕ چی چەوساوە و کرێکارە
با جەزرەبە و بەندیخانە
بکەنە هاوسەر و ماڵی هەرچی کوردی بێتاوانە
با هەر بە پێشمەرگەی چیا
بڵێن عوسات و ئەشقیا
با منداڵ و ژن یەخسیر کەن
کێڵگە و زەزان بسووتێنن
پیر و پەک کەوتان زنجیر کەن
با فرۆکان
بەردەنە گیانی دەوەن و گوند و لوتکان
با بە زەبری سەرە نێزان
دێهاتەکان بدەنە بەربای راگوێزان
بەڵام ئەوەی پێیان ناکرێ و مەحاڵە
دامرکانەوەی شۆڕش و جارێکی تر ئاشبەتاڵە
بەڵام ئەوەی کە پێیان ناکرێ ٢بە زەبری
فرۆکە و سێدارە و زنجیر
گۆڕینی بڕوا و بیرە بیر
بەڵام ئەوەی کە پێیان ناکرێ بە کاری ..............
گۆڕینی رووی کوردستان و
توانەوەی گەلی کوردە
با بزانێ
ئەو دوژمنە داگیرکەرەی کە خەیاڵ خاو و کەمە
گوند راگوێزان، سوپا ناردن بێ ئەنجامە
ئەگەر تەنیا یەک پێشمەرگە لە شاخ مابێ
شۆڕشی کورد بەردەوامە.

**• ئەم شیعرە لە لایەن شاعیر بۆ یەکەمجار لە دوو کۆڕدا خوێندراوەتەوە، کە یەکێتیی نووسەرانی کوردستان لە گوندەکانی «خەتێ و بالیسان» سازیکرد، دوایی لەم نامیلکەیەدا چاپ و بڵاوکراوەتەوە «شیعر لە کۆڕێکی پێشمەرگانەدا ١٩٨٣»، هەروەها لە نەورۆزە گەورەکەی سورداش دا ساڵی ١٩٨٤ لەبەردەم هەزاران ئامادەبوو، لەلایەن شاعیر خوێندرایەوە. ئەمە یەکەمجارە لە چاپکراوەکانی شاردا بڵاودەکرێتەوە، پێشتر تەنیا چەند کەسێک شیعرەکەیان بینیووە.**

**سەرنج: لەو شوێنانەی خاڵ دانراوە، وشەکان ناخوێندرێتەوە.**

# دیاری سەری ساڵ

قەهار شێخانی

بۆ جەژنی ئەم سەری ساڵە
نازانم چیت بۆ بنێرم
لە پیرۆزبایی پیرۆزتر
چ وشەیەک هەڵبژێرم

• • • •

ئەگەر دەڵێی ئەوە دڵم
تا هەتایە با لەلات بێ
شەو تا بەیان وەک پەروانە
دەبا ئێشکچی باڵات بێ

• • • •

نەبادا دڵت تەنگ بێ
لە شەوانی بێ خەوی دا
با هەست بە تەنیایی نەکەی
لەگەڵ خەمی شۆڕەبیدا

• • • •

من حەز دەکەم ئەو شیعرانەی
کە وەکو خۆت لێویان ئاڵە
بە دیاری بۆتیان بنێرم
بۆ جەژنی ئەم سەری ساڵە

• • • •

هەر بۆ ئەوەی لەم ساڵەدا
هەموو کاتێ دڵت شاد بێت
بەڵام ترسم هەیە بڵێی
من دیاری وەرناگرم لەشێت






- **گەنگەشەی ڕۆژانە (لەبارەی دەروونشیکاریی و فرۆیدزمەوە) - (نارسیزم و هەندێ ڕای دیکە)**

**بەشی یەکەم**

گفتوگۆی: سمکۆ محەمەد لەگەڵ د. محەمەد تەها حوسێن

# گفتوگۆ

## گەنگەشەی ڕۆژانە

لەبارەی دەروونشیکاریی و فرۆیدزمەوە

بەشی یەکەم

نارسیزم و هەندێ ڕای دیکە

گفتوگۆی:
سمکۆ محەمەد لەگەڵ
د. محەمەد تەها حوسێن



گفتوگۆ و گەنگەشەی ڕۆژانە، ئەگەرچی هەم پێویستی بە دیاریکردنی کاتی کۆنکرێتییە، هەم لەچەشنی دۆخی تاقیکردنەوەشە، بەڵام چەند ڕەهەندێکی ئەرێنیشی هەیە.
ڕەهەندی یەکەم ئەگەر ئەگەر کەسێکی شارەزا هەبێت و ئامادە بێت بۆ گەنگەشە لەبارەی هەر چەمکێکی فیکریی، کەواتە چانسێک هەیە لەبری ئەوەی مەنەلۆج بکەین، دیالۆگ لەسەر چەمکە فیکرییەکان بکەین، چونکە لەم دۆخەدا، کە دونیا سیستمی پڕوپوچی بەڕێوەی دەبات، گەنگەشەی فیکریی زۆر کەمن و خودی ڕۆشنبیریش کەمتر بەلای گەنگەشەی فیکرییدا دەچن، ئیدی یان ئەوەیە لە فیکر دەترسن، یان ئەوەتا بە ئاراستەی سیستمی جیهانی دەڕۆن.
ڕەهەندی دووەمی ئەرێنی ئەم جۆرە گەنگەشانە، کە لقێکی دیکەی ئەرێنییە، ئەویش وردکردنەوەی ئەو تێگەیشتنە سەرپێیانەیە، کە لە ڕابردوودا و لە دونیای مەعریفی کوردیی بۆ چەمکە فیکرییەکان کراون، یان بۆ چەمکێکی دیاریکراو، کە زۆرجار بەشێوەکی سادە و تیژتێپەڕ بەسەریدا گوزەری فیکری کراوە.
ڕەهەندی سێیەم ئەوەیە، کە فۆکەس لەسەر یەک پۆینتی فیکریی دەکرێت و گشتگیر نابێت، ئەمەش وەکو ئەوەیە خوێنەر کتێبێکی تایبەت بخوێنێتەوە، تاکو بە قووڵی لە لایەنە جیاوازەکانی چەمکەکان تێ بگات، هەرسێ ڕەهەندەکەش زەحمەتییەکەیان لەوەدایە، کە ئاگادارمان دەکاتەوە لەوەی جارێکی دی بەهەڵە چەمکەکان نەخوێنینەوە.
من، دوای ئەوەی لەنووسینەکانمدا زۆر قسەم لەبارەی نەبوونی گەنگەشە و گفتوگۆی فیکریی کردووە، کە نییە، ئەمەش مەترسییە لەسەر ڕەوشی ڕۆشنبیریی، تەنانەت پێشنیازم بۆ گۆڤار و ڕۆژنامە و میدیاکان کردووە، کە ئامادەنەبوونی ئەم لایەنە لە ڕۆشنبیریی کوردیی، زیان بە مەعریفە دەگەێنێت، بەڵام من بۆخۆم تێگەیشتم، کە دونیای میدیای ئێمە بەبێ ئەوەی ئاگای لەخۆی بێت، یان ئەوەتا ترسێکی گەورەی لە گفتوگۆی فیکریی هەیە، بۆیە ئەم پێشنیازەم بەهەند وەرناگرێت، یان ئەوەتا فیکر ناخوێننەوە، یان بەومانایەی، ئەو لایەنەی ئاراستەی میدیا دەکات، ڕێگە نادات گفتوگۆی فیکریی ببێتە دیاردەیەکی مەعریفی باو، بەڵام من دوای ئەوەی کە کتێبەکەی برایانی ماگیم خوێندەوە، کە گفتوگۆی هەمەلایەنەیە لەگەڵ بیرمەندەکانی نزیکی خۆی لەسەر چەمکە فیکرییەکان، تێگەیشتم، کە ئەم لایەنە پێویستی بەجۆرئەتی مەعریفی و خۆ سازدان هەیە، بۆیە هەم خۆم ئامادە کرد، هەم هەوڵمدا ئەو فەزایە بخوڵقێنم بۆ کەسانی شارەزای بوارە مەعریفییەکان، تاکو مۆدێکی نوێ لە ڕۆشنبیریی نووسین و گفتوگۆکردن دروست بکەم.
د. محەمەد تەها حوسێن، کە هەم ڕۆشنبیرێکی هەمەکارە و هەم شارەزایەکی باشی سایکۆلۆژیا و فرۆیدە و لەئاستێکی بەرزی ئەم مەعریفەیەدا توانایەکی لە ڕادەبەدەری هەیە بۆ خوێندنەوەی هەموو سێکتەرەکان، لە پەراوێزی چەمکی سایکۆلۆژی، دوای ئەوەی پێشنیازم بۆ کرد، بە خۆشحاڵییەوە و بەبێ هیچ دوودڵییەک ئامادەیی خۆی نواند، بە مەرجێک گەنگەشەی ڕاستەوخۆی هەفتانە بێت، ئەمەی دەیخوێنیتەوە، بەرئەنجامی ئەو گفتوگۆیەیە، کە هەفتانە لەسەر چەمکێکی دیاریکراوی سایکۆلۆژی گەنگەشەمان کردووە و ئەوەی لێ بەرهەم هاتووە.

## گفتوگۆی یەکەم

**سمکۆ محەمەد:** ناچارین باس لە چەمکی سایکۆلۆژی بکەین، لە خودی فرۆید و دواتریش لە قوتابخانەی ڤیەنناوە دەست پێبکەین و وەکو بنەما وەریبگرین، لە سایکۆلۆژیشدا پێم باشە لە مانا و ڕەهەندەکانی تێرمی نارسیزمەوە دەست پێ بکەین.

فرۆید لەکتێبی (نارسیزم)دا دەڵێت: (ڕەگوڕیشەی ئەم تێرمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو وەسفەی، کە یەکەمجار (پۆل ناک) لەساڵی ١٨٩٩ لە کلینیکدا شیکاری بۆ کردووە، کە مەبەستی لەو ئاماژەیەیە، کە مرۆڤ بەر لەهەر شتێکی دی، جەستەی خۆی دەبینێ و تاڕادەی پەرستنی خود مامەڵە لەگەڵ جەستەی خۆی دەکات، من واتێگەیشتووم، کە ئەم تێرمە بەسەر هەموو کارێکتەرێکدا ناسەپێت، واتە هەموو مرۆڤێک لەیەک دۆخی سایکۆلۆژیدا نابنە کائینێکی نارسیست، بۆیە پێموایە ئەم خەسڵەتە جۆرە لادان و نەخۆشییەکی سێکسییە، یان سروشتی ئەو کارێکتەرەیە بۆ نمایشکردنی خود لەبەرانبەر ئەوانی دیکە، کە هەڵگری

هەمان خەسڵەتن، بەتایبەتی ئەو کاریکتەرانەی، کە جگە لە جەستەی خۆیان، هیچ هێز و توانایەکی داهێنەرانەی دیکە لەهیچ کایەیەکدا شک نابەن، بۆیە نارسیزمانە مامەڵە لەتەک هەموو شتێکدا دەکەن، بۆیە ئەگەر لەبیرکردنەوەشدا جیاواز بین، جگە لە بڕوای فرۆید، تێگەیشتنی خۆشت بخەیتەڕوو.

**دمحەمەد تەها حوسێن:** بەر لە پۆل ناک کەسانی دی

***سمکۆ محەمەد:***

***مرۆڤ بەر لەهەر شتێکی دی، جەستەی خۆی دەبینێ و ئارادەی پەرستنی خود مامەڵە لەگەڵ جەستەی دەکات، من وائێگەیشتووم، کە ئەم تێزمە بەسەر هەموو کاریکتەرێکدا ناسەپێت، واتە هەموو مرۆڤێک لەیەک دۆخی سایکۆلۆژیدا نابنە کانینێکی نارسیست***

***د. محەمەد تەها حوسێن***

***سیگمۆند فرۆید لە بەکارهێنان و ئیشکردن لەسەر نێرگزییەت مەبەستێکی ئینسانی باڵای هەبووە و پێیوابووە مرۆڤایەتی هەرگیز لە کێشەکانی پەیوەست بە شەڕانگێزیی هەموو ئەو گرفتانەی لێی دەکەوێتەوە دەربازی نابێت، تاوەکو ئاستێک بۆ ئەم کێشەی نێرگزییەتە دانەنرێ***

وەک شیشرۆن، فرانسیس بیکۆن، شەکسپیر، بۆدلێر و هیتریش، بە مانایەک لە ماناکان چەمکی نارسیس- یان بەکارهێناوە، بەڵام (ناک) وەک لادانی سێکسیی خستوویەتیە کارەکانییەوە و هەر لە بنچینەشدا سیگمۆند فرۆید سەرەڕای ئەوەی زۆر ژیرانە لە فۆرمێکی سایکۆلۆجیانەی ئاخنیوە، وەک چەمکێکی میتۆلۆجی خستوویەتیە خزمەت ئاونانێکی عوسابیانە و لە ئەدەبیاتی دەروونشیکاریدا جێیکردۆتەوە و بەکاریهێناوە و لە بنەڕەتیشدا هەر ئەمەی مەبەست بووە، چوون بەخۆشەیدابوون لای فرۆید ڕیشەیەکی میتۆلۆژی هەیە و لەبەر ئەوەی نارسیس لە چیرۆکە ئەفسانەییەکەدا عیشقی حۆرییەکی وەلاوە دەنێ، ئیدی وەک سزا دەکەوێتە کێشەیەک لەگەڵ ڕەنگدانەوەی وێنەی خۆی، کاتێک کە لە گۆماوێکدا دیقەتی دەدا.

شەیدابوون بەخۆ لای فرۆید بێگومان بنەڕەتەکەی ئەو هێزە لیبیدۆییەیە، کە خودی تاک ناتوانێ بیخاتە خزمەت هەموو بوارەکانی دی لە ژیانی خۆیدا، سەرئەنجام هەر هەمووی لە خۆشەویستی و بەخۆسەرسامبووندا چڕدەکاتەوە. نارسیس دوای ئەوەی نەیتوانی بابەتێکی سرووشتیی و ماقووڵ بۆ غەریزە سێکسییەکەی خۆی بدۆزێتەوە، ئاراستەی خۆی گۆڕی و خۆی کرد بەو بابەتە سێکسییەی، کە ئیدی لە ڕووی چێژەوە لێی تێر دەخوا.

لای دەروونشیکارەکان نێرگزییەت دوو جۆری هەیە، یەکێکیان سرووشتیە و ئەوەی دیکەیان نەخۆشییە، یەکێکیان ئاراستەی بەرەو خودی کەسەکەیە و ئەوەی دیکەیان لە ناوەند و خودی کەسەکە لادەدات. ئەوەی سرووشتییە پاسەوانی ژیانی تاکە و ئەوەی دیکەیان دژی کەسەکەیە و لەگەڵ خۆیدا دەیخاتە پەیوەندییەکی نائاسایی و لەوانی دی دادەبڕێ. فرۆید لە وتارێکی خۆیدا بەناوی (دەروازەیەک بۆ نێرگزییەت) کە لە ساڵی ١٩١٤ بڵاویکردۆتەوە ئاماژەی بە مێژووی بەکاربردنی ئەم چەمکە کردووە.

ئەم زاراوەیە بۆ یەکەم جار لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم لای پزیشکی دەروونیی (هافلۆک ئێلیس) بەکارهات بەو مەبەستەی وەسفی ڕەفتارێکی لادراوی دەکرد، کە سەرنج خستنە سەر خۆشەویستی کەسێک بوو بۆ خۆی و بەس، لە ساڵی ١٩٠٨یش (سادجەر)ی دەروونشیکار پێشنیازی کرد، وەک ئاماژەیەک بۆ خۆشەویستی تاک بۆ خۆی، زاراوەی نێرگزییەت لە دەروونشیکاریدا بەکاربێت.

ئەمە ئەوەیە، کە پەیوەستە بە دەروونشیکاریی و دیاریکردنی جۆری ئەو ڕەفتارە کەچەی تاک پیادەی دەکات، بەڵام وەک ستراتیژ، سیگمۆند فرۆید لە بەکارهێنان و ئیشکردن لەسەر نێرگزییەت مەبەستێکی ئینسانی باڵای هەبووە و پێیوابووە مرۆڤایەتی هەرگیز

له کێشەکانی پەیوەست بە شەڕانگێزیی هەموو ئەو گرفتانەی لێی دەکەوێتەوە دەربازی نابێت، تاوەکو ئاستێک بۆ ئەم کێشەی نێرگزییەتە دانەنرێ. دانانی ئاست لای فرۆید بە عەقڵانیکردن و خودزەفتکردنە، بەو مانایەی ئەوە لیبیدۆ، یا غەریزەی سێکسیی نەبێ، وەک خۆی دەیەوێ تۆ بهاژوا، بەڵکوو خۆت لەنێوە خۆت بێ ئەم بهاژۆیت و ئاراستەی ئەو ئامانجانەی بکەیت، کە خۆت دیارییان دەکەی.

خودشەیدایی بە تێگەیشتنە فرۆیدیەکە دەمارگرژییەکی سایکۆسسانەیە و کەسی نارسیست لەم دونیا و گەردوونە پان و بەرینەدا شتێکی دی جگە لە خۆی نادۆزێتەوە، بیکاتە بابەتی ئیروتیکی، یا سێکسیی تەنیا خۆی نەبێ، ئەو خۆ بەبابەتکردنە، کردنی منی کەسەکەیە بە سێنتەر و هەر هەموو دەرەوەی خۆشی بە چێوە. بە چێوەکردنی دونیای دەرەوە چەقینی کەسەکەیە لە خۆیدا و کورتبینیەکی ڕوونە، بەوەی ئەم، توانای چوونە دەرەوەی لەخۆی نییە و ناتوانی لەم هەموو ورووژێنەرانەی دونیا بابەتێک بدۆزێتەوە خۆی پێوە سەرقاڵ بکا. ئەمە لای فرۆید هۆکاری هەموو ئەو کێشە گەورانەیە بە درێژایی مێژوو بەرۆکی مرۆڤایەتی گرتووە، هەربۆیە پێویابووە تاوەکوو دەرچە بۆ بەتاڵکردنەوەی ئەم هێزە نێوەکییە نەدۆزرێتەوە و لە شتی دیکەی دەرەوەی خۆی بەتاڵ نەکرێتەوە هەرهەمووی بەخۆی و دونیادا دەتەقێتەوە، سەرئەنجام شەڕەنگێزیی و وێرانکاری بەرۆکی دونیا و کۆمەڵگە جوداکانی مرۆڤایەتی بەرنادا.

**سمکۆ محەمەد:** بەڵام من واتێگەیشتوم، کە جگە لەخود - شەیدایی، یەکێک لە ڕەهەندەکانی نارسیزم خۆ بەزلزانینە، ئەو کەسەی کە تووشی خۆ بەزلزانی بووە، تەنیا حاڵەت نییە لە کۆمەڵگەکان، بەڵکوو دیاردەیەکی باوە، بەتایبەت لە کۆمەڵگە خۆرهەڵاتییەکان، ئەو کۆمەڵگەیانەش، کە لە ڕووی فیکریی و عەقڵییەوە پێنەگەیشتوون و هەژارن، یان ئاستی ڕۆشنبیرییان لاوازە، ئیدی لە ڕێگەی بە مەزن زانینی خودەوە، بگرە تا دەگاتە ئەوەی هەموو کاریکتەرێکی دەرکەوتووش بەمەزن دەزانن، لەکاتێکدا ئەزموونی ڕابردوو هەیە، کە کاریکتەری دیکە ئەم نمایشەی کردووە و بەدەستی بەتاڵ گەڕاوەتەوە، بۆ نموونە کاریکتەرە سیاسیی و ڕۆشنبیرییەکان و پیاوە ئاینییەکانیش، کە چاک دەزانن مەزنی ئەوان لە ئاستی لۆکاڵیدایە و تەنیا لە بازنەیەکی تایبەتە و سنووری بوونیان تاکوو ئاستی تێگەیشتنی تاک ڕەهەندییانەی خەڵکە ڕەشۆکییەکە دەڕوات، بۆیە وەختێک دەگەنە سنوورە باڵاکانی سیاسەت، کە لە سەرووی خۆیانەوەن، بەناچار بچووک دەبنەوە و دەبنەوە مرۆڤە ئاساییەکە، ئەم لیبیدۆییە، کە لەنێوان ئیگۆ و ئارەزووی ساختەیە، یان غەریزەیە و فرۆید لە چوارچێوەی تیۆری تێرامانی گریمانکاریدا کۆی کردۆتەوە، چونکە ناکرێ ئێمە لە یەک کاتدا تیۆرێکمان هەبێت بۆ مرۆڤ، کەچی دوو وێنەی جیاوازمان لەبەردەست بێت، کە هەریەکەیان لە ئاست ئەوی دی، دۆخە سایکۆلۆژییەکەی جیاوازە، مەبەستم ئەوەیە، کە تیۆرێکمان هەبێت بۆ مرۆڤ

**سمکۆ محەمەد:**

**من واتێگەیشتوم، کە جگە لەخودشەیدایی، یەکێک لە ڕەهەندەکانی نارسیزم خۆ بەزلزانینە**

**د. محەمەد تەها حوسێن**

**کە دەڵێم فرۆید سوودی لە میتۆلۆژیای یۆنانی وەرگرتووە بۆ نارسیزم، چونکە ئەو گەڕاوەتەوە بۆ مێژووی مرۆڤایەتی و لە ڕێگەی ئەم گەڕانەوەیەوە، مێژووی خەسڵەتە دەروونییەکانی تاکی گواستۆتەوە بۆ واقیعی سەردەمی خۆی و داهاتووش**

بەگشتیی، بەڵام جیاوازیی لەنێوان پلە باڵا و پلە نزمەکان بکات.

**د.محەمە تەها حوسێن:** کە دەڵێم فرۆید سوودی لە میتۆلۆژیای یۆنانی وەرگرتووە بۆ نارسیزم، چونکە ئەو گەڕاوەتەوە بۆ مێژووی مرۆڤایەتی و لە ڕێگەی ئەم گەڕانەوەیەوە، مێژووی خەسڵەتە دەروونییەکانی تاکی گواستۆتەوە بۆ واقیعی سەردەمی خۆی و داهاتووش.

لە ڕێگەی کولتوورەوە خوێندنەوەی بۆ نەوەکانی دیکە کردووە، بەو مانایەی بونیادی خەسڵەتەکان لە

ڕێگەی کۆنەستەوە، قۆناغ بەقۆناغ، یان نەوە بەنەوە دەگوازرێنەوە، ئەمە بەکارهێنانێکی سیمبولیکییە، بەوەی، کە تاک هەر لە سەرەتاوە لەژێر گوشاری غەریزەکانی خۆیدا بووە. خەسڵەتی بۆماوەیی نەیتوانیوە میکانیزمی ئەوتۆ بگرێتە بەر بۆ ڕزگاربوون لەو نارسیزمە، لەبەر ئەوەی ملکەچی خواستەکانی غەریزە و حەزی خۆرسکی خۆی بووە. سەرئەنجام ئەم سیمبولانە بوونەتە چەمکی نوێی دەروونی.

**سمکۆ محەمەد:** باشە بۆچی بابەتەکەت بەلایەکی دیکەدا برد؟ ئەگەر وابڕوات خوێنەر لەئامانجی ئەم گفتوگۆیە خراپ حاڵی دەبێت، من لەم گفتوگۆیە مەبەستێکی دیکەم هەیە، بۆیە باسی ئەو زنجیرەیە دەکەم، کە لەنێوان غەریزە و ئیگۆی ساختە هەیە، کە دواجار دەبێتە هۆکاری نارسیزمێکی ناخود ئاگاهی، تاکو دەگاتە ئاستێکی لەخۆی باڵاتر، کە خۆ بەزلزانینێکی وەهمییە، لەکاتێکدا ئەم قسەیە دەکەم، مەبەستم ئەوەیە کەسی نارسیست، سەبارەت بەتاک، پێویستی بەتوانایەکی لە ڕادەبەدەری سایکۆلۆژیی هەیە، تاکو نمایشە جەستەییەکەی خۆی دەبینێ، ئەمە جگە لەوەی، کە لە دەرئەنجامی بەردخوردکردنی تاک لەلایەن خەڵکەوە، بەردخوردێکی نائاساییە و چاک دەزانێت خۆبەزلزانینەکەی نمایشێکی نەگونجاوە و جێگەی قەبوڵکردنی ئەوانی دی نییە.

**سمکۆ محەمەد:**

***باشە بۆچی بابەتەکەت بەلایەکی دیکەدا برد؟ ئەگەر وابڕوات خوێنەر لەئامانجی ئەم گفتوگۆیە خراپ حاڵی دەبێت، من لەم گفتوگۆیە مەبەستێکی دیکەم هەیە، بۆیە باسی ئەو زنجیرەیە دەکەم، کە لەنێوان غەریزە و ئیگۆی ساختە هەیە***

**د.محەمەد تەها حوسێن:**

***پێویستە لەوە بگەین، کە تیۆری نارسیزم لە بەکارهێنانە فرۆیدییەکەیدا ڕیشەیەکی مێژوویی هەیە، تاکوو ئێستە نیشانە و دەرکەوتەکانی لە بونیادی سایکۆلۆژیی تاکەکان هەر بەردەوامە***

**د. محەمەد تەها حوسێن:** بۆ ئەوەی لەڕیشەوە دەستنیشانی سیمپتۆمەکانی نارسیزم بکەم. وەک هۆکار بیکەم بە بەرپرسی ژمارە یەک لەهەموو ئەو شەڕانگێزی و کێشانەی دووچاری تاک دەبنەوە لە لایەک و بوون بە کێشەی فەرهەنگیی لە لایەکی دیکەوە.

کەواتە پێویستە لەوە بگەین، کە تیۆری نارسیزم لە بەکارهێنانە فرۆیدییەکەیدا ڕیشەیەکی مێژوویی هەیە، تاکوو ئێستە نیشانە و دەرکەوتەکانی لە بونیادی سایکۆلۆژیی تاکەکان هەر بەردەوامە، لەڕەفتار و هەڵسەوکەوتەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە. فرۆید پێیوایە گەڕانەوە بۆ مێژووی تاک، سەرەتای سەرهەڵدانی ئاستە جیاجیاکانی نارسیزم و قەوارەی دەروونی تاکمان بۆ دەردەخات، ئەمەشی بۆ ئەوەیە لە ڕێگەی دەروونشیکارییەوە خاڵ بخاتە سەر ئەو کێشانەی، کە تاک دووچاری دەمارگرژی و نارسیزم دەکات. بۆیە لە لای فرۆید هەرگیز نارسیزم لەخودی تاکەکان کۆتایی پێ نایەت، ئەوەی گرینگە بەلای ئەوەوە بەهێزکردنی ئیگۆی تاکەکانە، تاکو هەمیشە دەرچەی جیاجیا بۆ بەتاڵکردنەوەی تاک لەو گوشارانەی نارسیزم خستویەتییە سەری و بەرەو لووت بەرزی فوی داوە، بدۆزێتەوە، لەم بەتاڵکردنەوەیەدا باڵانسی دەروونی تاکەکە ئاسایی دەبێتەوە و ئەو تیرمەی کە فرۆید ناوی ناوە شڵەژان، دەچێتەوە باری ئاسایی خۆی.

**سمکۆ محەمەد:** باشە بەڵام دیسان لێرەدا گفتوگۆیەکی دی دروست دەبێت، ئەویش ئەوەیە، کە من واتێگەیشتووم فرۆید پێیوایە سەرەتای لێکجیابوونەوەی غەریزەی سێکسیی و غەریزەی ئیگۆیی لە تاکدا کاتییە و یەک ڕەهەندی هەیە، ئەویش ئەوەیە، کە حاڵەتەکە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دی جیاوازە، چونکە وەکو پێشتر بەیانم کرد، ئەوە نارسیزمە وادەکات، کە خۆ بەزلزانەکان پێویستیان بە وزەیەکی دەروونی یەکجار زۆر هەبێت، بۆ ئەوەی

بیسەلمێنن، کە بوونیان لە ئاستی ئیگۆیەکی باڵادایە لەنێو کۆمەڵگە و لەنێو هاوکێشەی سیاسیی و لەنێو ئەدەب، هونەر، وەرزش و هتد، تۆش ئەو بۆچوونەت هەیە، کە ئەمە پەیوەندی بەو دوو جۆرە ژیانەوە هەیە، بەڵام من پێموایە ئەمەش دوو ڕەهەندی هەیە، یەکێکیان ژیانی بەدیهێنانی مەرامەکانی خودی نەخۆشە، کە نارسیزمی دروستکراو بەنەخۆشی نازانێ، ئەوی دیکەش هەڵقەیەکی نێوانگیری نێو زنجیرەی دووهەمە، کە جودایە لە غەریزەی تاک و بێ مەبەستە، واتە کەسەکە لەسەر بنەمای شێوازی پەروەردەکردنەکەی، بەبێ ئاگا خاوەنی ئەم خەسڵەتەیە، وەکو چۆن نەوەی دەسەڵاتدارەکان و دەوڵەمەند و بنەماڵە نەجیبزادەکان، بە حوکمی پێگەی کۆمەڵایەتی و سیاسییان، هەمان خەسڵەتی باب و باپیرانیان هەیە، بە پێچەوانەشەوە نەوەیان هەیە، کە کەسێکی یاخی دەردەچێت و ئەو خەسڵەتە هەڵناگرێت، ئەم خەسڵەتە لە دونیای خۆراوا نموونەی زۆر پێشکەش کراوە، بۆ نموونە فریدریک ئەنگڵس یەکێک لەو نموونانەیە، کە کوڕی سەرمایەدار، یان بابڵێین بۆرژوازییەکی ناودار بووە، کەچی کەسێکی فەیلەسوف دەردەچێت، کە شوێن پێی باوکی هەڵناگرێ.

**د.محەمەد تەها حوسێن:** جوانە گفتوگۆیەکی بەنرخت دروست کرد، ئەو سێ توخمە بنچینەییەی، فرۆید کردنی بە بنەمای پێکهاتنی کەسایەتی مرۆڤ، هەمیشە لە هاوسەنگیی و ناهاوسەنگیدا ئاستەکانی کەسایەتی تاکمان بۆ بەدیار دەخەن، بۆیە ئەمانە چەندە فۆڕمی جیاجیان و لە دەرکەوتنی کەسایەتی تاک بەپێی هەڵوێستەکانی لە ژیانیدا دەردەکەون، ئەوەندەش لە یەکتر جیابوونەوە نین، بەر لە فرۆید ئەم سێ چەمکە بەشێوازی جیاجیا بەکارهاتوون، بەڵام لە دەروونشیکاری فرۆید دا چوونەتە بواری دیکە و بەشێوازی دیکە تیۆریزە کراون (ئید) بە پێناسە فرۆیدییەکەی سەرچاوەی هەرچی غەریزە هەیە لە بونیادی جینێتکی تاک دا، بۆیە هەمیشە تاک بەرەو ئەو ئامانجانە دەجوڵێنێ، کە پرنسیپی چێژ دەیەوێ و تاک بەهۆیەوە دادەمرکێتەوە، بەڵام لێرەدا هیچ گۆڕانکارییەک لە گەشەی هۆشمەندانەی مرۆڤ وەدیار ناکەوێ، ئەگەر لەبەرانبەریدا ئامادەباشییە عەقڵانییەکەی تاک چالاک نەبێت و مرۆڤ نەکات بەو خەرجکەرە، یان مەسرەفگەرایەی، بەمانا پۆزەتیڤە هۆشیارییەکەی، تاکو بتوانێت دەست بەو هێزە لەبن نەهاتووەی غەریزە بگرێت و بەپێی خواستە پلانییەکان خەرجی بکات.

جا لەبەرئەوەی فرۆید زۆر داروینی بووە، بۆیە پێیوابوو ملدانە بەر خواستەکانی (ئید) کێشە بۆ بەکۆمەڵایەتی بوونی مرۆڤ دروست دەکات و بواری نادات لە گرووپ و پلانی جیاجیادا خۆیان ئۆرگانیزە بکەن. بۆ؟ چونکە ئۆرگانیزەبوونی مرۆڤ، پێویستی بەهەندێک نۆرم و ستاندارد هەیە، کە دواتر دەبن بە دابونەریت. لەم دۆخەدا بەیەکهەڵپڕژان لەنێوان (ئید و سۆپەر ئیگۆ) دروست دەبێت، ئا لێرەدا بایەخی دەرکەوتنی کەسی عاقڵە، کە ئیگۆیە دەردەکەوێت.




**سمکۆ محەمەد:** ئاخر ئەوەیە، گفتوگۆکەی من درێژ دەکاتەوە، کە پرسیارێکی بنەڕەتی فیکری سایکۆلۆژی هەیە و بەردەوام لە فرۆید دەکرێت لەبارەی جودایی ڕەگەزەوە، بۆچی ئەم جوداکارییە لەنێوان نێر و مێ بۆ غەریزە و بۆ ئەو سوپەر ئیگۆ وەهمییە دەکرێت، کە مرۆڤ لە ئاستە جیاجیاکان، یان لە پۆستە جیاکان هەیەتی؟ بۆ نموونە ئەو عەقڵە لە کوێ میوان دەبێت، وەختێک کەسەکە خاوەن سایکۆلۆژییەکی تەندروست نییە، تاکو مەسرەفگەرا و خەرجکەر نەبێت، بۆ ئەوەی پێکهەڵگژان ڕوونەدات لەنێوان ئید و سوپەر ئیگۆکەی، کە فرۆید بەنارسیزم چارەسەری کردووە، مەبەستمە بڵێم، فرۆید لەکوێ ئەو جوداییە

ڕەگەزییەی ئاشکرا کردووە؟ لەعەقڵدا، کە ئەمە تێڕوانینێکی نێرسالارییە و هیچ تێڕوانینێکی مرۆڤ دۆستی تیانییە، لە کاتێکدا ئێستە سەردەمی جێندەرییە بەهەموو کێشە ڕەگەزییەکانی مرۆڤەوە، بۆچی فرۆید ئەوەند نێرسالاریانە مامەڵەی لەگەڵ ڕەگەزی ژن کردووە؟ لەکاتێکدا تیۆرەکەی ئەو بۆ مرۆڤە، نەک تەنیا بۆ مرۆڤی پیاو، یان ڕەگەزێک، بەبۆچوونی تۆ ئەمە خەلەلی تیۆری نییە؟


**سمکۆ محەمەد:**

***بۆچی فرۆید ئەوەند نێرسالاریانە مامەڵەی لەگەڵ ڕەگەزی ژن کردووە؟ لەکاتێکدا تیۆرەکەی ئەو بۆ مرۆڤە، نەک تەنیا بۆ مرۆڤی پیاو، یان ڕەگەزێک، بەبۆچوونی تۆ ئەمە خەلەلی تیۆری نییە؟***

**د. محەمەد تەها حوسێن:**

***ئەم ڕەخنەیە لە زۆر لایەن و زاناو کەسانی ئاکادیمییەوە لە فرۆید گیراوە، بەوەی، کە تیۆرەکەی زۆر نێرانەیە و کەمتر ڕەگەزی مێی خستۆتە بەر مەددی نەزەر، بەڵام لە ڕاستیدا خۆی لە زۆر شوێن وەڵامی ئەم پرسیارەی داوەتەوە، گوایە هەردوو مەیل لە نێر و مێ دا لەڕووی بایۆلۆژییەوە هەن، هەربۆیە، ئەو زیاتر لەسەر پارادایمی نێر کاری کردووە***


**د. محەمەد تەها حوسێن:** ئەم ڕەخنەیە لە زۆر لایەن و زاناو کەسانی ئاکادیمییەوە لە فرۆید گیراوە، بەوەی، کە تیۆرەکەی زۆر نێرانەیە و کەمتر ڕەگەزی مێی خستۆتەبەر مەددی نەزەر، بەڵام لە ڕاستیدا خۆی لە زۆر شوێن وەڵامی ئەم پرسیارەی داوەتەوە، گوایە هەردوو مەیل لە نێر و مێ دا لەڕووی بایۆلۆژییەوە هەن، هەربۆیە، ئەو زیاتر لەسەر پارادایمی نێر کاری کردووە. لەلای فرۆید هەردوو ڕەگەز لەدۆخی جیاجیادا ڕووبەڕووی کێشەکانی نارسیزم و تەواوی کێشەکانی دیکەی دەمارگرژی دەبنەوە، بەڵام بەئاستی جودا، لەبەر ئەوەی ئەو پێیوایە، کە مێژووی مرۆڤایەتی لەبەر خراپ بەکارهێنانی چەمکی (هێز) هێناویەتی، بۆیە کولتووری تەواوی کۆمەڵگە جیاجیاکان، نێرانە هاتوونە و مێ لە چوارچێوەی کولتوورەکاندا، تا ئاستێکی زۆر خەسڵەتە مێینەکانی خۆی شاردۆتەوە، لەبەر ئەوەش فرۆید خاڵی خستۆتە سەر سەرچاوەی کێشەکە، کە لەبنەڕەتدا نێرسالارییە، کەواتە هەمان ئەو دۆخە دەمارگرژیانەی دووچاری مرۆڤ دەبن، هەندێکیان لە ڕەگەزی مێینە زیاتر بەدیار دەکەون، هەندێکیان لە ڕەگەزی دی، بۆیە ئەوەی تۆ ناوتنا دەسەڵات، کە لە نێرسیزم و غەریزەی مردندا سەرچاوە دەگرێت، لای ڕەگەزی مێینەش بەپێی پەروەردە کۆمەڵایەتییەکە دەنەخشێت.

**(پشوویەکمان دا و قاوەیەکمان خواردەوە، چونکە بابەتەکە درێژەی کێشا و زیاتر لەو کاتەی دامانناببوو پێویستی بە گفتوگۆی زیاتر هەبوو)**

**سمکۆ محەمەد:** هاتینەوە سەر ئەو جیاوازییە ڕەگەزییەی، کە فرۆید خوێندنەوەی بۆ ئیگۆ و بۆ ئید و غەریزە کردووە و وەکو بابەتێکی، یان لانیکەم وەکو جیاوازیی جێندەریی، یان چینایەتی تەماشای ناکات، بەتایبەت وەختێک، کە تاک لە دۆخی جیاجیادا تووشی دەبێت، بەڵام فرۆید بە ئاشکرا دژی ئەو ئازادی و یەکسانییەی نێوان نێر و مێیە، بەمانایەکی دی لایەنگری پیاو وەستاوەتەوە و تیۆرەکەی هیچ ڕەهەندێکی هیومانیستی تێدا نییە، چونکە خۆی خاوەن ڕەوت و پێگەیەکی ئەرستۆکراتی بووە لەسەر ئاستی خێزانی، بەڕادەیەک پێیوایە، کە دەروونشیکاریی تایبەت بە خەسڵەتی پیاوە بەرانبەر بە ڕەفتاری ژن، کە ئەمە بۆچوونێکی زیاد لەپێویست ئایدیالیستییە، لە کاتێکدا مارکس پاڵپشتی ئازادیی ژن و لەگەڵ لابردنی هەموو هۆکارەکانی جیاوازیی ڕەگەزی بووە، بە لەبەرچاوگرتنی ڕەنگ و نەتەوە و نەژاد و هتد. مەبەست لەدیاریکردنی پێگەی کۆمەڵایەتی و ئابوورییە بۆ مێینە، بەتایبەتی، کە دەبینین لە کۆمەڵگە دواکەوتووەکاندا، پێگەی ژن لە چێشتخانە و لە ماڵەوە بۆ پەروەردەکردنی منداڵ و خۆ ئامادەکردن و کەمالیات بۆ سێکس کردن لەگەڵ مێرد، یان دۆستەکەی

تەماشا کراوە، بۆ ئەمەش توانای لەرادەبەدەری جەستەیی و سایکۆلۆژیی خەرج دەکەن، لەبەرانبەردا پیاو هەمیشە چاوی لەشێوازێکی دیکەی نارسیزمە بۆ گەیشتنی بە دەسەڵات و ململانێ جیاوازەکان لە سێکتەرەکانی دیکەی دەرەوەی ژیانی کۆمەڵایەتی، مەبەستم لە ململانێی سیاسیی و ئابورییە، بڵێی ئەم گرێیەی فرۆید پەیوەندی بەو دۆخەوە نەبێت، کە بەمنداڵی تێیکەوتووە؟

**د. محەمەد تەها حوسێن:** ڕاست دەکەی، ئەم تێبینییە زۆر مەعقوڵە، هەربۆیە بەعەقڵانیکردنی هێز لە لای فرۆید، پێویستییەکی ستراتیژی بووە، خراپ بەکارهێنانیشی بەلای ئەوەوە لە مێژوودا ڕەگەزی نێری، تا ئاستێکی زۆر تووشی نارسیزم کردووە و ڕەگەزەکەی دیکەش، واتە مێ تووشی هیستیریا کردووە، کەواتە بەکارهێنانی هێز لەلای فرۆید پێویستە لە دەستی ئیگۆیەکی عاقڵ دابێت، تاکو سەرلەنوێ هاوسەنگیی بۆ پەیوەندییەکانی نێر و مێ وەکو دوو دوانە بگێڕێتەوە، هۆکاری تووشبوونی نێریش بەڕێژەیەکی زیاتر بە نارسیزم ئەنجامی زیاد لەپێویست شەیدابوونی تاکە بەخۆی، چونکە پێیوایە دەبێ ئەو بەهێزترین بێ و هێزیش بۆ تەواوی خواستەکانی خۆی بەکاربهێنێت، ئەم جۆرە لە پیادەکردنی هێز، گوشارێکی زۆری خستۆتە سەر ڕەگەزەکەی دی و سەرئەنجام لەنەبوونی هەمان ئاست لەهێز، لەلای ئەو گوشارەکە گەیشتۆتە ئەو ئاستەی لە هەلومەرج و دەرکەوتی جیاجیادا بتەقێتەوە، ئەم دیاردەی بەرگەنەگرتنە لە هیستریادا بە دیاردەکەوێت و زۆر لە کەیسەکانی فرۆیدیش لای ڕەگەزی مێ هیستیریابوون وەک دیارترین دەمارگیرژییە لای ئەوان، کاتێ کە تووشی دەبوون هەستیان بە جۆرێک لە ئازادیی و دەرچوون لە نەریتەکان دەکرد.

**سمکۆ محەمەد:** ئەگەرچی زۆر درێژەمان بەچەمکی نارسیزم دا، بەڵام هەست دەکەم بەرگرییەکەت لە فرۆید بۆ نارسیزم لەنێوان جیاکاریی بۆ نێر و مێ، بەرگرییەکی نا لۆژیکییە، چونکە ململانێی نێر و مێ، تەنیا بایۆلۆژی نییە، بەڵکو ئابوریشە، کە سیستەم پاڵپشتی دەکات، بۆچی ئەوە لەبەرچاو ناگری، کە گوتاری کۆمەڵگە گوتارێکی پیاوسالاری و ئاینییە بۆ ڕەگەزەکەی دی، کە مێیە، بۆچی ئەوە لەبەرچاو ناگری، کە هەڵکەوتەی جەستەیی و بایۆلۆژی مێ، بەناچار دەیباتە فەزایەکی دی بۆ بیرکردنەوە لە هیستریا بەرانبەر بە نێرسالاری، بەتایبەتی ئەوکاتەی مێ هیچ دەرچەیەکی نییە بەرانبەر بەهێزی بازووی نێر، کە یەکێکە لەبنەماکانی بەدەستهێنانی دەسەڵات، بۆیە نارسیزمی نێر نابێتە بەرهەمهێنانی هیستریا.

بۆچی فرۆید ئەوەی لەبەرچاو نەگرتووە، کە ژن لە ئایندەی کۆمەڵگەکاندا پێشکەوتن بەخۆیانەوە دەبینن و کۆمەڵگەکان لە داخراوەوە دەبن بە کۆمەڵگەی کراوە، بەوێشەوە ژن دەبێتە بەشدارێکی بەتوانا لەگەڵ پیاو، بەتایبەتی بەشداریکردن لە گوتاری سیاسیی و پیشەسازی گوتار بەهەموو ماناکانییەوە، وەکو ئەو دۆخەی ئێستە، کە جگە لەچەند وڵاتێکی کۆنسێرڤاتیڤ، لەسەرتاسەری دونیا دەیبینین، کە ژن چالاکە لەهەموو سێکتەرەکانی ژیان.

**د. محەمەد تەها حوسێن:** فرۆید پێویستی نە بە بەرگری من، نە هیچ کەسێکی دیکە هەیە، ئەو لەسۆنگەی ئەوەی، پزیشک بووە و بنەمایەکی بایۆلۆژیانەی لە ڕێگەی ئەم پسپۆڕییەوە بۆ تیۆرەکەی خۆی دارشتووە، هەروەها سەرسامی تیۆرەکەی داروینیش بووە، کە تیۆری گەشەسەندنە، بۆیە ئەم تیۆرە سرووشتییەی

سمکۆ محەمەد:

ئەگەرچی زۆر درێژەمان بەچەمکی نارسیزم دا، بەڵام هەست دەکەم بەرگرییەکەت لە فرۆید بۆ نارسیزم لەنێوان جیاکاریی بۆ نێر و مێ، بەرگرییەکی نا لۆژیکییە

د. محەمەد تەها حوسێن:

فرۆید پێویستی نە بە بەرگری من، نە هیچ کەسێکی دیکە هەیە، ئەو لەسۆنگەی ئەوەی، پزیشک بووە و بنەمایەکی بایۆلۆژیانەی لە ڕێگەی ئەم پسپۆڕییەوە بۆ تیۆرەکەی خۆی دارشتووە، هەروەها سەرسامی تیۆرەکەی داروینیش بووە، کە تیۆری گەشەسەندنە

هەڵبژاردووە، لەبەرئەوە لۆژیکی هێز لە ڕوانگەی ئەم دوو بنەمایەوە، ئەگەر لە هاوسەنگی خۆی دەرچوو، ئەوا لە ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤیشدا هاوسەنگییەکە تێک دەچێت، کەواتە هێنانەئارای ئیگۆیەکی عەقڵانی، ئەم کێشە ئەزەلەییە تائاستێکی زۆر چارەسەر دەکات و حەتمییەتی ئەگەر بشێت بەکاری بهێنین بوونی دووانەکان لەلای فرۆید وەدەردەخات، ئەم ئیگۆیە هەوڵ بۆ هێنانە سەر ڕێی ستراتیژێکی ئابوورییانەی سێکسیی دەدات و هەوڵ دەدات لیبیدۆ وەک هێزێکی سێکسیی هاوسەنگانە بخاتە کار، توێژینەوەی جیاجیاش لەبارەی ئەم ڕوانینانەی فرۆید کراون و

**سمکۆ محەمەد:**

***بە بڕوای ئەلفرێد ئادلەر، کە یەکێکە لە خوێندکارەکانی فرۆید، بڕوای وایە، کە ژیانی زەینی واتە فیکریی، ژیانێکە لەسەر بنەمای چالاکی مێشک وەستاوە***

**د. محەمەد تەها حوسێن:**

***ئەوەی ئادلەر سەرنجی خۆی خستۆتەسەر، کە پێیدەگوترێت سایکۆلۆژیای تاکۆنی، ئەو پێیوایە تاک میحوەرە و لەوێوە تیشکەکان بۆ دەرەوە دەردەچن***

ئەویان بە کەسێکی عەقڵانی لە چوارچێوەی گەشەی بەردەوامی مۆدێرنیزم وەدیار خستووە، هەمیشەش جەختیان لەوە کردۆتەوە، کە تیۆرەکەی فرۆید لەپێناوی هێنانە ئارای کەسێک، جا کەسەکە چ نێر و چ مێ، کاری کردووە چیدی دیلی هێزە لیبیدۆییەکەی نەبێت و مەبەستی دوور مەودای ئارامییەکی دەروونی تا ئاستی دووچاربوونی بەکەمترین دەمارگرژی بێت و دواتر لە ئایندەدا لە هەلومەرجێکی مەدەنیانەی ڕێکخراودا بیباتەسەر.

## گفتوگۆی دووهەم

**سمکۆ محەمەد:** ئەمڕۆ لەبارەی زەینەوە گفتوگۆ دەکەین، واتە گفتوگۆ لەبارەی پەیوەندی فیکر و چالاکی مێشک، بە بڕوای ئەلفرێد ئادلەر، کە یەکێکە لە خوێندکارەکانی فرۆید، بڕوای وایە، کە ژیانی زەینی واتە فیکریی، ژیانێکە لەسەر بنەمای چالاکی مێشک وەستاوە، کە ئەویش بریتییە لە بێتوانایی یەکێک لە ئەندامەکانی دیکەی جەستە، واتە کەسی خاوەن پێداویستی تایبەت، زیاتر لە کەسی ئاسایی پشت بە زەین دەبەستێت، بۆ ئەوەی قەرەبووی کەموکورتییەکانی دی بکاتەوە، بەڵام فرۆید ڕەخنە لەم تێڕوانینە دەگرێت و بەبێ مانای لەقەڵەم دەدات و بە چالاکی خەونی دەزانێ، قسەی من ئەوەیە، ئەی بەو کەسانە بڵێین چی، کە بەسوتفە کەوتوونەتە نێو جۆرێک لەچالاکییەوە؟ بەتایبەتی ئەو کارانەی، کە پەیوەندییان بە زەروورەتی ژیانەوە هەیە، نەک ئەو کار و چالاکیانەی، کە لە ڕێگەی ئاکادیمیاوە بەرهەمهاتوون؟

**د.محەمەد تەها حوسێن:** ئەوەی ئادلەر سەرنجی خۆی خستۆتەسەر، کە پێیدەگوترێت سایکۆلۆژیای تاکۆنی، ئەو پێیوایە تاک میحوەرە و لەوێوە تیشکەکان بۆ دەرەوە دەردەچن، کاتێک ئادلەر لە فرۆید جودابۆوە، پێیوابوو دەبێ خاوەنی ڕێباز و چەمکی خۆی بێت، بەڵام من پێموانییە ئادلەر بەشێوەیەکی ڕیشەییانە لە فرۆید جودا بووبێتەوە، چونکە من پێموایە هەست بەکەمیکردنی ئادلەر وەکو چەمک، زادەی تێرمی شڵەژانە لەلای فرۆید، کاتێک پێیوایە، ئێمە کە شتێکمان پێویستە، دەشڵەژێین و ئیدی هێزێکی غەریزی لەپشت ئەو داوایەی ئێمەوەیە و بەرەو ئامانج کە هاوسەنگییە دەمانبات، بەڵام لەلای ئادلەر هەست بەکەمیکردن لای هەموو تاکێک لە کۆمەڵگە جیاجیاکانی مرۆڤایەتیدا هەیە، ئەمەیە گرفتەکە، چونکە هیچ کەسێک نییە هەست بەکەمی نەکات، ئەو هەست بەکەمیکردنە، دوو ڕێگەی لەبەردەم دەکاتەوە، یان ئەوەتا بەرەو هەست بە باڵابوونی دەبات، یان ئەوەتا بەرەو گرێی هەست بەکەمی و گرێی باڵابوونی دەبات، بۆیە ناوەناوە نموونەیەک دێنێتەوە لەسەر ئەو کەسانەی، کەموکورتی جەستەییان هەبووە، یان لە بواری کۆمەڵایەتی، یا دەروونیی کێشەیان هەبووە. کاتێک کە تاکەکە هەوڵیداوە بۆ ئەوەی ئەم کەموکورتیانەی

پڕ بکاتەوە، زۆر لە کەسێکی ئاسایی باڵاتر بووە و تێپەڕاندەوە، نموونە بە شاعیرێکی نەمسایی دێنێتەوە، کە نابینایە و ناوی (گۆستاڤ فریتاگ)ە لە کتێبی (ژیانی دەروونیمان)دا باسی دەکات، هەمیشە دەیگوت ئەوەی من بە بیری خۆم دەیبینم، ئێوە بەهەردوو چاوە ساغەکانتان نایبینن، ئێمەش لەلای خۆمان (تەها حوسێن و کامیل بەسیر)مان هەبووە، بۆیە ئەم هەست بەکەمیکردنە ئیرادەیەکی بەهێزی نیتچە-یانەی لەپشتە و هەموو تاکەکان بەتایبەت ئەوانەی خەونیان هەیە بگەن بەئاستێکی بەرز، یان هەموو ئەو خەونانەی ستراتیژن لەلای ئەو، دەبێ بگەن بەو هاوسەنگییەی، کە تیایدا کەموکورتییەکانیان بە باڵابوون و تا ئاستێک داهێنان داپۆشن.

**سمکۆ محەمەد:** بەڵام تیۆرە کۆمەڵناسییەکان، کە هاوکاریی تیۆری سایکۆلۆژی دەکەن، بۆ خوێندنەوە، یان شیکاری حاڵەت و دیاردەکان، لە شوێنێکدا لەگواستنەوەی سایکۆلۆژی تاکەوە بۆ سایکۆلۆژیای کۆمەڵ دەچێت، ئەمانە تیۆرگەلێکی تاڕادەیەک ڕیالیستیین و هاوکاری (ئالفرێد ئادلەر) دەکەن بۆ پێشنیازەکەی، کە جیاوازە لە تێڕوانینی فرۆید، چونکە ئەم تیۆرە بڕوای بە توانای عەقڵی تاک هەیە، کە لە نەست دایە و لەدەرەوەی هێزی ئاینییە، ئادلەر ناوی ناوە عوساب، بەتایبەتی ئەو داهێنانەی، کە بەبێ بۆماوەیی و لەدەرەوەی گرووپگەرایی لەدوای سەرکەوتنی تاک بۆ بابەتەکە بەرهەمهاتوون، لەڕابردووشدا ئەوەمان بینیوە و ئێستەش هەن، لەمێژووی سەدەی ڕابردووشدا زیاتر دەرکەوتوون و کەسانی زۆر بەتوانا ناویان تۆمار کراون، بۆ نموونە توانای بتهۆڤن لە میوزیک، توانای دیکارت لە فەلسەفە، توانای ئانتۆنیۆ کیون لە نمایش و سینەما، توانای چارلی چاپلن لەهونەری کاریکاتێر، توانای ئەدیسۆن لە بەرهەمهێنانی کارەبا و چەندین توانای فیکریی، هونەریی، ئەدەبیی و زانستیی.

**د. محەمەد تەها حوسێن:** من پێموایە فرۆید هەمیشە لە قوتابییەکانی واقیعیتر بووە، چونکە لە ئیگۆدا پشت بەپرەنسیپی عەقڵ دەبەستێت، هەوڵ بۆ هێنانەدی دونیایەک لەعەقڵانییەت دەدات، بەڵام ڕیشەییانە ڕابردوو بە داهاتوو دەبەستێتەوە، هیچیان بە ئەدلەریشەوە نەیانتوانیوە لەو تێپەڕێنن. ئەوەی ئادلەر لە خۆیدا تا ئاستێکی زۆر پەیوەستە بە بونیادی جەستەیی خۆیەوە، چونکە سێ چوار جار لە ڕووداوی ئۆتۆمۆبیل و ڕووداوی دیکەدا زامداربووە، ئەمە لە لایەک، لە لایەکی دیکەوە، یەکێک لە براکانی وەرزشوان بوو هەمیشە لەسەرنجدانی بۆ براکەی هەستی بەکەموکورتی جەستەیی خۆی دەکرد، هەربۆیە هەست بەکەمیکردن بوو بە چەمکێکی سێنتراڵ لەلای ئەو، هەوڵدان بۆ پڕکردنەوەی تاک، تائاستێکی زۆر بۆ کەموکورتییەکانی خۆی لای ئەم ڕێچکە سایکۆلۆژییە دەچێتە چوارچێوەی داهێنانەوە. بەڵام ئادلەر هەمیشە پێی وابووە، ئەوە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانن لێیانەوە پێدەگەین و هەر بەهۆی

> سمکۆ محەمەد:
>
> ***فرۆید لە کتێبی (دڵەڕاوکێ لە شارستانییەت)دا باسی شاعیرێک دەکات، کە نامەی بۆ ناردووە، بەڵام زۆر بە پەراوێزی باسی دەکات و تەنانەت ناویشی ناهێنێت، ئەمە جۆرێک لە لوتبەرزی فرۆید نییە، کە بڕوای بە ئەویتری هزری نییە؟***
>
> د. محەمەد تەها حوسێن:
>
> ***من ئەوە بە لوتبەرزی نازانم، بەڵام مانای ئەوەش ناگەیێنێ، کە فرۆید جۆرێک لە غروری مەعریفی تێدا نەبووە***

بونیادی سایکۆلۆژیمان بەرەو پێگەیشتن دەچین، ئەم دەرچەیە هەست بەکەمی هزری و بوارەکانی دیکەی مەعریفیش دەگرێتەوە، واتە کەسێک ئەگەر بە ڕێچکە سیستماتیک و ئەکادیمیەکانیشدا نەڕۆیشتبێت، بەپێی تێڕوانینی ئادلەر و لەڕوانگەی خۆپەروەردەکردن و خۆفێرکردنەوە، بگاتە ئاستێک، تەنانەت خاوەن تێڕوانین و فیکری خۆشی بێت. بۆ نموونە ئێریک ئەریکسۆن، یەکێک لەوانەیە لە دونیای سایکۆلۆژیادا ژمارەیەکی قورسە و ئالفین تافلەریش لەسۆسیۆلۆژیا لەزەمەنی جیهانگەراییدا لەو خۆپەروەردەکەرانەن.

**سمکۆ محەمەد:** ئاخر ئەوەی من تێگەیشتبم ئادلەر لەوێدا کێشەکە لەگەڵ فرۆید هەم جودا دەکاتەوە، هەم بەهەڵواسراوی دەیهێڵێتەوە، کە غەریزەی سێکسیی و عەقڵ لەیەک جودا ناکاتەوە، چونکە فرۆید پێیوایە هەموو شتێک پاڵنەری سێکسیی هەیە، بۆیە مرۆڤی بریتی کردووە لەمن و منی باڵا، ئید- ی غەریزی. بەبێ بەکارهێنانی عەقڵ، کەچی ئادلەر بەپێچەوانەوە مرۆڤ لە پاڵنەری سێکسیی دوور دەخاتەوە و بە کائینێکی تەواو کاملی دەزانێ، هەروەها پێیوایە

> **سمکۆ محەمەد:**
>
> ***ئەریک فرۆم ڕوونی کردۆتەوە، کە فرۆید لەو کۆنگرەیەدا پاڵتۆکەی وەکو ناکتیکی شانۆیی فڕێداوە، گوایە دژەکانی گەرەکیانە ڕووتی بکەنەوە و دووری بخەنەوە لە سەرکردایەتی کۆمەڵەی دەروونشیکاریی، هەروەها گوتوویەتی دوژمنەکانم دەیانەوێت لە برسان بمرم***
>
> **د. محەمەد تەها حوسێن:**
>
> ***دامەزراندنی ڕێکخراوێکی دەروونی لەسەر ئاستێکی فراوانی وەک کۆمەڵەی دەروونشیکارانی ڤیەننا، کە فرۆید هەمیشە مەبەستی بووە فراوانتری بکات، خستییە بەر شەپۆلێک لە گومان***

هەست و نەست هەردووک پێکەوە کاردەکەن بۆ بەرهەمهێنانی دەنگێکی دی، جگە لەوەش گرینگیی دان بەو ڕووداوانەی، کە لە نۆستالیژیای مرۆڤدا دەمێننەوە، کە ئەمەش یەکێکی دیکەیە لە گرینگیدانی ئادلەر بەخەیاڵی مرۆڤ، ئەمەش توانای ئەزموونکردن بەهێزتر دەکات، بۆیە من بە دوو ئاراستە بیرکردنەوەی جیاوازی سایکۆلۆژی دەبینم.

**د.محەمەد تەها حوسێن:** هەروەکو پێشتر ئاماژەم پێدا سێکس لەلای فرۆید مانایەکی زیاتر ئەبستراکت و ئاتاستێکی زۆر گشتگیرییانەی هەیە، ئەبستراکت بەمانای دابڕان لە واقیع نییە، بەقەد ئەوەی سێکس وەکو ئێنێرژییەک دابەشی سەر دونیایەک بواری جیاجیا دەکات، چونکە لکی بەرەو بواری جیاجیا لێدەبێتەوە، هەربۆیە هەر جووڵەیەک، یان هەر ئامانجێک لە دیدی فرۆید، بەبێ ئەو هێزە بەڕێوە ناچێت، لەلایەکی دیکەشەوە فرۆید لایەنە کۆمەڵایەتییەکەی پشتگوێ نەخستووە، چەمکی سوپەر ئیگۆ لە لای فرۆید بە تەواوی مانای کولتوور و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان دەگەیێنێت، بەڵام ئەوە پەیوەندییەکی داینامیکیە لەنێوان ئیگۆ و سوپەر ئیگۆدا، کە هەریەکەیان ئەوەی دیکەیان دروست دەکات، کەچی لەلای ئادلەر خۆبەستنەوە بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان هزرینی لە نائاگاوە، کە دونیایەکی بێ کۆتاییە دێنێتەوە سەر زەمینی واقیع، دواجار خۆی تێیدا دەژی، بۆیە جیاوازیی ئەم دوو تێڕوانینە هیچ یەک لە فرۆید و ئادلەر لە واقیع جیاناکەنەوە، بەقەد ئەوەی ئادلەر زۆر فرۆیدییانە ئیشی لەسەر ئەو چەمکانە کردووە، کە لە زۆر بۆنەدا فرۆید دەری بڕیون، بەڵام ئەوان (قوتابیانی فرۆید، زیاتر پێیدا چوونەتە خوارەوە و کاریان لەسەر کردووە) واتە زیاتر لە فرۆید، چەمکە سایکۆلۆژییەکانیان ورد کردۆتەوە، هەندێک جاریش تێڕوانینی جیاوازیان دەربڕیوە.

**سمکۆ محەمەد:** ئەو ئارگیومێنتەی هێناتەوە زۆر قەناعەت بەمن ناکات، چونکە فرۆید لە کتێبی (دڵەڕاوکی لە شارستانیەت)دا باسی شاعیرێک دەکات، کە نامەی بۆ ناردووە، بەڵام زۆر بە پەراوێزی باسی دەکات و تەنانەت ناویشی ناهێنێت، ئەمە جۆرێک لە لووتبەرزی فرۆید نییە، کە بڕوای بە ئەویتری هزری نییە؟ ئایا مومکینە تیۆریستێک و خاوەن فەلسەفەیەک، یان تێڕوانین و فیکری جیاواز بێت، هێندە خاکەڕا نەبێت و بەو شێوەیە مامەڵە لەگەڵ ئەوی دیکە بکات؟ من ئەمە بە جۆرێک لە نەخۆشیی دەروونی و لووتبەرزیی دەبینم.

**د. محەمەد تەها حوسێن:** من ئەوە بە لووتبەرزی نازانم، بەڵام مانای ئەوەش ناگەیێنێ، کە فرۆید جۆرێک لە غروری مەعریفیی تێدا نەبووە، ئەوەش ئاڵۆزیی کەسایەتی هەر کەسێکە، کە ئاستێکی ئاوها بەرزی لە کۆڵین کاریی هزری هەبێت، چەندین

نموونە لە ژیانی ئەودا هەن، کە هەم ئاماژەن بۆ ئەو تێڕوانینەی جەنابت لەسەر جۆرێک لەو لووتبەرزیەی باسی دەکەی، یان پێتوایە ئەو هەیبێت، بەڕای من، هەم جۆرێکیشە لە بەخۆ نەبەستنەوەی ئەوانی دیکە بەخۆیەوە و خۆنەکردن بەسێنتەر بۆ ئەوانی دی، بۆ نموونە پێرلس، سایکۆلۆژیستێکی جەشتەڵتی بوو، کە مەزهەبێکی سایکۆلۆژیە، سەرەتا دەروونشیکار بوو، بەڵام لە کۆنگرەیەکی کۆمەڵەی دەروونشیکارانی نەمسا، کە ئەو لە ئەفریقیای باشوورەوە چوار هەزار میلی بڕیبوو بۆ ئەوەی تەنیا فرۆید ببینی، کاتێک، کە بینی پێی گوت ئەم هەموو ڕێگەیەم بڕیوە بۆ بینینی تۆ، لە وەڵامدا فرۆید پێی گوت (لەسەرخێر، کەی دەگەڕێیتەوە) پێرلس بەم وەڵامە تووشی شۆک، یان دارمانێکی کاتی هات، بڕیاری دا دووربکەوێتەوە لە دەروونشیکاریی و ببێت بەسایکۆلۆژیستێک لە بواری جەشتەڵتیزم، بەڵام ئەوەی سەیرە ئەوەیە فرۆید لە زۆر لە کتێبەکانی، بۆ بەهێزکردنی نووسینەکانی، سەرچاوەی قوتابییەکانی خۆی وەکو یۆنگ، ئادلەر، ئۆتورانک و ئەوانی دی بەکارهێناوە، لەزۆر شوێنیش بە باڵای قوتابیەکانی هەڵگوتووە، بۆ نموونە (یۆنگ یان ئادلەر) کە دەڵێ (جوانی گوتووە، یان باش پێکاویەتی، کاتێک لەکتێبیکی، یان نووسینێکیدا گوتوویەتی .........) ئەمە قسەی فرۆیدە سەبارەت بە بەکارهێنانی سەرچاوە لەلای قوتابییەکانی.

**گفتوگۆی سێیەم**

**سمکۆ محەمەد:** ئەمڕۆ لەبارەی کۆمەڵەی دەروونشیکاریی نەمساوە قسەدەکەین، کە فرۆید داهێنەری بووە، بۆیە فۆکەس لەسەر ئەم لایەنەی چالاکەی فرۆید دەکەین، فرۆید دوای ئەوەی تێگەیشتووە، کە سەرکەوتوو نابێت لەوەی ببێتە سەرۆکی کۆمەڵەی دەروونشیکاریی، ئیدی بەجووڵەیەکی شانۆیی دژی ئەو هەوڵەی، کە بەنیازبوون ڕێگەی نەدەن ببێتە سەرپەرشتیار و سەرۆکی کۆمەڵەی نێودەوڵەتی سایکۆلۆژیستەکانی نەمسا، کە ویستوویەتی لقی لە چەندین وڵات هەبێت، کاتێک ئەریک فرۆم ڕوونی کردۆتەوە، کە فرۆید لەو کۆنگرەیەدا پاڵتۆکەی وەکو ئاکتێکی شانۆیی فڕێداوە، گوایە دژەکانی گەرەکیانە ڕووتی بکەنەوە و دووری بخەنەوە لە سەرکردایەتی کۆمەڵەی دەروونشیکاریی، هەروەها گوتوویەتی دوژمنەکانم دەیانەوێت لە برسان بمرم، ئەمە جگە لەوەی کۆنگرەکە هەموو خەسڵەتێکی سیاسیی تێدا بووە، بۆ نموونە دیالۆگی توند لەنێوان گرووپەکە، بووەتە هۆی دواخستنی کۆنگرەکە، بەتایبەتی چوونە دەرەوەی لە بازنەی گرووپی جووەکان و دابەشکردنی پۆستەکان بۆ سویسرییەکان، پاشان فرۆید بەناچار دەستی لەکار کێشاوەتەوە و ئادلەری لە شوێنی خۆی داناوە، تەنیا بۆ ئەوەی کەسێک، یان قوتابییەکی خۆی هەمان مومارەسەی ڕێکخراوەیی بکات، کەچی دوای ئەوەی لێژنەیەکی حەوت کەسی بۆ ئەنجوومەنی ڕێکخراوەکە

*سمکۆ محەمەد:*

***ئیدوارد سەعید پێیوایە فرۆید بەهۆی ئەوەی خاوەن تراديسیۆنێکی یەهودی، واتە جوو بووە، وای لێکردووە، کە تەنیا لەژێر کاریگەری هیومانیزم و ڕێنسانسی ئەورووپیدا بیر بکاتەوە***

*د. محەمەد تەها حوسێن:*

***سەبارەت بەوەش، کە تێگەیشتنی ئیدوارد سەعید، بۆ تێڕوانینی فرۆید بۆ ئەوروپا سێنتەری بووە، من ئەمەم پێ بیرۆکەیەکی دروست نییە، چونکە ئەو ئینتیمایەکی کۆسمۆپۆلۆتییانەی لە ڕێگەی ئۆرگانی کۆمەڵەی دەروونناسانەوە نیشانی هەموو دونیا دا***

پێکدەهێنرێت، فرۆید دەبێتە چاودێری بزووتنەوەکە، دواجار فرۆم زەرەرمەند بووە. ئەدی ئەمە ویست و هەڵوێست و کرداری سیاسیی نییە بۆ کەسێکی دەروونشیکاری نێودەوڵەتی، کە گوایە کەسێکی سیاسیی نەبووە؟

**د. محەمەد تەها حوسێن:** دامەزراندنی ڕێکخراوێکی دەروونی لەسەر ئاستێکی فراوانی وەک کۆمەڵەی دەروونشیکارانی ڤیەننا، کە فرۆید هەمیشە مەبەستی بووە فراوانتری بکات، خستییە بەر شەپۆلێک لە گومان،

تا ئاستێکی زۆریش ڕق، لەبەر ئەوەی وەکو ئینتیمای ئایینی باکگراوندێکی جوولەکەیی، یان جووی هەبووە، بۆیە زۆر ڕارا بووە لەسەر ستراتیژ و تەکنیکەکانی دەروونشیکاریی، هەر لەبەر ئەوەی تۆمەتبار نەکرێت بەوەی لەپشت ئەو کۆمەڵەیەوە مەبەستێکی ئایینیی، یان بە مانایەکی دی جوولەکانەی هەبێت، هەربۆیە زۆر هەوڵی دەدا یەکێک کە سەر بەئایینی کریستیان بێت لەجیاتی خۆی بکات بەسەرۆکی کۆمەڵەکە، ئەو کەسە لەلای فرۆید کارڵ گۆستاڤ یۆنگ بوو، چونکە

**سمکۆ محەمەد:**

**کەموکورتی تیۆرەکە لە ناخودئاگایی دەستەجەمعی کۆمەڵگە دایە و سەرئەنجامیش کۆمەڵگە بەگشتیی بڕیار لەسەر گۆڕانی سیستم دەدات، نەک ناخودئاگایی تاک**

**د. محەمەد تەها حوسێن:**

**چەمکی ناخودئاگایی دەستەجەمعی لەلای فرۆید، بنەمایەکی سایکۆ کۆمەڵایەتیانەی هەیە، ئەو پێیوایە تاک لەنێو (مێرگەل) دا هۆش و بیرکردنەوەی سەربەخۆیی خۆی لە دەست دەدات و وەگەڵ ناراستە دەستەجەمعیەکە دەکەوێت**

یۆنگ توانایەکی فراوانی لە تێگەیشتنی فرۆید هەبوو، بەهرەمەندێکی فرە ئاراستەش بوو باکگراوندێکی کریستیانیزمی هەبوو، خێزانەکەی زۆر نزیک بوو لەکڵێسا، ئەو نەرمنواندنەی لە پێناو پاراستنی ئۆرگانە سایکۆلۆژییەکەی بوو، لەبەر ئەوەش تێڕوانینەکانی فرۆید بەدەر نەبووە لە ڕەخنەی جۆراوجۆر، لەوانەش تۆمەتبارکردنی بە سۆفیزمی یەهودی و ئەلتەرناتیڤێک بۆ زاڵکردنی ئەم ئۆرگانە بەسەر تەواوی ئۆرگانە زانستییەکانی دیکەدا، قوتابییەکانی ئەو کاتێک، کە دەبوون بەناوێک لەناو دەروونشیکاریی، دەستیان دەکرد بە ڕەخنەگرتن لە ستراتیژ و شێوازی کارکردنی فرۆید، ئەم وانەیەش تا ئاستێکی زۆر زانستییە، کە من وەکو ئەگەرێکی کراوە بەکاری دەهێنم، جۆرێک لە بەرگریش بووبێت لە خۆیان بۆ ئەوەی نەکەونە نێو هەمان ئەو تۆمەتانەی ئاراستەی فرۆید دەکران، بۆیە لەزۆر شتدا، خۆیان بێ بەری دەکرد و ئاراستەیەکی دیکەیان لەدەروونشیکاریی دەگرتەبەر، ئەم نواندنانە فرۆیدی تووڕە دەکرد و ناچاری دەکرد، کە هەڵوێست و ڕەفتاری سەیر بەرانبەریان بگرێتە بەر.

**سمکۆ محەمەد:** لە گفتوگۆی پێشتووتردا بە تێرتێپەڕ باسی ژیار، یان شارستانییەتمان کرد، من نموونەیەکم هێنایەوە بۆ لووتبەرزیی، کە فرۆید خۆی خاوەنی ئەم خەسڵەتە بووە، لە کتێبی دڵەڕاوکێی شارستانییەکان، گوایە شاعیرێک نامەیەکی بۆ ناردووە، ئەویش لەوەڵامی نامەکەدا ناوی ناهێنێت و وەکو پەراوێزخراوێک بەناڕاستەوخۆ باسی دەکات، بەهەرحاڵ ئێستە دێمەوە سەر باسی ئەوەی فرۆید بەهۆی ئەوەی شارستانییەتی خۆرهەڵاتی تەنیا لە میسرەوە ناسیوە، جگە لە ژیارەکانی هیندی و چینی، ئاشنایەتی نەبووە لەگەڵ ژیارەکانی دی، ڕەنگە بڕوای وابووبێت، کە هێڵێکی جیاکردنەوە لەنێوان مرۆڤی سەرەتایی و مرۆڤی ژیاریدا هەبووبێت، بۆیە پێیوابووە میللەتانی دیکەی غەیرە ئەورووپی، شایانی شارستانییەت نین و هەرچی بیکەن ناگەن بەو شارستانییەتە، جا ئەمە بۆ مارکسیش هەمان کێشەیە، کاتێک لەڕووی کۆمەڵناسییەوە، وەکو نموونە ڕەخنەی لێدەگیرێت، چونکە لە تێکستەکانیدا سەنتەریزمیانەی خۆراوایانە بیری کردۆتەوە، ئەم کەموکورتییە لە نەشارەزابوون لە کولتوور و مێژووی فیکری خۆرهەڵاتی گرفتی بۆ هەردوو بیرمەند و فەیلەسووف دروست کردووە، چونکە مارکسیش هەمان کێشەی هەبووە، بۆ نموونە دوای گەشتە سۆسیۆلۆژییەکەی ئەنگلسی هاوڕێی بۆ تورکیا و لەوێوە بۆ جەزائیر، ئیدی کە دەگەڕێتەوە باس لە ژیار و کۆمەڵگەیەک دەکات، کە ئەوان پێشتر ئاشنایەتییان لە بارەوە نەبووە، ئەمە مارکس ناچار دەکات و لە کۆتایی تەمەنیدا دەچێتە جەزائیر و کۆمەڵێک دیاردە و کولتووری جیاواز دەبینێ، کە پێیوابوو ئەگەر پێشتر

بزانیبا، ئەوا کاریگەری لەسەر تیۆرە ئابوورییەکەی دەبوو، بەتایبەتی شێوەی بەرهەمهێنانی ئاسیەوی، بەڵام تازە فریای ئەوە نەکەوت، کە قسە لەسەر ژیار و کولتووری خۆرهەڵات بکات و لەوێوە تیۆرەکەی دەوڵەمەندتر بکات، بەتایبەت سەبارەت بە ئایین، بەو وردە کولتوورانەی، کە لە ژیارە خۆرهەڵاتییەکاندا هەیە، کەواتە فرۆید وەکو هەر بیرمەندێکی دیکەی خۆراوایی شارەزایی لە بارەی خۆراواوە نەبووە، بۆیە خاوەنی ئەو تێڕوانینە بووە.

**د. محەمەد تەها حوسێن:** فرۆید لەنێو خێزانی خۆیدا هەم لەلای باوکی و هەم لەلای دایکی کەمێک نازی لەمنداڵەکانی دی زیاتر بووە، باوکی لەهەموو سەرە جەژنێکدا کتێبی پیرۆزی تەوراتی بۆی دەکردە دیاری، ئەم دیاردەیە تا گەورەبوونشیی بەردەوام بوو، لە چیرۆکەکانی تەوراتدا سەرنجی بەلای یوسف پێغەمبەردا ڕۆیشتووە، تا ئەو ئاستەی پێی سەرسام بووە، لە ڕێگەی خوێندنەوە و ئاشنابوونی بەم چیرۆکانەوە، تا ئاستێکی باشی میتۆلۆژیانە لە شارستانییەتی نیل و فیرعەونەکان نزیک بووەوە، لەوێ بیری بەو ئاراستەیە ڕۆیشت، کە موسای پێغەمبەر، وەک لە تێکستەکانی بەنی ئیسرائیل ئاماژەی بۆ کراوە، خەڵکی سەر زەمینی ئیسرائیلی ئێستە نەبوونە، بەڵکوو موسای بە نەوەی میسرییەکان زانیوە، هەربۆیە دوا کتێبی فرۆید (موسا و یەکتاپەرستی) بووە، لەتەواوی ژیانی خۆیدا، کە بەجدی بیری لەم بابەتە دەکردەوە، نەیوێرا چاپی بکات، ئەو زۆر سایکۆلۆژیانە سەیری کەسایەتی موسای دەکرد، پێیوابوو گرێی باوکایەتییە وایکردووە، کە جوولەکەکان ئایدیاڵێک لە چەشنی موسا لە فۆرمی باوک بئاخنن.

**سمکۆ محەمەد:** بەڵام من ئارگومێنتێکی دیکەم هەیە، کە پێچەوانەی ئەو قسەیەی تۆیە، بۆ نموونە ئیدوارد سەعید پێیوایە فرۆید بەهۆی ئەوەی خاوەن ترادیسیۆنێکی یەهودی، واتە جوو بووە، وای لێکردووە، کە تەنیا لەژێر کاریگەری هیومانیزم و ڕێنسانسی ئەوروپیدا بیر بکاتەوە، بۆیە بەکێشەی ئەوی دیکەوە خەریک بووە، جگە لەمەش فرۆید، کە دەڵێ موسا میسرییە، مەبەستی ئەوەبووە کە بۆ یەکەمجار موسا لەمیسر بووە و سەرچاوەی ئایینەکەش هەر میسر بووە، ئەم تێڕوانینەش جوولەکان تووڕە دەکات، ئایا بۆچی نەیوێراوە لەکاتی خۆیدا کتێبەکە چاپ بکات؟ ئەگەر بڕیار وابووە لەئایینگەرایی بترسێت و کاریگەری لەسەر تیۆرە سایکۆلۆژییەکەی نەبێت، بۆچی نەیزانیوە تیۆرەکەی لە ئایندەدا دەکەوێتە بەر ڕەخنەی بیرمەندانی دی؟

**د. محەمەد تەها حوسێن:** ئەو پێیوابوو ئەم تێڕوانینە هەڵگەرانەوەیەکی مەترسیدارە لەهەموو بنەما پیرۆزەکانی (جوویزم) واتە جوولەکەیی بوون، چونکە گواستنەوەی ئایکۆنێکی پیرۆزی وەکو موسای پێغەمبەر لەشوێنێکی باوەڕپێکراوی وەک ئیسرائیلی ئێستە کە سەرزەمینی جووەکانە، بۆ شوێنێکی دیکە زەوتکردنی ڕەهەندی شوێنە، کە ئێستە پێیدەگوترێت جوگرافیای دەوڵەتی ئیسرائیل، ئەمە بونیادێکی سەرەکی پێکهاتنی ئایینە لەنێو هەر کۆمەڵگەیەکدا، ئەمەیانە ئەسڵی هەڵگەرانەوەکەی فرۆیدە واتە فاکتەری شوێن، کە گرێیەکی مێژوویی جووەکان بووە، تا ئاستێکی زۆر دووچاری دڵەڕاوکێی شوێنی کردوونەتەوە، لەو ساتەوەختەی، کە فرۆید گومان لە شوێنی ڕەسەنی جووەکان دەکات، ئەمە خستییە بەردەم ئەو ڕق و کینەیەی، کە تاکو دوا تەمەنی کتێبەکە چاپ نەکرێت، هەربۆیە فرۆید پشتیوانی سەرەکی ئازادی هاوزمان و هاونەتەوەکانی خۆی بووە، بەڵام لە وەڵامی پرسیارێکدا، کە ئاخۆ لەگەڵ زایۆنیزم، لەگەڵ بیرۆکەکەی سیۆدۆر هێرتزل هاوڕایە، ئەو وەڵامەکەی نەخێر بووە. سەبارەت بەوەش، کە تێگەیشتنی ئیدوارد سەعید، بۆ تێڕوانینی فرۆید بۆ ئەوروپا سێنتەری بووە، من ئەمەم پێ بیرۆکەیەکی دروست نییە، چونکە ئەو ئینتیمایەکی کۆسمۆپۆلۆتییانەی لە ڕێگەی ئۆرگانی کۆمەڵەی دەروونناسانەوە نیشانی هەموو دونیا دا، لەهەموو سوچ و گۆشەیەکی دونیا، خەڵکی لەم ئۆرگانە بەئەندام وەرگرت، هەوڵیشی دەدا لقی لە زۆربەی وڵاتانی دونیا هەبێت، ئەو خاوەنی پرۆژەیەکی ئاشتیانەی سەرتاسەری بوو، بۆ کۆنترۆڵکردنی ئاستە جۆراوجۆرەکانی شەڕانگێزیی و نارسیزم لە ناخی تاکەکاندا، لە ڕێگەی ئۆرگانەکەی خۆی هەوڵی جۆراوجۆری دەدا، بۆ کردنەوەی هەموو ئەو گرێیانەی مرۆڤایەتیان تاوەکو ئێستە بەخۆیانەوە بەستۆتەوە، هەرگیز ئەم ڕوانگە تەسکەی ناوێ بۆ شارستانییەتی ئەوروپا، کە ئیدوارد سەعید وای لێ تێگەیشتووە.

**سمکۆ محەمەد:** لەئەنجامی ئەو گەنگەشەیەمان،

خەریکم یەکێک لەگرێ دەروونییەکانی فرۆید دەردەخەم، ئەویش دژیەکییەکی نێوان تاک و کۆمەڵگەیە، بەتایبەتی بیناکردنی تیۆر لەسەر ژیانی تاک لەهەموو سێکتەرەکاندا، بەڵام لێکدانەوەیەکی دی هەیە، کە فرۆید سۆسیۆلۆژیا و سایکۆلۆژیا و تەنانەت ئەنترۆپۆلۆژیاشی، وەکو دیدێکی جیاواز تەماشا کردووە، ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات، کەموکورتی لە تیۆرەکەی فرۆید هەیە، بەتایبەتی ناخود ئاگایی دەستەجەمعی کۆمەڵگە، کە زۆر جیاوازترە لەگەڵ ناخودئاگایی تاک، ئەویش بریتییە لە ڕەهەندی ڕۆحی، من بەسوود وەرگرتن لە تیۆرەکانی مارکس ئەم گەنگەشەیەت لەگەڵ دەکەم، بەو پێیەی، کە سوود وەرگرتنە لەو ستایلە ململانێ چینایەتییەی، کە ئائێستە بەردەوامە و ڕۆژ بەرۆژ زەقتر دەبێتەوە و جوانتر دەبینرێت و هەستی پێ دەکرێت لەسایەی سەرمایەداریی هاوچەرخ، یان پۆست مۆدێرن، مەبەستم ئەوەیە، کە بەلای فرۆیدەوە مەجال نییە مرۆڤ ڕیفۆڕمی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی بکرێت، بۆیە هەموو خواستەکانی بریتین لە شەڕانگێزیی و غەریزەکانی دیکەی بایۆلۆژی، کەچی بەلای مارکسەوە لە ئەنجامی گۆڕینی سیستمەوە، کە بنەماکەی ئابورییە، سیستمی کۆمەڵایەتی لەژێر کاریگەریی ژێرخانی دەوڵەت بەسەر سەرخانەوە، مرۆڤ لە قۆناغی گۆڕانی سیستمدا گۆڕانی بەسەر دێت و دەبێتە کائینێکی چاکەکاری و ئاکتیڤ و سەرەکیترین داواکاریی، ئەوانیش بریتین لە خۆشگوزەرانیی و سڕینەوەی جیاوازیی و ئەو سوپەر ئیگۆیەی، کە فرۆید لە ئەنجامی ئۆتۆبایۆگرافیدا گەیشتووە پێی، کەواتە کەموکورتی تیۆرەکە لە ناخود ئاگایی دەستەجەمعی کۆمەڵگە دایە و سەرئەنجامیش کۆمەڵگە بەگشتیی بڕیار لەسەر گۆڕانی سیستم دەدات، نەک ناخود ئاگایی تاک.

**د. محەمەد تەها حوسێن:** چەمکی ناخودئاگایی دەستەجەمعی لەلای فرۆید، بنەمایەکی سایکۆ کۆمەڵایەتیانەی هەیە، ئەو پێیوایە تاک لەنێو (مێرگەل)دا هۆش و بیرکردنەوەی سەربەخۆیی خۆی لە دەست دەدات و وەگەڵ ئاراستە دەستەجەمعیەکە دەکەوێت، لەلای ئەو هەرگیز تاک لەنێو ئاپۆرادا وەک خۆی دەرناکەوێت و ناناسرێتەوە، ناخود ئاگایی دەستەجەمعی، یان کۆ نەست، پەیوەست نییە بەمێژووی مرۆڤایەتییەوە، هەروەک دواتر (کارڵ گۆستاف یۆنگ) ئیشی لەسەر ئەم چەمکە کردووە، لەم خاڵەیاندا لە فرۆید جیابووەوە، فرۆید پێیوایە مێژووی تاک، ناخودئاگا بۆ تاک دروست دەکات، هەر لەبەر ئەوەش دۆزینەوەی گرێوگۆڵە دەروونییەکانی تاک لە مێژووی خۆیدا، دەیگەێنێتە ئەو ئازادیەی ئەو مەبەستێتی، لێرەدا فرۆید زۆر ناڕاستەوخۆیانە کار لەسەر ڕیفۆرمێک دەکات، کە ڕیشەییانە کۆمەڵگە بەپێی دیالیکتیکی زەمەنی کۆمەڵگەیی دەگەێنێتە ئازادیی، ئەگەر کەموکورتییەک لەتیۆرەکەی فرۆیدا هەبێت سەبارەت بەهاوپشکدارنەبوونی لە ڕیفۆرمی کۆمەڵایەتی، زیاد لەپێویست وردبوونەوەیەتی لە ناخی تاکەکان، هەروەک پێشتر گوتمان ئەو لە ئازادیی تاکەوە بەرەو ئازادیی دەستەجەمعی چووە، بەڵام کارڵ مارکس ڕێچکەیەکی جیاوازتری هەیە، لە ئازادیی دەستەجەمعی و چینایەتیەوە بەرەو ئازادی تاک دەچێت، سەیرییەکە لەوەدایە، وەکو پاڕادۆکسێک هەردووکیان لەتێڕوانینی مندا بوونێکی فەلسەفییان هەیە، یەکێکیان ستراتیژییەکەی بۆ تاکە و ئەوی دیکەیان بۆ کۆمەڵگە، هەردووکیان بۆ یەک ئامانجی مرۆڤایەتی کۆشاویانە، بەڵام بە دوو ڕێچکەی جیاواز، فرۆید لەکتێبی (دڵەڕاوکێ لەشارستانیەتدا) ئاماژەی بە بایەخی نەکەوتنە دەستی دەسەڵات بۆ تاکە کەس کردووە، ئەوەی لەوەڵامەکەی بۆ ئاینشتانیش دووپات کردۆتەوە کە بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە و وڵات، هەمیشە دەبێت دەستەجەمعیانە بێت، مارکسیش وەکو تیۆریسیۆنێکی سیاسیی، ئابوریی و کۆمەڵایەتی، لەخاوەندارێکی گشتیدا ئەم بایەخەی بەدیار دەکەوێت.

# ڕۆشنبیریی گشتیی

- **عەلی سەیدۆ گەورانی یەکێکە لەکەسایەتییە ناودارەکانی کوردانی ئوردن**

هۆشیار عەبدوڵڵا

- **ئاشکراکردنی مێژووی دزراو**

د. کامەران محەمەد

- **خێزان و گرنگی منداڵ**

چنار عەزیز

- **ژاوەژاوی ڕەنگاوڕەنگی نرخ**

ئەیوب سماقەیی

- **ڕەخنە وەک نشتەرگەریا ئالاڤێن ئەقلی**

موحسین ئۆسمان

# عەلی سەیدۆ گەورانی

## یەکێکە لەکەسایەتییە ناودارەکانی کوردانی ئوردن

هۆشیار عەبدوللا

بنەماڵەی (عەلی سەیدۆ گەورانی) یەکێک بوونە لەو بنەماڵە کوردانەی، کە لەباکووری کوردستانەوە، باپیرەی لەساڵی ١٨٨٠ز لەگەڵ لەشکری عوسمانییەکاندا هاتووە و کەوتوتە وڵاتی ئوردن و لەشاری (سەلت) نیشتەجێ بووە، بە رەسەن لەعەشیرەتی (دۆدکان)ی (دەشتا گەوران)ن، (دەشتا گەورا) دەشتێکی گەورەیە، دەکەوێتە نێوان شاری (دیاربکر و ئەرغەنی)

سەیدا هێژا لەساڵی ١٩٠٨ز لەشاری (عەممان)ی پایتەختی ئەردەن لەدایکبووە، لەساڵی ١٩١٦ز خراوەتە بەرخوێندن، بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە زانکۆی ئەمریکی، لە لوبنان، لە شوێنەوار و ئابووریدا وەرگرتووە، سەردەمانێک بەڕێوەبەری دواناوەندیی عەممان بووە، لەشارەکانی (ئەربد و سەلت) بەڕێوەبەر بووە، خوالێخۆشبوو عەلی سەیدۆ مرۆڤێکی زانا و نووسەر و وەرگێڕ و زمانزان و دیبلۆماتکار بووە، پاشان لەسەفارەتی ئوردن دەستبەکاربووە لە وڵاتەکانی (میسر، سووریا، یەمەن و سعوودیە) و گەلێ وڵاتی دیکەدا کاری کردووە، مامۆستای هێژا لەسەرەتای ساڵانی سییەکان گەشتێکی بۆ باشووری کوردستان کردبوو، لەو گەشتەیدا سەردانی زۆربەی شارە کوردنشینەکانی هەولێر، کۆیێ، شەقلاوە، کۆیە، سلێمانی، مووسڵ، دهۆک و ئامێدی، کردبوو، گەلەک جێگە و شوێنی دیکەی کوردستان گەڕابوو، لەشاری کۆیێ میوانی زانای گەورە و نیشتمانپەروەری کورد خوالێخۆشبوو (مەلا موحەممەدی جەلیزادە ١٨٧٦ز-١٩٤٣ز) بووە، کە سەردانی شەقڵاوەشی کردبوو، میوانی بنەماڵەی میرانی خۆشناوان ببوو، ڕێزێکی زۆریان لێنابوو.

بابزانین لەم بارەیەوە خوالێخۆشبوو (مەسعوود موحەممەد جەلیزادە ١٩١٩ز-٢٠٠٢ز) لەکتێبەکەیدا بەناوی (گەشتی ژیانم) لەلاپەڕە (٥٥٢) دا چیمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە لە ساڵی ١٩٧٨ز چووەتە وڵاتی سووریا و ئوردن لەوێ لەگەڵ (ئەبوو جومرد عەبدولمەنعیم کوردی) کە یەکێکە لە کەسایەتیە ناسراوەکانی کوردانی ئوردن و سەرۆکی (جمعية صلاح الدين الأيوبي)یە، سەردانی مامۆستا (عەلی سەیدۆ گەورانی) یان کردبوو. مەسعوود موحەممەد نووسیویەتی: زۆربەی کاتی مانەوەم لە (عەممان) هەر لەگەڵ مندا بوو، مەبەستی لە (أبوجومر الكردي)یە، ئیتر بەدنیایدا دەگێڕام و خەڵکی پێدەناساندم و بەیەکەوە چووینە لای کوردە ناسراوەکانی (عەممان) یەک لەوانە مامۆستا (عەلی سەیدۆ گەورانی) ئەدیب و نووسەر بوو، لەسییەکاندا گەشتێکی بەکوردستانی عێراقدا کردبوو، کتێبێکی لەسەرنووسی بەناوی (من عمان إلى العمادية أو جولة في كردستان الجنوبية) لەو گەشتەیدا کە هاتە کۆیێ، سەردانێکی باوکمیشی کرد، کە

لەو دەمـەدا ماڵمان لە هاوینەهەواری (چنارۆک) بوو، ژمارەیەکی زۆریشی ڕۆشنبیری ئەوسای کۆیەی لەگەڵدا بوو، دوو ڕۆژ و شەوێک مایەوە)

خوالێخۆشبوو سەیدۆ، کە گەڕاوەتەوە ئوردون کتێبێکی بەزمانی عەرەبی لەسەر گەشتەکەیدا نووسیوە و ناوی لێناوە (من عمال إلى العمادية أو جولة في كردستان الجنوبية) لەساڵی ١٩٣٩ز لەقاهیرە لە (مطبعة العادة) بەچاپی گەیاندووە، هەمان کتێب لەساڵی ١٩٩٦ز دووبارە چاپ کراوەتەوە مامۆستا سەیدۆ یەکێک بووە لە دامەزرێنەری (کۆمەڵەی خۆیبون) کە لە ساڵی ١٩٢٧ز دامەزراوە، ئەندامێکی چوست و چالاک و نوێنەری کۆمەڵەکە بووە لە وڵاتی ئوردن، کاتێک کە کۆڕی زانیاری کورد لە باشووری کوردستان لە سەرەتای ساڵانی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوودا دامـــەزرا، مامۆستا بە پەیامنێر و ئەندامی یاریدەدەری کۆڕ هەڵبژێردرا، گەلەک جاران وتار و لێکۆڵینەوە و بابەتی بەپێزی بۆ کۆڕ ڕەوانە دەکرد و لە گۆڤارەکانی کۆڕی زانیاری بڵاودەکرایەوە.

لە ساڵانی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا زۆر هاتووچۆی (پەرتووکخانەی گشتی هەولێر)م دەکرد، بەڕێکەوت بۆ خوێندنەوە ئەو کتێبەم وەرگرت (من عمان إلى العمادية أو جولة في كردستان الجنوبية) بەڕێوەبەری پەرتووکخانەکە ئەو سەردەم خوالێخۆشبوو (عەبدوڵڵای شێخ عەبدولکەریمی) بوو یادی بەخێر، کە دەکاتە برای مامۆستا (شێخ عەبدولڕەحمان) پێشنوێژ و وتارخوێنی مزگەفتی ئازادی شاری هەولێر.

هەنووکە نیشتەجێی وڵاتی نەرویجە. کاک عەبدوڵڵا پێیگوتم تەنیا ئەو نوسخەیەمان هەیە، پاش هەفتەیەک دووبارە چوومەوە بۆ وەرگرتنەوەی ئەم کتێبە، کەچی فەرمانبەری پەرتووکخانەکە، کە کابرایەکی میسری بوو، گوتی نییە، پێمگوت یانی وەریان گرتییە، گوتی: نەخێر، گوتم: من هەفتەیەک نابی ئەو کتێبەم ئیستیعارە کردووە!. گوتی کاکە نەمایە، منیش زۆرم لاسەیر بوو، هەرچۆنێک بوو کابرای میسرێ تێیگەیاندم کە ئەو کتێبە و لەگەڵ چەند کتێبێکی دیکەدا (ئەمنی هەولێر) بردوویەتی، کەوام بیست منیش بێدەنگ بووم. مامۆستا سەیدۆ لەساڵی ١٩٩٢ز لەشاری (عەممان) کۆچی دوایی کردووە و هەر لەوێش نێژراوە دوو کوڕ و چوار کچی هەیە، کوڕەکانی (مازن) لەو ساڵانەی دوایی مردووە، دکتۆر (ئەشرەف)یش کە باشترین و بەناوبانگترین دکتۆرە، ئێستە لە (عەممان)ی پایتەختی ئوردن نیشتەجێیە بە (دکتور أشرف الكردي) بەناوبانگە سەردەمانێک وەزیری تەندروستی ئوردەن بووە، کچەکانی (هیام، نەسرین، نەرمین و شەرمین) برایەکیشی ماوە ناوی (ئیحسان سەیدۆ)یە، لە کتێبەکانی ئەوانەی، کە بەچاپ گەیاندراون ئەمانەن:

١- من عمان الى العمادية أو جولة في كردستان الجنوبية.

٢- من عمان إلى مالاتيا (ملاطيا)

٣- القاموس الكردي الحديث.

٤- اللر واللرستان

٥- أمير بدرخان، لەتورکییەوە وەرگێڕاوەتەوە سەر زمانی عەرەبی و لەساڵی ١٩٧٧ز بەچاپی گەیاندووە.

**سەرچاوەکان: بۆ نووسینی ئەم بابەتە سوودم لەم** سەرچاوانەی خوارەوە وەرگرتووە.


١- من عمان الى العمادية أو جولة في كردستان الجنوبية.

٢- گەشتی ژیانم، مەسعوود محەمەد، چاپی یەکەم، ستوکهۆلم، ١٩٩٢ز.

٣- گۆڤاری پێشەنگ، ژمارە (٢).


**• ئەگەرچی لە زۆربەی سەرچاوەکان ناوەکەی بە (عەلی سەیدۆ گۆرانی) نووسراوە، بەلام نووسەری ئەم بابەتە ناوەکەی بە (عەلی سەیدۆ گەورانی) نووسیوە. دیوان**

# ئاشكراكردنی مێژووی دزراو

(مێژووی دزراو) بە خاڵی دەستپێکی گفتوگۆیەکی گرنگ دادەنرێت، دەربارەی ڕاست، هەڵە، ئاکار و ڕاڤە جیاوازەکان بۆ مێژوو. ئەمەش بەشێوەیەکی گشتی دوو ئاست دەگرێتەوە، ئاستی دەرەکی و ئاستی ناوخۆ.

مەبەست لە ئاستی دەرەکی ئەوەیە، کە ئەو وڵاتانەی ڕۆژگارێک فەرمانڕەوایەتیی ئەوانی دیکەیان کردووە، دەبێ چۆن کاروبارەکان چاکبکەنەوە و بیانخەنەوە سەر بارە سروشتییەکەی خۆیان. چونکە ئەوان میراتی کلتووریی و شوێنەوارەکانیان دزیوە.

نەتەوە و دەوڵەتگەلێکی دیکە. سەرەڕای دزینەکەش بانگەشەی خاوەندارێتییان کردووە! ئەم چەمکەی (مێژووی دزراو) زۆرجار پەیوەستە بەو نموونانەی، کە هێزە کۆلۆنیالیزمەکان، یان گروپەکانی دیکە، شوێنەوارە مێژوویییە بەنرخەکان، یان شتومەکی کلتوورییان لە گەلانی دیکە وەرگرتووە، واتە بەبێ ڕەزامەندی، یان قەرەبووکردنەوەیەکی دروست.

ئەم پرۆسەیە دەتوانێت (شێواندن) یان (کوێرکردنەوەی مێژوو) و (دەستکەوتەکان)ی گروپێک لەخۆبگرێت، کە دەیتوانی کاریگەرییەکی بەرچاوی کلتووریی و کۆمەڵایەتی هەبێت.


د. کامەران محەمەد

مەبەست لە ئاستی ناوخۆش ئەوەیە، کە لە ناوخۆی (کۆمەڵ، کۆمەڵگە و دەوڵەت) ێکی دیاریکراودا ڕوودەدات، واتە (کەسێک، یان گروپێک، یان پارتێک و ...تاد) بەهۆی هۆکاری هزریی، سیاسیی، ئابووریی، کۆمەڵایەتیی و ...تاد هەوڵدەدات (بوون، ناو، ڕۆڵ، کاریگەرێتیی، دەستکەوت)ی کەسایەتییەک، یان بنەماڵەیەک، یان کۆمەڵێک، یان ڕەوتێکی دیاریکراو و ...تاد بشێوێنێت یان فەرامۆشی بکات، یان ونی بکات، هەموو ئەمانەش بەمەبەستی سڕینەوەی مێژوویەک ئەنجام دەدرێن.

ئاشکراکردنی مێژووی ڕاستەقینەی کەسایەتییەک، یان کۆمەڵێک یان نەتەوەیەک و...تاد، کە مەبەستدارانە شێوێنرابێت، یان سڕابێتەوە، یان ونکرابێت، دەتوانێت گرنگیی و کاریگەرییەکی قووڵی لەسەر هەردوو ئاستی تاکەکەسی و دەستەجەمعی هەبێت. ئەم کردەیە دەتوانێت لایەنە شاراوەکان یان ناسنامە و ئەزموون و بەشدارییەکانی پاڵەوانێک بخاتەڕوو، کە بەهۆی گێڕانەوە مێژووییەکانەوە (مەبەستدارانە) فەرامۆشکراون، یان شێوێندراون، یان شاردراونەتەوە.

لەبەرئەوە، یەکەم خزمەتێک، کە ئەو ئاشکراکردنە دەیکات، بریتییە لە گەڕاندنەوەی شوناس و ناساندنی ئەو کەسایەتییە، واتە ڕوداوەکان دەخاتەوە خانەی ڕاستەقینەی خۆیان و دەستکەوت و بەشدارییەکانیان پشتڕاست دەکاتەوە. هاوکات کۆتایی بەو ستەمکارییە دەهێنێت، کە لەلایەن مێژوونووسەکانەوە بەرانبەر کارەکتەرە ڕاستەقینەکانی مێژوو کراوە، چونکە ئەوە ئاشکرایە لە زۆر باردا شێواندنی مێژووی کەسایەتییەک لە ئەنجامی لایەنگریی میتۆدیی، یان هەوڵی بە

ئەنقەست بۆ پەراوێزخستنی هەندێک گرووپ، یان تاک بووە. بۆیە کۆمەڵگە بە ڕاستکردنەوەی ئەم نادادپەروەرییە مێژووییانە دەتوانێت ڕووبەڕووی هەڵەکانی ڕابردوو ببێتەوە و کار بۆ تێگەیشتنێکی گشتگیرتر و وردتر لە مێژوودا بکات.

لە ڕوانگەیەکی دیکەوە دەشێت ئەم ئاشکراکردنە ئیلهامبەخشین بێت بە کۆمەڵگە پەراوێزخراوەکان، بەو واتایەی کاتێک مێژووی ڕاستەقینەی کەسایەتییەک، یان نەتەوەیەک دەردەکەوێت، دەتوانێت ببێتە سەرچاوەی ئیلهام و سەرمەشق بۆ پێکهاتە پەراوێزخراوەکان و تەواوی ئەو کۆمەڵەی بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەشاردنەوەی ڕاستییەکان چەواشەکراون، واتە لەباتی ئەو تێڕوانینە نەرێنییەی بەرانبەر بە مێژووەکەیان لەلایەن چەند کارەکتەرێکی ساختەوە بۆیان دروستببوو، نموونەیەکی ئەرێنی و جیاوازیان پێشکەش دەکات، ڕێگە بە تاکەکان دەدات شانازی بە ڕەگ و ڕیشە و بەشدارییە کلتوورییەکانیانەوە بکەن.

کردەی ئاشکراکردنی مێژووی ونکراو ڕۆشنایی دەخاتە سەر پرسە بەرفراوانەکانی نووسینی مێژوویی، هاوکات توێژەران هان دەدات، لێکۆڵینەوەی ڕەخنەگرانە لە گێڕانەوە مێژووییە باوەکان بکەن، بوونی دیدێکی گشتگیرتر و هەمەچەشنتر بۆ مێژوو بە پێویست دادەنێت.

بەئاشکراکردنی مێژووی شێوێندراوی کەسایەتییەک، دەرفەتێک هەیە بۆ چارەسەرکردنی لایەنگرییە میتۆدییەکان و زەمینەیەک دەڕەخسێنێت، کە توێژەران بەوپەڕی وریاییەوە مامەڵە لەگەڵ ئەو مێژووەدا بکەن، کە بارگاوییە بە (بەرژەوەندییە کەسیی و بنەماڵەیی و گرووپییەکان) و (ئایدۆلۆجیا) و (ماستاوچێتی) و ...تاد.

ئەوەی گرنگە ئاماژەی بۆ بکەین ئەوەیە، مێژوویەک بە مەبەستی دابەشبوون، یان ململانێ شێوێندرابێت، ئەوا ئاشکراکردنی ئەو مێژووە دەتوانێت هەنگاوێک بێت بەرەو ئاشتەوایی. ڕێگە بە تێگەیشتنێکی گشتگیرتر لە ڕابردوو دەدات و دەرفەتێک بۆ نەهێشتنی دابەشبوونەکان دەڕەخسێنێت.

دەبێت ئەوەشمان لە یاد بێت، پەردەلادان لەسەر مێژوویەکی شێوێندراو، تەحەدای یادەوەریی کلتووریی باڵادەست دەکات و ئەوە ڕوون دەکاتەوە، تا سەر هیچ جۆرە هێزێک ناتوانێت ڕاستییە مێژووییەکان بۆ هەمیشەیی بشارێتەوە و ڕۆژێک دەبێت ڕووی ڕاستەقینەی ئاشکرابێت.

**مێژوویەک بە مەبەستی دابەشبوون، یان ململانێ شێوێندرابێت، ئەوا ئاشکراکردنی ئەو مێژووە دەتوانێت هەنگاوێک بێت بەرەو ئاشتەوایی. ڕێگە بە تێگەیشتنێکی گشتگیرتر لە ڕابردوو دەدات و دەرفەتێک بۆ نەهێشتنی دابەشبوونەکان دەڕەخسێنێت**

# خێزان و گرنگی منداڵ

**بەرپرسیارێتی منداڵ لەگەڵ لەدایکبوونیدا دروست نابێت و کتوپڕیش فێری نابێت، بەڵکو وەک فێربوونی مۆسیقا وردە وردە لەڕێگەی مەشق و ڕاهێنانەوە، لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی دایک و باوک لە ناو خێزاندا فێر دەبێت**

منداڵ لەناو ژینگەی خێزانیدا پەروەردە دەبێت و گەشەی هزری و جەستەیی پەرە پێ دەدات، بۆیە گەشەکردنی منداڵ پەیوەندییەکی پتەوی هەیە بەژینگەی کۆمەڵایەتی خێزانەوە. ئەمەش پێویستی بەژینگەیەکی ئارام و خێزانێکی باش هەیە.

لێرەدا ڤیگۆتسکی و ژان ژاک ڕۆسۆ پێچەوانەی یەکترن. ڤیگۆتیسکی ڕەخنە لە (ژان ژاک ڕۆسۆ) دەگرێت، چونکە منداڵ دەداتە دەستی ژینگە، چونکە ڤیگۆتیسکی پێیوایە، کە دەبێت بۆ باشترکردنی دۆخی منداڵ، ژینگەی بۆ چاک بکرێت. واتا لێرەدا ئینتراکسیۆنی کۆمەڵایەتی گرنگترینە چونکە مرۆڤ کاتێک لەژینگەیەکی کۆمەڵایەتیدا پەروەردە و گەورە دەبێت، لەگەڵ کەسانی دەوروبەر توانای هزریی و جەستەیی باشتر گەشە دەکات، چونکە توانای بیرکردنەوەکان و قسەکردنی مرۆڤ پەیوەندی بەژیانی کۆمەڵایەتییەوە هەیە.

کەواتە دۆخ و ژینگەی خێزانیی، ڕۆڵێکی گەورەی لەسەر ژیانی تاک هەیە، چونکە لەو ژینگە خێزانییە وەردەگرێت و کاریگەریشی لەسەر ژینگەی دەرەوەی دەبێت. لەبەر ئەوەی منداڵ هەموو هەڵسوکەوت و ڕۆشنبیرییەک لە پەیوەندییە خێزانییەکانەوە وەردەگرێت، کە ڕەنگدانەوەی لەسەر پەیوەندییەکانی لەدەرەوەی خێزان دەبێت، چونکە کاتێک لەدەرەوەی خێزان، لە فێرگە، یان لە کۆڵان منداڵ بەشداری کار و یاریی هاوبەش دەبێت، بەنموونە تۆپی پێ و یاخود گفتوگۆ کردن و گۆڕینەوەی بیروڕای جیاواز لەگەڵ یەکتر، هەموو ئەمانە کاریگەری بەسەر یەکترەوە جێدەهێڵن.

هەربۆیە دەتوانین بڵێین، کە منداڵ بەپێی ئەو پەروەردەیەی خێزان پێیدەبەخشێت شێوە وەردەگرێت. بەقسەکردن و هەڵسوکەوت و ڕاگۆڕینە، دواجار هەموو ئەمانە لەگەڵ دەوروبەر و هاوڕێ و هاوپۆلەکانی بەکار دەهێنێت. دایک و باوک لەو کاتەی، کە منداڵە دێتە دونیاوە تا ئەو ڕۆژەی دەمرن، پەیوەندییان لەگەڵ منداڵەکانیان بەردەوامە، لەبەر ئەوە پێویستە بەردەوام خۆشەویستی و ڕێز بۆ منداڵەکانیان دەربڕن، بەجۆرێک مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت، کە هەست بکەن ڕێزیان لێ دەگیرێت. بەمەش دەتوانن منداڵەکانیان لەکاری خراپ دوور بکەنەوە و متمانە و بڕوا بەخۆبوونیان زیاتر لا دروست بکەن. چونکە ئەگەر متمانە بەخۆبوونیان لەلا دروست بوو، ڕەخنەیان لێ بگیرێت، زۆر ئاسایی وەریدەگرن و پێی بچووک نابنەوە. بەهەمان شێوە ستایش بکرێن خۆیان زاڵ و زل ناکەن بەسەر منداڵانی دیکەوە. بۆیە دەبێ ئەوە بزانین، کە هەموو وشە و دەربڕینێکی دایک و باوک بەرانبەر منداڵ کاریگەری لەسەر دەروون و کەسایەتی منداڵ دادەنێت و لە گەورە بوونیاندا لەگەڵ دەوروبەر هاوڕێ و هاوپۆلەکانیاندا دەری دەبڕن.

ستایشکردنی منداڵ وەک ئامۆژگاری پزیشک بۆ نەخۆش وایە بەڵام دەبێت سنووردار بێت، چونکە زیادوکەم زیان بەمنداڵ دەگەیەنێت، زۆر ستایشکردن، ئەو هەستە لای منداڵ دروست



چنار عەزیز

دەکات، کە تایبەتە و خۆی لەمنداڵانی دیکە جیاوازتر دەبینێت و خۆی بەلاوە گرنگترە، چونکە ستایشکردن بە بەرگری کردنی خێزانەکەی لەخۆی دەزانێت و وا هەست دەکات بۆ هەر دۆخێک، کە لەژینگەی دەرەوە ڕووبەرووی دەبێتەوە، خێزانەکەی بەرگری لێ دەکەن. ژینگەی دەرەوەش وەک ژینگەی ماڵەوە دڵنەرم نییە، پڕە لەپەروەردەی جیاواز و ژینگەیەکی دڵڕەق، بۆیە کاتێک دەڕواتە نێو ژینگەی دەرەوە دەبینێ بەو جۆرە نییە، کە ئەو پێشبینی کردووە، ئەمەش هەستی متمانە بەخۆبوونی لاواز دەبێت و چیدی متمانە بەدەووروبەر ناکات. بێگومان ئەمەش دابڕانی بەدوادا دێت، وای لێ دەکات لەگەڵ هاوڕێکانیدا نەگوجێت، ئەوانیش هاوڕێیەتی نەکەن، بەمەش هاوڕێیەتی سنووردار دەبێت.

ستایشی ڕاستەوخۆی منداڵ وەک تیشکی ڕۆژی ڕاستەوخۆ وایە، کە باش نییە و لەوانەیە ببێتە هۆی کوێر بوون. زۆرجار لەنێو خێزاندا کاتێک منداڵ هەڵەیەک دەکات، خێزان بەو ڕێگەیەی خۆی، کە مەبەستیەتی دەیەوێت هەڵەکەی بۆ ڕاست بکاتەوە، وەک ئامۆژگاری کردن بەو جۆرەی کە دایک و باوک مەبەستیانە، دەشێت ئەو ئامۆژگارییە قورس بێت لای منداڵ، یان تەمبێ کردن، یان بەدرۆخستنەوە، هەڕەشە لێکردن، ئەمەش جۆرێکە لەتێکشکاندنی منداڵ.

هەموو ئەمانە دەچنە جێگەی خۆشەویستی و پەیوەندی هاوڕێیانەی دایک و باوک و منداڵ، ئەمەش متمانە ناهێڵێت لەنێوان منداڵ و دایک و باوکدا، لەبەر ئەوە پێویستە بەڕێزەوە مامەڵە لەگەڵ منداڵدا بکرێت تەنانەت لەو کاتانەشدا کە ڕەفتارێکی خراپ دەکەن، چونکە ئەم مامەڵەیە دەبێتە هۆکاری بەردەوامی مانەوەی ڕێز و خۆشەویستی نێوان دایک و باوک و منداڵەکانیان.

کەواتە منداڵ ئەوە فێر دەبێت، کە تیایدا دەژی، هەلومەرجی ژیان بارودۆخی نێو خێزان و فێرگە منداڵ فێر دەکات. نەک بەتەنیا ئامۆژگاری. واتا منداڵ زیاتر لە ڕێگەی بینینەوە، نەک بیستن فێر دەبێت. کاتێک منداڵ لەژینگەیەکی پڕ کێشە و سەرزەنشتکرن و ڕەخنەگرتندا گەورە دەبێت، هیچ فێر نابێت و تواناکانیان بەگوێرەی ئەو ژینگە خێزانییە دەبێت کە تیایدا ژیاوە. بۆیە کاتێک دایک و باوک یان گەورەیەکی دیکەی ناو خێزان ڕەخنە لە منداڵ دەگرێت، وەک ئەوەی کە دەڵێت: تۆ نابێت بەهیچ، هاوڕێکەت، براکەت، لەتۆ بەتواناترە، یان وریاترە، ئیدی منداڵ بەکەم تەماشایی خۆی دەکات و هەست بەتێکشکانی دەروونی دەکات لەنێو کۆمەڵگەدا، تەنانەت لەنێو هاوڕێ و فێرگەشدا بەکەم خۆی دەبینێت، وا هەست دەکات ئیدی توانای ئەنجامدانی هیچ کارێکی نییە، تەنانەت لە مەجالی خوێندنیشدا ناتوانێت سەرکەوتوو بێت، چونکە دایک و باوک چۆن منداڵ وێنا دەکات و دەیبینێت، ئەو بینینە دەبێتە شتێکی ڕاستی لای منداڵ، ئیدی بەو جۆرە کەسایەتییە دەچێتە نێو کۆمەڵگە.

بەمجۆرە منداڵ بڕوا بەکەسایەتی خۆی ناکات و خۆی بەبچووک و بڕوا بەخۆنەبوو شکل و شێوەی وێنا دەکات. مۆزیکژەنی بەناوبانگ (پابلۆ کاسلز) کە زۆر گرنگی بەکارە مرۆییەکان داوە، لەسەر منداڵ دەڵێ: ئەوە بەس نییە، منداڵ فێر بکرێت، دوو و دوو یەکسانە بەچوار، پێویستە منداڵ بەهەند وەربگیرێت، پێویستە منداڵ نەشکێنرێت، ورد و خاشکردنی هەستی منداڵەکانمان برینێکی قووڵ دروست دەکات لەناخ و هەستیاندا، کە بەدرێژایی ژیانیان سارێژ نابێت.

بۆیە دەبێ ئەوە بزانین، کە بەرپرسیارێتی لای منداڵ لەگەڵ لە دایکبوونیدا دروست نابێت، بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی و کتوپڕیش فێر نابێت و وەرینناگرێت، بەڵکوو بەرپرسیارێتی وەک فێربوونی مۆسیقا وایە، وردە وردە لەڕێگەی مەشق و ڕاهێنانەوە، یان لە ڕێگەی هەڵسوکەوتی ڕۆژانەی دایک و باوک لەنێو خێزاندا فێر دەبێت، بەرە بەرە بەپێی تەمەن بەرپرسیارێتی لای منداڵ زیاتر دەبێت، هەستکردن بە بەرپرسیارێتی لە منداڵدا بەئازادبوونی لە دەربڕینەکاندا گەشە دەکات، هەتا زیاتر ئازادی بۆ فەراهەم بکرێت و گوێ لەدەربڕینەکانی بگیرێت، زیاتر هەستکردن بە بەرپرسیارێتی گەشە دەکات.

منداڵ پێویستە لە هەڵبژاردنەکاندا ئازاد بێت، چۆنی بوویت، وابێت. پێویستیشە دایک و باوک جیاوازیی لەنێوان دەربڕین و بڕیارەکاندا بکەن و لێکیان جیا بکەنەوە. هەندێک مەسەلە هەیە بەتەواوەتی دەکەوێتە نێو سنووری بەرپرسیارێتی منداڵەوە، لێرەدا منداڵ پێویستە بەتەواوەتی ئازاد بێت و لەبڕیارەکانیدا ڕێگەی لێ نەگیرێت.

تێبینی: بۆ نووسینی ئەم وتارە سوود لەکتێبی (پەروەردەکردنی نموونەیی جگەرگۆشەکانمان، دکتۆر هایم جینۆ، وەرگێڕانی، جیهاد موحەمەد) وەرگیراوە.

ئەیوب سماقەیی



# ژاوەژاوی ڕەنگاوڕەنگی نرخ

بازاڕی ڕەش نرخی ئالوێری دینار بەرانبەر دۆلار دەسەپێنێت و دەبێتە هۆی نەبوونی ئیستقراری نرخی ئالوێری دۆلار بەرانبەر دیناری عێراقی، بەڵام ئەگەر وردببینەوە، دەبینین هۆکاری ئەمە بە تەواوی و سەدلەسەد ئابووری نییە، واتە هۆکاری جێگیرنەبوونی نرخی ئالوێری دینار بەرانبەر دۆلار سەدلەسەد ئابووری نییە، لەبەرئەوەی یەدەگی بیانی عێراق بەشی زیاتر لە ١٤ مانگ دەکات بۆ هێنانی کاڵا لە دەرەوەی عێراق، ئەمەش بەپێی ئاماژەی توانستی دراوی بیانی، کە بریتییە لە ٣ مانگ وەک ئاماژەیەکی ستاندەردی جیهانی توانایەکی زۆرە. ئەگەر لە جوگرافیای سیاسی عێراق وردببینەوە، دەبینین کەرتی تایبەت لە عێراق بەرێژەی زیاتر لە ٣٠٪ کاڵا لە سنوورەکانی ئەو وڵاتە دراوسێیانە دەهێنێتە عێراق، لە بەرانبەر نەبوونی، یان ڕێژەیەکی زۆر کەمی ناردنەدەرەوەی کاڵا، ئەمەش وادەکات گرفتە ناوخۆییەکانی نرخی ئالوێری تومەنی ئێرانیی و لیرەی تورکیی لە ناوخۆیی عێراق ڕەنگبداتەوە، لاسەنگییەگی بازرگانیی زۆر زەق دروستبووە و بۆتە هۆی دروستبوونی کورتهێنان لە تەرازووی بازرگانی عێراق، لەگەڵ هاوبەشە بازرگانییەکانی، ئەم لاسەنگیی و بازرگانییە ناهاوسەنگە پێویستی بە دابینکردنی بەردەوامی دۆلارە، لە بازاڕی ڕەش، لەبەر کۆتوبەندی نێودەوڵەتی، کە ناوچەی دۆلار دەیسەپێنێت بەسەر عێراق و بەسەر تەحویلی دەرەکی دۆلار بەهۆی بوونی ئەو جوگرافیا سیاسییەی عێراق هەیەتی. لەگەڵ ئەم لاسەنگی بازرگانییەش دەبینین، هەڵبەزین و دابەزینی گەورە نییە لە ئاستی گشتیی نرخ لە بازاڕەکانی عێراق و کوردستان.

سەرباری ئەمانەش هەڵاوسانی یەککر نییە، بەڵام بەردەوام جیاوازیی هەیە لەنێوان نرخی ئالوێری فەرمی و نرخی ئالوێری بازاڕی ڕەش، کە جۆرێک لە پێشبینی هەڵاوسانی نرخ لێرە و لەوێ لەسەر چەند کاڵایەکی جیاواز دروست دەبێت، ئەمەش بەپێی نەرمی دەستهات.

ئەم ئالۆزییە بە بەردەوامی، یان بە پچڕپچڕ ژاوەژاوی نرخی دروست دەکات، دیاردەی ژاوەژاوی ڕەنگاوڕەنگی نرخ ئاماژە بۆ ئەو زانیاری، یان چالاکییانە دەکات، کە ئاڕاستە بنچینەییە ڕاستەقینەکان دەشێوێنێ، یان دەشلەژێنێ.

لە بازاڕی دارایی دەکرێ ژاوەژاو ئەو جووڵە بچووکانەی نرخ و ئەو ڕاستکردنەوانە بگرێتەوە، کە ئاڕاستە گشتییەکە دەشێوێنن. لەوانەیە ژاوەژاوی بازاڕیش کارێک بکا و لێنەگەڕێ بزانین چ شتێک پاڵ بە ئاڕاستەکەوە دەنێ یانیش بزانین داخوا ئاڕاستەکە تەنیا لەبەر بارگۆڕینە مەودا کورتەکان تووشی کێشە دەبێ و دەگۆڕێ، یاخود نا، ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی لامان ڕوونبێت، کە بەرچاومان ڕوون نییە لە دیاریکردنی ئاڕاستە گشتییەکان و نازانین پاڵنەرە سەرەکییەکانی دیاریکردنی ئاڕاستە گشتییەکان چین، و نازانیین ئەو بارگۆڕانانە مەودا کورتن، یان بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوام دەبن، بۆیە شارەزایانی ئابووری ناوێرین ڕەئی بدەن، ئەمەش وادەکات دیاردەی مام سەیدەکان دروست لە هەرێم دروست بێت.

سیاسەتی نەختی بەنکی ناوەندی عێراق، کە سیاسەتی دەلاقەی دراوی بیانییە ناتوانێت کاریگەریی بەرهەمهێنی زۆر دیار لەماوەی دیاریکراودا دروست بکات، واتە کاریگەرییەکانی لە مەودای کورتدا کەمن، ئەم کەم کاریگەرییەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هۆکارانەی، کە دەوری سیاسەتی نەختی عێراقیان داوە و لێناگەڕێن سیاسەتی نەختی بە تەواووی کاری خۆی بکات و کاریگەری خراپیان لەسەر ویستقالیەی نەختی عێراق هەیە، وەک:

١- بوونی دیاردەی بەدۆلارکردن ، خەلک مامەڵە بە دۆلار دەکات لەبری دیناری عێراقی، لەبەر کەمی تێچوونی مامەڵەکردن و هەڵگرتنی دۆلار و کەمی مەترسیی هەڵاوسانی نرخ بە بەراوورد بە دیناری عێراقی، بەکورتی زیاتر متمانەیان بە دۆلاری هەیە.

٢- کۆتوبەندی نێودەوڵەتی، کە ناوچەی دۆلار دەیسەپێنێت بەسەر عێراق و بەسەر تەحویلی دەرەکی دۆلار بەهۆی بوونی ئەو جوگرافیا سیاسییەی عێراق هەیەتی.

٣- بوونی سیاسەتێکی بازرگانیی نیمچە ئازاد لە عێراق بەگشتیی، بە کوردستانیشەوە.

٤- بوونی سیاسەتێکی دارایی بە میکانیزمی گومرگی و باجی لاواز.

٥- بوونی ئەنجوومەنی دراو، کە لە زۆربەی کاتەکاندا کارگەریی خراپ لەسەر سەروەری (ویستقالیەی نەختی) دروست دەکات.

٦- جوگرافیای سیاسیی عێراق، کە هاوسنوورە لەگەڵ ئێران و تورکیا و سوریا.

ئەم شەش هۆکارە کاریگەریی خراپیان لەسەر سەروەری سیاسەتی نەختی عێراق هەیە، وادەکەن سیاسەتی نەختی بەتەواووی کاری خۆی نەکات و ئامانجەکانی لە کەمترین کات نەپێکێت، لە لایەکی دیکەشەوە دیاردەی ژاوەژاوی ڕەنگاوڕەنگی نرخ دروست بکات، ژاوەژاوی ڕەنگاوڕەنگی نرخ وایکردووە مام سەیدەکان لێدوان بدەن، شارەزایانی ئابووریش بەدیار شاشەکان دانیشن و سەیریان بکەن .

**هەولێر ٢٠٢٣/١١/٢٩**

# ڕەخنە وەک نشتەرگەریا ئالاڤێن ئەقلی

پەیڤا ڕەخنە ب زمانێ گریگی، ب واتەیا سەربۆر/ تاقیکرن دهێت، لەورا ڕەخنە ب خوە ژی جورەکێ هۆستایی و دیالێکتیکا ئەقلیە. پرانیا پەرتووکێن ئەرد و ئۆلان، ل سەر پرۆسێسا «پەروەردە، ڕەخنە و ئاراستەکرنێ» ڕاوستیاینە. مەبەست ژ ڕەخنێ، وەک مێتۆد و فۆرمێ نێرینا تەڤ لایێن «ڕەوشەنبیری، ئەقل، هزر و شێوازێ ژیانێ»یە. ڕاستە هەر تشتەک ل بەر ڕەخنێ، تێهزرکرن و دارێژتنێیە، بەلێ پا دڤێت ئەڤە ژی بکەڤیتە هێلا ئالاڤێن مێتۆد و ڕێکێن نێرینێ، داکو خواندنێن ئەقلانی و دیرۆکی بەرهەم بینیت.

گەلۆ جڤاکەکا ڤەکری، بێی پرۆسێسا ڕەخنەکا ئەقلانی دهێتە سازدان؟ هەر ژ سەردەمێ ڕێنیسانسێ و تا نوکە، ڕەخنە ل ئۆروپا وەک تێگەهەکێ فەلسەفی، ب پالپشتیا تەڤگەرێن سیاسی و پرۆسێسا هزری هاتیەکرن. جیهانا هزران، بێی ڕەخنە و ڕاڤەکرنا ژێدەر و ڤەگەرێن ئەڤ ڕەوشە درستکری، ناهێتەکرن. لەورا ڕەخنە ل ئۆروپا، پرۆسێسەکا بەرچاڤا گوهەرین و ئاراستەکرنا پێشکەتنا ئۆروپا دکەت، چونکو ڕەخنە ڕێکێ ل هەمبەر وەرارا هزر و فەلسەفێ خوەش دکەت. دڤێت ئێدی ئەم ژ ڕەخنا هزران، بچینە ڕەخنا ئەقلان. سەربارێ ڕەخنا هزرێ ب خوە ژی ڕەخنا ئەقلیە، چونکو تەڤایا ڕەخنان، ژ ئالاڤێن ئەقلی دەسپێدکەن.

ئەرێ ئەم دکارین ب چ ڕێزانی و هشمەندی، کاودانان سەراست بکەین: «ب ئەقلەکێ ڕەخنەگری، یێ کو بکاریت پەردێت وەهمێ کرێت بکەت؟ دیارە یەک ژ پێنگاڤێن چارەسەریا ڤێ ڕەوشێ، ب خورتکرنا «زانستێن جڤاکی» دهێتەکرن، یاکو دکاریت ڕێکێ ل بەر ئەقلێ ڕەخنەگر خوەش بکەت و ل داویێ ژی ئەڤ ئەقلە دکاریت ڤێ ڕەنگێ هشیاریا سەختە کرێت بکەت. مخابن مە هێشتا ڕەخنا هزران، ژ ڕەخنا کەسان جودا نەکریە. ئێدی ڕەخنێن هزرێ و فەلسەفێ، مەرجێن سەرەکێن پرۆسێسا پێشکەتن و گوهەرینا جڤاکانە، چونکو ئەقلێن ڕەخنەگر، دکارن پەردێ خاپاندنێ کرێت بکەن. هەروسا ژی، مرۆڤ دکاریت ب ڕێکا ڕەخنێ، دەسنیشانا نەساخی و قەیرانێن جڤاکی بکەت. پێشکەتنا هزریا ڕەخنێ، یاکو سەنتێن پۆست نژیارگەری ڕێک بۆ خوەشکری، دووبارە واتەیا گرێدایی دیرۆک، دەم و جهی ڤەژەنی. لەورا ئەڤ شوپ و کەشێن هوسا، بیاڤێن ڕەخنێ د تەڤایا واران دا خوەش دکەن. ب ڤی ئاوایی، ڕاڤەکرنا ئەقلی ب چەند پێکول و ڤەکۆلینێن هزری هاتیەکرن، یاکو ڕێک ل بەر ڕەخنە و هلسەنگاندنێن ئەقلی دەشتکری.

دیرۆک و جڤاکێن بێ ڕەخنە، خوە ب ئاوایەکێ تراژیدی دووبارە دکەن، چونکو ڕەخنە فورمەکێ سەراستکرن و ئاراستەکرنێیە. لەورا ڕەخنا ئەم دخوازین ب واتەیا «کوژتنا بابی»، وەک فروید دڤێت یان ژی مینا ڕۆلان بارت ب «کوژتنا دانەری» بۆ چووی، کو جودایی ڕەخنا ب واتەیا خوەشیا ئەز هەمە. ئێدی ئەوێن هەردەم دبێژین «خوەدێ، پێغەمبەری و سەرۆکی، وها گوتیە، ب واتەیا وان هێشتا خوە ژ هەژمۆن و کوژتنا بابێ ڕزگار نەکریە.

مەبەست نە گوهەرینا تێتال و ڕەوشتان ب ئاوایێ ڕەهـ و ڕیشالی، بەلکو ب ڕێکا مفا وەرگرتن و هەڤبەرکرنا دگەل کولتورێن دی‌یە، کو ب ڕێکا ڕاستڤەکرنا کولتورێ مە، دا ڕاستێ کێماسیێن سەرەدەریا دگەل ڤێ هەوا پێشکەتنێ نەهێت.

ڕاستە ڤاڤێرتنا فەلسەفا ڕەوشەنبیریێ، نە گرێدایی فۆرمێ خوەیێ ئۆنتۆلۆگی یان مێتافیزیکیە، بەلکو بەرچاڤێ شێوێ خوەیێ ئەرکی و ڕەخنەیی‌یە! دیارە ڕەخنە ژی، هێشتا ل نک مە نەبوویە پێکهاتەکا سەرەکیا تێهزرکرنێن فەلسەفێ و هزری. ئەڤێ یەکێ ژی، ڕێکخوەش نەکریە ڕەخنەگر پەیدا ببیت، چونکو ڕەخنە ب خوە پرۆسێسەکا هزری/ جڤاکیە، بەرێ ببیتە یا ئەدەبی.



موحسین ئۆسمان

گەلۆ ب ئەقلەکێ ڕاڤەکاری، کو ب واتە و

هەمبێزکرنی مزگینیێ بدەتە مە؟ یان ژی ب ئەقلەکێ هلوشگەری ل ئۆرتێن کێماسی، بێدەنگ و ڤالا بگەرینیت؟»(١).

ئەرێ بۆچی هزرەکا گونجاڤ، دگەل دوورهێلی نەهاتە دامەزراندن؟ دیارە بەرسڤێن ڤان جورە پرسیاران، دخوازنە رەخنەگرێن زانا و هزرمەند، کو بکارن جڤاکێ شرۆڤە بکەن و خالێن لاواز دەسنیشان بکەن. سەرباری تەڤگەرەکا ئازادا رەخنێ، داکو بکاریت بەرسڤا کێشان بدەت، چونکو ئەگەر رەخنێ ئازادیا خوە نەبیت، گرفت ناهێنە چارەسەرکرن. ئێدی تاکو تێهزرکرن د ئازادیێ دا نەهێتەکرن، رەخنە ژی پەیدا نابیت، لەورا سەدێ «رەوشەنگەری و رەخنێ»، ل ئۆروپا ب هەڤرا سەرهلدان.

**هەر تشتەک ل بەر رەخنێ، تێهزرکرن و داریژتنی‌یە، بەلێ پا دڤێت ئەڤە ژێ بکەڤیتە هێلا ئالاڤێن مێتۆد و رێکێن نێرینێ**

فەلسەفە ژی ل گۆر کانت ب خوە تێهزرکرنەکا رەخنەیی‌یە، لێ بەلێ هشیاریێ کورد، نکاریە رەخنەکا ریشالیا هزر و ئەقلێ مرۆڤێ کورد ل گۆر ئەرکولوگیا دیرۆکێ بکەت، چونکو ئەگەر رەخنە نەبیت، گوهەرین ژی نابیت. ڤان دەرهاڤێژان کاودان و هشمەندیەک ئافراندینە، جهێ پرسیار و رەخنێ ل نک بوونەوەری نەبیت، دیارە دێ ئەڤ جورە کاراکتەرە دژی بهایێن سەردەمێ خوە بیت! ب ڤێ یەکێ، هزرکرن بنگەهێ رەخنێ ئاڤا دکەت، لەورا ئەو دیوارێن زیندانێن مە ژ خوە را درستکرین، تەنێ ب پرۆسێسا رەخنێ دهێنە شکاندن. ئێدی ئەم نکارین ژ دەرڤەی ئەقلێ رەخنەیی، هزر د ئیرۆ و سوبەیا خوە دا بکەین، چونکو ل جهێ پەسنا رەوشا هەیی بکەین، ئەم رەخنا رەوشا هەیی بکەین، باشترە. وەک ئەنجام، ئەڤ کارە دخوازیتە «ورکشوپا هزری» یا راڤەکرن و شرۆڤەکرنا رەوشێن مە یێن ڤەمایی.

ئەرێ ل سەردەمێ هشمەندێ بەرپرسیار، ئەرکێ رەخنا ئەقلی یان رەخنا رەخنێ بهێتەکرن، باشترە؟ چونکو ئەقل ل نک مە، نە بێ پارزنیە و نە ژی ئەقلەکێ رەخنەگرە. ئەڤە ژی، بێی رەخنە و رەخنە ل خوە گرتن، رێکا پێشداچوونێ خوەش ناکەت، لێ پرسا گران ب چ جورە مێتۆد جڤاکێ شرۆڤە بکەین؟ رەخنە ل خوەکرن و گەریانا ئەگەرێن درستکرنا رەوشێ، ئەرک و کارێ تەڤ هشمەند و دلسۆژێن گەلێ کوردە. راستە نابیت مرۆڤێ هشمەند، دژی هزر و ئایدیۆلۆگیێن هەیی براوستیت، بەری کو وان هزر و ئایدیۆلۆگیان بێخیتە بەر پارزنینا رەوش و دوورهێلێ، کانێ ئەڤ جورە هزر و ئایدیۆلۆگیە، دکارن هاریکاریا مە یا ئیرۆ بکەن/ بکێر ئیرۆ یا مە بهێن؟ ئەگەر نە، ل وی چاخی مرۆڤ دکاریت وان هزر و ئایدیۆلۆگیان، بێخیتە بەر دادگەها رەخنێ. ئانکو دڤێت هەر تشت «فەلسەفە، هزر، ئەقل، سیاسەت و ئۆل»، بکەڤنە بەر دادگەها رەخنێ و گومانێ. ئێدی دەما ئەم بەحسێ گومانێ دکەین، مەبەست نە بێهێڤیبوونە، بەلکو رەخنەیە، کو پالپشتیێ ل سەر رەوشەنبیریا پرسیارێ دکەت. هەروەکو هزرمەند و فیلۆسۆفێن ئوروپی: «گومان - مێتۆد/ دیکارت، رەخنا ئەقلێ پاک/ کانت، بوون و دەم/ هایدیگەر و کۆلانا ئێپیستمی/ فۆکوی»، دەرورێک ل بەر ڤێ شۆپێ دەشتکرن. ب ڤێ یەکێ، گەوهەرێ ئەقلانیا رۆژئاڤا، ل سەر گومانا سیستەمێن هزرێن کەڤنار هاتیەدانان.

رەخنە بێی پاشخانێن هزری و فەلسەفی ناهێتەکرن، چونکو فەلسەفێ ب رەخنێ گیانێ خوە تێرکریە. ئەقل ب خوە، لۆژیکا تێهزرکرن و شێوازێ نێرینا گشتیە و فەلسەفە ب خوە ژی، فۆرمەکە ژ فۆرمێن رەخنێ. لەورا فەلسەفە د گەوهەرێ خوە دا، کریارەکا ئەقلی و هەلوەستەکێ رەخنا بوونی‌یە، کو وەک مێتۆدێ ژیانێ پرسیارێن پارزنینا هەبوونێ دکەت.

راستە «تالیس یەکەم کەسێ تێگەهێ ئەقلی وەک تیۆری بکارئانی و دامەزرێنەرێ خواندنگەها ئەیۆنی‌یە»(٢)، بەلێ پا تاکو سەردەمێن نوو، جارەکا دی گرینگی دا ئەقلی، وەک کەلەپووری ئەقلانی «دیکارت و کانت» ڤەژاند، چونکو بنواشێ مێتۆدێن فەلسەفێن نوو، د گومان و رەخنێ دا دانان. ئەقلانی مێتۆدەکێ راڤەکرنا بوویەر و پێشهاتێن ژیانی‌یە، چونکو ئەگەر رێنیسانس ل سەر بنواشێن ئەقلانیەتێ هاتبیتەکرن، پا رەخنا ئەقلی ب خوە ژی، «بەشەکێ سەرەکی و یەکەمێ هەر پرۆژەکێ رێنیسانسی‌یە»(٣). ب تایبەتی ژی، پشتی تەڤگەرا بۆرژوازی و رەوشەنگەری، ژینگەهەکا بەربار بۆ هشیارکرنا

تاکی ئوروپی خوەشکری. بنگەهێ هەستێن ئۆلی یێن ب دیرۆکێ، هاتنە گوهەرین بۆ تیهزرکرنێن رەخنە و ئەقلانی یێن وەراری. ئها هوسا، ئوروپا ب پروسێسا رەخنێ، ژ میراتگریا فەلسەفێن میتافیزیکیا کلاسیک دەربازبوو.

کانت دبێژیت، ئەڤ سەدەیێ مە یێ نوکە، ب خوە سەدەیێ رەخنێیە، کو دڤێت هەر تشتی ڤەگریت، چونکو فەلسەفە ب خوە ژی، پروسێسا رەخنێیە. لەورا پرانیا پەرتووکێن ناڤبری ب رەخنە هاتنە بناڤکرن. هەروەکو دیرۆک بۆ مە بەرچاڤ دکەت، ئەلمانیا ژی د رەوشەکا وێران دا بوو، لەورا دەما کانت د پێشگوتنا پەرتووکا خوە «رەخنا ئەقلێ پاک/ ١٧٨١» دا نڤیسیە: «رەخنە درووشمێ ڤێ سەردەمیە». ئیرۆ ئەڤ درووشمە بۆ مە ژی، دەرمانێ دەردێ مە یێ گرانە، چونکو ئەم پتر ل سەر خواندن و بریارێن خوەیێن شاش براوستین، باشترە هەڤدوو گونەهبار بکەین. دیارە کانت گەلەک کار د جودابوونا بیاڤێ ئەقلێ تیۆری و پراکتیکی دا کریە. ژ بەر هندێ، «هەر تشتی ژ کانت دەسپێکر/ Kedourie»[4]، چونکو کانت ئەقلێ مروڤێ ئوروپی هشیارکر. هەروها کانت خوەیاتی رادەستێ دادگەها ئەقلی کر، داکو خوەیاتی ژ کێماسیا رزگار بکەت و ئەقل پالدا حەزێ، داکو مروڤ پالپشتیێ ل سەر خوە بکەت. ب تایبەتی ژی، دەما کانت پرسێن خوەیێن ئێپیستیمۆلۆگی «دڤێت ئەز چ بزانم؟» و پرسێن ئێتیکی «پێدڤیە ئەز چ بکەم؟» و پاش پرسێن خوەشیێ «ب چ دلشاد بم؟» پێشکێشکرین، بەرێ هزرمەند و فیلۆسۆفێن ئوروپی دا وارێ گەریان و شروڤەکاریێ. ئەڤێ کەش و رەوشێ، رەخنە د سەرپێهاتی و دیرۆکا ئوروپا دا بەردەستکر، چونکو چەکێ هەرە سەردەستێ گوهەرینێ بوو.

رەخنا ئەقلێ ئێپیستیمۆلۆگی، ب توێژێن خوەیێن گیانی و ئیدیالیڤە، بەردەوام ژ دیکارت، کروتشە و تا دگەهیتە کانت، پاش رەخنا ئەقلێ میتافیزیکی زالی سەر رەوشەنبیریا رۆژئاڤا بوو. ژ رەخنا ئەقلێ دیرۆکیێ ترانسندنتال/ بلند، پاش رۆلێ رەخنا ئەقلێ ئەنترۆپۆلۆگی، ئەقلێ یوتوپیا و داوی ژی ئەقلێ سیاسی، کو گەوهەرێ ئارێشا رەوشەنبیری بەرچاڤ دکەت. ئها هوسا ل ئوروپا تەڤگەرا رەخنێ، ژ ئەقلێ «کانت» دەسپێکر و پاش دەربازی ژیانی «مارکس» بوو. سەرباری تەڤلی گەهـ و ئۆرگانێن مروڤی مینا سایکۆلۆژی «فروید» و بزاڤێن گاستون باشلار ـ Gaston Bachelard، «پێکهاتێن ئەقلێ زانستی» بوو. ئەڤێ پروسێسێ، هەموو وارێن ژیانێ ب خوەڤە گرتن. ب ڤێ ئاوایی، رەخنە دبیتە ئالاڤێ ڤەکرنا کۆدێن چەڤەنگێن جیهانا ئافرێنەران. ئەڤ هەموو رەخنە، بۆ گەهشتنا کەشێ ئێپیستیمێ راستەقینە و دیرۆکی بوو، کو رەوشەنبیر د ناڤ دا خەباتێ دکەت. لەورا مروڤ نکاریت ئارێشێن رەوشەنبیرێ ئوروپی، ژ دەرڤـەی ڤێ پێڤاژۆیێ فام بکەت. ئها هوسا ژ بەر ئەرکێن رەخنە و رەخنەگریێ، رەوشەنبیر ب تیگەهێ «ئینتلیگێنسیا/ هزرمەند» هاتنە بناڤکر[*].

**رەخنە ل نوروپا وەک تیگەهەکێ فەلسەفی، ب پالپشتیا تەڤگەرێن سیاسی و پرۆسێسا هزرێ هاتیەکرن**

گەلۆ چارەنڤیسێ دیالێکتیکا هیگێل پشتی هزرا داویـا دیـرۆکـێ، دێ چ بیت؟ دیـارە هیگێل ب پەرتووکێن خوە «فینۆمینۆلۆگیا گیانی/ ١٨٠٧، زانستێ لۆژیکی و پرنسیپێن فەلسەفا راست/ ١٨٢٠»ن، وەک باشترین بەرهەمە مروڤاهیێ ئینانە ژیانێ. د ڤان پەرتووکان دا، هیگێل گەلەک ب کووری ل سەر سێ هێلێن فەلسەفی «ئۆلی، دیرۆکی و ئەستاتیکی» راوستیایە. هیگێل ب ڤـان پـەرتـووکـان، دخوازیت پتر ژیانـێ بدەتە پەرتووکا کانت «رەخنا ئەقلێ پاک/ ١٧٨١»، کو ب ئنجیلا سەردەمێ خوە دهاتە ناسکرن. کانت ب ڤێ پەرتووکێ خویا دکەت، تەنێ ئەقل ب رێکا ئەزموونان دکاریت بهێتە نیاسین، یێن دی دکەڤنە سینۆرێن میتافیزیکیا. ب ڤی ئاوایی، ل گۆر کانت، تەنێ ئەقل ل بیاڤێن دەم و جهی کار دکـەت و ئۆل ژی ژ دەرڤەی دەمی و جهی هزر و خەیالێ دکەت، لەورا ئێدی ئۆل ناکەڤیتە بیاڤێ ئەقلی.

ئەگەر ئەقل ئالاڤێ تیهزرکرنێ بیت، پا گەلۆ بۆچی ئیرۆ ل دەڤەرێ ئەقلێ تەرلانێ سەردەست، ئەقلێ کاریگەر ڤەدەرکریە؟ دیارە جڤاکێن پاشڤەروو، ل هەمبەر دامەزراند و رێکخوەشکرنا هزرێن رەخنێ، دهێنە ئاستەنگکرن. لـەورا ئەگەر مروڤ ب ڤێ پاشخان و سرتێ بپرسیت، ئەرێ ملەتەک دکاریت بێی هشمەندیا رەخنێ، هزر بکەت؟ چونکو تەنێ رەخنە دکاریت گەلان پاک بکەت، لێ بەلێ ئەگەر

**هشیاریێ کورد، نکاریە رەخنەکا رێشالیا هزر و ئەقلێ مرۆڤێ کورد ل گۆر ئەرکۆلۆگیا دیرۆکێ بکەت**

ل ملەتەکی مافێ رەخنێ و پرسیاران نەبیت، دێ ئەو گەل راستی ئاستەنگێن دیرۆکی هێت. ئێدی رێکنەدانا پرۆسێسا رەخنێ، وەکریە کو هەر تشتی/ دیرۆکا مە ژێ خوە دووبارە بکەت. مخابن رەخنە د بیردانکێن مرۆڤێ رۆژهلات/ کورد دا و نەمازە د وارێ «ئۆلی و سیاسی» دا، وەک ئالاڤێ هلوشیانێ بەرچاڤ دبیت. لەورا رەخنە/ رەخنەگری ل ڤێ دەڤەرێ بەردەوام نەبوویە، کو ببیتە ئالاڤەک خەلکی مە مینا دکتۆرەکی جڤاکی فام بکەت، بەلکو ئەم ل سەردەمی بەر ب رەوشەنگەرییێڤە، دچینە چاخەکی تەنێ د سینۆرێن ئەقلی دا ل ئۆلی دنێریت، کو سەردەمێ رەخنا ئەقلی ل ئەقلیە/ کانت»[5]. ئێدی هشیاری کورد ل هەمبەر ئەزموونێن هزری، ژ دەرڤەی پرۆسێسا هزرییە. نڤیسینێن مە ژێ، رستنا پەیڤێن ژ واتەیێ رووتن. ژ بەر هندێ، «پێدڤیە خواندەڤان تێبینا مرنا بەرهەمێن من داپۆشی بکەن، مرن نە ب واتەیا نۆرمال، بەلکو مرن ب واتەیا دیرۆکی، نە مرنا کەسان، بەلکو مرنا جڤاکی...»[6]. لەورا دڤێت ئەم کار ل سەر ژێدەرێن هێزێن ددەنە «ئۆل، ئەقل، سیاسەت، کاراکتەر و جڤاکی»ێن مرۆڤێن کورد براوستین، داکو سەرێن داڤێن ئارێشە و ئاستەنگێن سەتمینێ بەرچاڤ بکەین. ل سەر ڤێ بنگەهێ، تەڤگەرا مارکیسیزمێ رەخنە و رەخنە ل خوە گرتن، کرنە رێباز و مێتۆدێ خوەیێن خەباتێ، بەلێ پا دیسان دڤێت بهێتە گۆتن، کو «چەکێ رەخنێ، جهێ رەخنا چەکێ ناگریت/ مارکس»[7]. ئها ب ڤێ واتەیێ، مە گەلەک پێدڤی ب ئاڤاکرنا ئەقلەکێ رەخنەگرێ پراکتیکی، ڤەکری و تۆلێرانس هەیە، داکو هزرێن جودا وەرگریت و باوەری ب بنگەهێن ئەقلانیەتا تێهزرکرن و نێرینێن دوورهێلی هەبیت. لەورا قەبوولکرنا رەخنێ و هزرێن جودا ب خوە ژێ، پەسەند و پراکتیزەکرنا بهایێن گەردوونی «هەڤقەبوولکرن، وەکهەڤی، دادپەروەری و دیالۆگ» و ئازادبوونا خوەیاتی/ وەک گەشەپێدانا تاکی سەرهەڤ دکەت.

گەلۆ ما ئەم دکارین پێشکەڤین، ئەگەر مە ئەقلەکێ پێشکەتی نەبیت، چونکو پێشکەتن دخوازیتە کار و پلانان، کار ژێ د ڤێ چاخی دا ئەقلە؟ ئەرێ ئارێشا ئەقلێ مە، ئەم دووبارە تشتی هەیی دامەزرینین یان ژێ دەرباز بین و تەڤلی بێن نوو ببین؟ دیارە تاکو نوکە، رەخنا هزر و ئەقلێ مرۆڤێ کورد نەهاتیەکرن، داکو رەخنە وەک تێهزرکرنا د سینۆرێن کریار و ئازادیێ دا بهێتە فامکرن. ئێدی ئەقل ئەو هزرە، یاکو هەرتم ب رێکا پێداچوون و رەخنێ، خوە دەربازی ئاست و قووناغێن باشتر دکەت. ئەقل ب خوە ئالاڤ/ رێکێن بەرهەمئینانا هزرانە، هزر ب خوە ژێ، ئالاڤێ بەرهەمئینانا تیۆریە. لەورا دەما ئەقل و هزر نەهێنە بکارئانین، دەبۆ دبن. ژ بەر هندێ، مە ئیرۆ، پێدڤی ب فۆرمێن رەخنێن ئەقلی کوردی، ب رێبازێن «هلوشگەری/ دراێدا و نژیارگەری/ فۆکو و ئێتیکا دیالۆگی/ هابرماس» هەیە. رەوشا مە هندا تراژیدیە، تاکو پرۆسێسا مە یا رەخنێ ژێ تراژیدی بوویە. ئێدی ئەقلانیەت و رەخنە، کو ب تێگەهێ ئەقلانیەتا رەخنەگر دهێتە بناڤکرن، رێبازەکا گرینگا پارزنین و وەرارا جڤاکانە، کو دەرگەهی ل بەر جڤاکێن دائێخستی ڤەدکەت. ئەڤ رێبازە، رێکێ ل زیندانکرنا ئەقلێن زێز و ڤەگوهاستنی دگریت، چونکو د ئەنجام دا رێکا ئەقلێن هشیار خوەش دکەت.

ئاستەنگێن رێگریا بزاڤێن ئەقلێ رەخنەگر، خوە د پرسگرێکێن ئەقلانیەتا گرێدایی دا دبینن، کو یەکەم تێگەهە دروڤ و پرنسیپن، دووهەم شێوێن بکارئینانا ئەقلی ب درێژیا دیرۆکێ و سێهەم هێرشێن نەئەقلانی و ئێدیالی ـ Ideal ل سەر ئەقلینە. د ڤێ هێلێ دا کانت دبێژیت، راستە ئەقل دکاریت رەخنێ و ئاراستەکرنێ بکەت، بەلێ پا د هەمان دەم دا، دڤێت ئەقل رەخنا خوە ژێ بکەت. ئها ب ڤێ یەکێ، گرینگیا فەلسەفا رۆژئاڤا ل سەر کۆنتێکستێن «زانست و هشمەندیێ» پێشداچوویە.

گەلۆ بۆچی رەوشەنبیرێن کورد، نکارینە د کەشەکێ دیرۆکی دا تەڤگەرێ بکەن؟ داکو بکارن هشمەندیا رەخنێ ل نک مرۆڤێن کورد پەیدا بکەن، چونکو تاکو نوکە بنواشێ جڤاکا کوردی، جڤاکەکا فۆرمیا بەرێ سەرمادارییە. مرۆڤێ کورد، پێدڤی ب دووبارە پێشکێشکرنا پرسگرێکێن خوە، ب ئاوایەکێ وێرەک و بابەتییە، کو ئەڤە ژێ هشمەندیا ب دیرۆکێ درست دکەن. ئێدی

هشمەندیا دیرۆکێ کلیل و بنگەهێ ئارێشێن مەیە، چونکو ئەم ملەتەکین ل بەر دەهمەنێن درەنگیا دیرۆکێ دژین! هزرا مرۆڤێ کورد، پێدڤی ب هشمەندی، رەخنە و خواندنا خوە یا بەردەوامە، داکو بەر ب نووژەنییێڤە بچیت. ئەڤە ژی، ب نووژەنکرنا ئالاڤێن مە یێن رەخنێ دهێتەکرن، چونکو هزرێن نوو ژ دەرڤەی رەخنێ چ واتە نینن. نووکرن د هزرا مرۆڤێ کورد دا، بێی ڤەبوون بەر ب رەوشەنبیریا مرۆڤاهیا گەردوونیڤە، کو ل گور مەرجێن پاراستنا تایبەتمەندیا خوە ناهێتەکرن. مۆدێرنیزم ژی پرۆژەکێ زالکرنا ئەقلانی ل سەر هزرێن ئەفسانیە، هلبەت ئەڤە ژی بێی داسا رەخنا هەر تشتی ناهێتەکرن، کو هەر تشت بکەڤیتە بەر دادگەها ئەقلێن رەخنەگر. لەورا چاخێ رەخنێ، یەک ژ دەولەمەندترین قووناغێن بزاڤە، یاکو سەرهلدانا مۆدێرنیزمێ ژی، هەر ژ رەخنا ئۆلێ مەسیحی دەسپێکریە. ئێدی رەخنا ئۆلێ ب خوە ژی، گاڤەک ژ بۆ تێهزرکرنێیە، هەروەکو دیدرۆ ـ Diderot ئەنسۆکلۆپیدیا خوە، «ژ پێخەمەتێ گوهەرینا تێهزرکرنا گشتی داناى»[٨]. ب ڤێ یەکێ، رەخنە/ خواندن ئافراندنەکا دیە، چونکو مرۆڤ نکاریت ب تێگەهێن کەڤنار د جیهانەکا مۆدێرن دا هزر بکەت. نۆرمێن مۆدێرنێتێ ب هەبوونا دەولەتێنە، چونکو مۆدێرنیزم ب خوە فۆرمەکێ باژارڤانیە. ئەڤ مۆدێرنا ماتریالی بێی مۆدێرنا هزرێ، ئەم دووتایێ هندابوونێ کرینە. ئێها ب ڤێ ئەقلێ، ئەم نکارین هلگرێن «نێرینێن جیهانی» بین! لەورا دڤێت رەخنا ژێدەرێن هزرا سەردارا هەیی بهێتەکرن، چونکو «گوهەرینا جیهانێ ب خوە، رەخنا پراکتیکیا جیهانێیە و رەخنا جیهانێ ب خوە ژی، گوهەرینا تیۆریا وێیە»[٩].

لەورا مە ئیرۆ پێدڤی ب مێتۆدەکێ رەخنەییە، بکاریت راڤەکرنا جڤاکێ ب هەردوو رەهەندێن دیرۆکی و کولتوری بکەت. ئێدی بێی هەستێن رەخنەیی، ئەم نکارین ب کۆنتێکستێن دیرۆکی، چوارچووڤێن کریارێن گوهەرینێ دەسنیشان بکەین. لەورا دڤێت گاڤا یەکێ یا رەخنێ، ژ ئەقل/ گۆتارێن مە یێن سیاسی، ب سایا فەلسەفا سیاسی، زانستێ جڤاکی و ئەنترۆپۆلۆگیا سیاسی دەسپێبکەن. ئێدی دڤێت رەخنا هزران، ئەقلێ و دوورهێلی بهێتەکرن، چونکو مە چ ئالاڤ و میکانیزم و ستراتیژیا چارەسەریا ئاریشا نینە. ئێدی کێشا مە یا سەرەکی، ئەم نکارین دەسنیشان و هلسەنگاندنا چ تشتان و بوویەران بکەین! ب ڤێ یەکێ، چەوا پشتی گەردوون پەقێ ژیان درسبوویە، وسا ژی تا ئەقلێ مرۆڤێ کورد نەپەقیت، خوەنیاسین و ژیانەکا ئازاد درست نابیت.

دڤێت پرۆسێسا تێهزرکرنێن مە ب ئاوایەکێ رەخنەگرانە بن، داکو ئەڤ رەوشا هەیی هندەک بهێتە گوهەرین، چونکو دەمارێن گەلێ مە تژی کەڤنەشۆپی بووینە، ڤێ یەکێ ئەقلێ ئۆلیگارشی ل سەر مە زالکریە. لەورا نەبوونا رەخنێ ب خوە، بەنجکرنا ئەقلیە و خوە رادەستکرنا دوهی و مێتۆلۆگیایە. وەک دیرۆک بۆ مە بەرچاڤ دکەت، هەرتم رێگریا رەخنێ، ئۆل و هزرێن کەڤنار بووینە، چونکو یەک ژ ئالۆزی و ئاستەنگێن جڤاکێن ڤان دەڤەران نەبوون و نەڤەبوولکرنا رەخنێیە.

**رەخنە بێی پاشخانێن هزری و فەلسەفی ناهێتەکرن، چونکو فەلسەفێ ب رەخنێ گیانێ خوە تێژکریە**

دیارە «ئەڤ سەدەیە ب خوە، سەدێ رەخنێ ب تایبەتە، دڤێت هەر تشت بکەڤیتە بەر سەدێ رەخنێ، بێهودەییە ئۆل ب پیرۆزیا خوە و شەریعەت ب هێژایا خوە پێکۆلا خوە مەلساندنێ بکەت، چونکو ب ڤێ پێکۆلێ ئۆل پتر دکەڤیتە بەر گومانێ...»[١٠]. لەورا «باشترین سەردەمێ کەنیسێ د دیرۆکا خوە دا ناسکری، سەردەمێ رەوشەنگەرێ بوو، چونکو ڤێ سەردەمێ باوریا ئۆلێ ئێخستە بەر پارزنێن و رەخنێ/ کانت»[١١]. بنێرە ئەڤ ئۆلێن «کۆنفشیوس، بودیەت، یەهودیەت و مەسیحیەت»، گەلەک کەتینە بەر رەخنێن هزری و فەلسەفی، لەورا پتر تەڤلی ئەقلێن باوەرێن خوە بووینە، کو ئۆلێن نەرم و دوورهێلینە، نە مینا ئیسلامێ تا بێژی ئۆلەکێ رەق و هشکە.

ئێها ل ڤێرێ، «مرۆڤ دکاریت بێژیت، هەژمۆنا رەوشەنبیریێ وەک خالا یەکێ یا هەر ئەجندا تەڤگەرەکا سیاسی یان ئۆلی دهێتە هژمارتن»[١٢]، بەلێ دیسان دیرۆکا مە یا درێژا رەوشەنبیری و سیاسی، لێ هێشتا رەخنە و هلسەنگاندن ل

سەر نەهاتینەکرن. ئها هوسا ئەردێ مە یێ ژیانێ، راستیا مە یا پراکتیکی بەرچاڤ دکەت. ئێدی ئەو مەژیێ، ب درێژیا دیرۆکێ هاتیە ژەنگیکرن، ب شۆرشا نیتشە و کوجیتویا فوکوی نەبیت، ناهێتە دەرمانکرن. هەروها ئەڤ جورە تیهزرکرن و نێرینە، دخوازنە رەخنەکا هلوشگەریا تیگەهێ خواندنێ، چونکو ئەگەر ملەتەکێ گیانێ رەخنێ و نێرینێن دیرۆکێ نەبیت، نکاریت دەربازێ پرۆسیسا گوهەرین و پێشداچوونێ ببیت. ئێدی مە پێدڤی ب «گرێبەستەکا جڤاکی» یا د هێلا «فەلسەفی، جڤاکی و سیاسی» یا نوو دا هەیە، داکو ببیتە مێتودەک بۆ ژیانێ. ئەو هزرێن ئیرۆ د رەوشەنبیریا کوردی دا دهێنە پێشکێشکرن، ژ تیگەهشتنێن «فەلسەفی، ئێتیکی و سیاسی» دوورن. ب ڤی یەکێ، مە پێدڤی ب جورەکێ مێتود و رەخنێیە، ب یەک چاڤی ل پێکهاتێن جڤاکی نەنێریت، بەلکو ئالاڤەکێ دەسنیشانکرنا کەلەم و ئاستەنگێن وەرارا مە بکەت. داکو بکارین دگەل هەڤ هزر و رەخنا هەڤ ژێ بکەین و دووبارە خوین و گیانەکێ هەڤچەرخ بەردەینە دەمارێن ژەنگی گرتی.

ئەڤ رەخنا ئەم ل جڤاک و سیاسەتا مە دگرین، ژ بۆ «گوهەرینا ئەقلی، هشمەندیا سیاسی، فامکرنا جڤاک و واقعبینیا هەڤکێشا توندوتیژی و دەسەلاتێیە»، نە ژ بۆ تیۆریزەکرنێ، بەلکو ژ بۆ گوهەرینێیە، چونکو دیرۆکا مرۆڤاهیێ، دیرۆکا هشمەندیێیە. مەبەست ژ رەخنە و رەخنەکرنێ، ژ بۆ دەربازبوونا رەوشەکا باشترە، یاکو ب ئەنجام نەرازیبوون و شۆرشێن جڤاکی درست دکەت. کاودانێن مە گەلەک ئالوز و شێلی بووینە، لەورا دڤێت مرۆڤ رەوشا هەر تشتێ هەیی «ئۆل، سیاسەت، رەوشەنبیری و ئەقل» رەخنە بکەت.

هێشتا مە پرسیار ژ خوە نەکرینە، گەلۆ چەوا هزر بکەین؟ و چەوا ژێ ڤی هزرێ، دەربازێ وارێن ژیانێ بکەین؟ هەرتم هزر و فەلسەفە، واتەیا رەوشێ فام دکەن و ل بەرسڤێن پرسێن رەوشێ دگەرن، کو ب «ئۆنتۆلۆگیا نوکە» دهێتە بناڤکرن. لەورا دڤێت ل دەسپێکێ هزر بهێنە هشیار و راستکرن، داکو پەرژانێن خاپاندن و خوەشباوریێ بهێنە دراندن، چونکو دڤێت بهێتە

**کانت دبێژیت، ئەڤ سەدەیێ مە یێ نوکە، ب خوە سەدەیێ رەخنێیە، کو دڤێت هەر تشتێ ڤەگریت، چونکو فەلسەفە ب خوە ژێ، پرۆسێسا رەخنێیە**

فامکرن، کو هزر ب خوە پرۆسێسەکا رەخنەییە. ئێدی نابیت تیهزرکرن ژ دەرڤەی بوویەر و دیرۆکێ بژیت، چونکو هزر و فەلسەفە ب خوە، ڤەژەن و بەرپرسا جڤاکینە. تاکو تیۆرا رەخنا جڤاکی، بۆ ئەقلکرنا «رەفتار، زانست، پەیڤ و فەلسەفە» نەهێتەکرن، بنگەهێ ئاڤاکرنا جڤاکی درست نابیت. بنێرە ب سەرهەڤیا پرۆسێسا رەخنێ ل ئوروپا هند پێشکەت، تا رەخنا رەخنێ ژێ پەیدابوو، بەلێ هێشتا هزر و هەستێن رەخنێ ژێ ل نک مە پەیدا نەبووینە. لەورا ئیرۆ گەلێ مە، ژ هەردەمێ پتر پێدڤی ب تیهزرکرنێن رەخنەیی و راڤەکرنێن لۆژیکییە، لێ مخابن نەبەس لاوازیا مێتودێن رەخنێ ل نک مە هەیە، بەلکو نەبوونا هزر و ئەقلێ ل ڤی ئاستێ ژێ هێشتا ل نک رەوشەنبیرێن کورد نینە. ئانکو هێشتا خواندنێن مە دبێگونەهن، نکارینە ژ خواندنێن سادە دەربازێ بێن جودا ببن[٣]. لەورا هێشتا مە نکاریە ب خواندن و ڤەکولینێن خوە، بگەهینە تیگەهشتنێن کوورێن بەرپرسیاریا دیرۆک و رەخنێ، چونکو ئەڤ دوودلیا دیرۆکا مە، ژ دوورپێچیا پرسیارێن سەردەمێ مە یێ دژوار دهێن.

ب ڤی یەکێ، دڤێت رۆلێ رەخنێ و ئالیێن رەشبین پتر بهێنە بەرچاڤکرن، داکو باشتر جڤاک و گەل پێشدا بچن. رەخنە ل گۆر فوکوی ـ Foucault وەک پرۆسێسا ئاڤاکرنێ، ژ خویاکرنا شاشیێن خوەدووبارەکرنێ دهێت، چونکو رەخنە گەریانا هەرتما دەسنیشانکرن و گوهەرینا شاشیانە. دیارە رەخنێن مە ژێ، پتر کەتنە وارێ ئیدیۆلۆگی، ژ هێلێن «مەعریفی و فەلسەفی». لەورا ئەڤ جورە خواندن و رەخنا هەیی، نکارین رەوشێن «دیرۆکی، رەوشەنبیری و سیاسی»، بەر ب پێشڤە ببەن. خواندنگەها فرانکفورت/ ١٩٢٣ «رەخنا هەر تشتێ هەیی... رەخنا دلۆڤانیێ ب چ تشتێ هەیی نەبەت، کر»[١٣]، بەلێ دیسان مرۆڤ نکاریت رەوشا هەیی بگوهەریت، ئەگەر بنگەهێ هزرا سەردەستا هەیی نەگوهەریت. گەلێن خوەشباوەر زوو دەنگڤەدانا کەڤنەشوییێ وەردگرن، چونکو هەستێن وان ل ژێر گەڤێن ترس و خاپاندنێ هاتینە خەساندن. لەورا هەستێن بەرپرسیاریێ ژێ، هاتینە هنداکرن! بنێرە ئیرۆ چەوا هەستێن بەرپرسیاریێ، ل هەمبەر

دۆزا گەلی نەمان و کارێ سیاسی بەرف هەڤرکیا هێزەکا رووتـا بێ رەوشەنبیری و ئارمانجێن هزرێڤە چوویە. ژ بەر هندێ، یەک ژ گرانترین ئەرکێن ژیانێ «دەسـەلات و بەرپرسیاری»یە، لەورا ناپۆلیۆن دگۆت: «ئەز بەرپرسیاریا تەڤ بوویەرێن فرەنسا، ژ رۆژانێن پۆناپارت و تاکو رۆبیسپیری ـ Robespierre دهلگرم»[14]. لەورا دڤێت ئەم گرانیا خوە، بێخینە سەر «ئەگەرێن کوورێن رەوشێ»، چونکو «بار گەهشتیە سەر شاخێن گای!»

دیارە نەبەس مە پێکۆلا خواندنێن زانستی و رژد ل سەر بوویەر و قووناغان نەکرن، بەلکو مە دەڤ/ دەرگەهێ رەخنێ، ل هەمبەر قووناغ و بوویەران دائێخست! لەورا چ جاران زانا و رەوشەنبیرێن کورد، نکارینە رەخنا قووناغ و شکەستنێن خوە وەک «دیرۆکی، سیاسی، هزری و رەوشەنبیری» بکەن، ژ بەر هندێ هەرتم دیرۆکا مە خوە دووبارە دکەت.

گەلۆ ئەقلێ کـوردی وەک ئـالاڤ بـۆ رەخنێ دهێتە بکارئانین یان دڤێت رەخنا ئەقلێ کوردی بهێتەکرن؟ کـوردان نکاریـە مەعریفێ بکەنە بەرنامێ خوەیێ کارێ، چونکو مە گرینگی ب دوو تەڤگەران «رەخنە و شۆرشا هـەردەم» نەدایە! لـەورا مە پێدڤی ئەقلەکیە، بکاریت رەخنا ئەقلێ مە بکەت.

بنێرە «پرسێن ل سەر مرۆڤی، بەرێ پرسێن ل سەر سیاسەتێ بوون»[15]، چونکو پرۆتاگۆراسی ـ Protagoras، د پەرتووکا خوە «راستی/ ٤٥٠ ب.ز» دا دبـێـژیـت: «مـرۆڤ پـیـڤـەرێ هـەر تشتیـیە»[16]، بـەرێ کو ئەرستۆی/ ٣٨٥ ب.ز پرسێن سیاسەتێ ب ئارینیت. هـەردەمـا گۆراس گۆتی: «ئەقل جیهانێ برێڤە دبـەت» و پرۆتاگۆراس ـ Protagoras گۆتی: «مرۆڤ پیڤەرێ هەر تشتێ هەی و نەییە»[17]. مرۆڤ/ ئەقل، بوویە مژارا گرینگا لێگەرا فیلۆسۆف و هزرمەندان. پرۆسێسا ئەقلکرنا ئەقلی ب خوە، پارزنین و دەسنیشانکرنا ئامووریێن بەرهەمئینانا ئەقلی دکەت و پاش پێڤاژۆیا دیرۆکیا ڤی ئەقلی سەراست دکەت. ئەقلانی ب خوە، پێگیریا مەرجێن ئەقلی د فۆرم و ناڤەرۆکی دایە!

ئەقل ب خـوە گـۆتـارەکـا سـەرەکـیـا تێهزرکرنا فەلسەفیێیە، ئەگەر ب رەخنە و هزرێ هزر نەکەین، نکارین رەوشا خوە یا ئیرۆ شرۆڤە بکەین، چونکو ڤاڤێرتنا سەرەکیا گۆتارا فەلسەفی، خوە د رەخنە و داڤەکرنێ دا دبینیت. ئێدی هزر ژیان و وەرارێ نـاکـەت، ئـەگـەر راسـتـی پرسێن کـوور نەهێت. رەخنە ب خوە هزرا فەلسەفی دبزێڤیت، مەبەستا فەلسەفێ ژێ رۆهنکرنا لۆژیکیا تێهزرکرنێیە. کریارا فەلسەفی، پرۆسێسا پارزنین و ڤەکولینا ل نەخوەشیێن جڤاکیە و راڤەکرنا پرسگرێکێن ئیرۆیە. «ئەقل ب خوە رەخنەیە/ کانت»، لەورا فەلسەفا کانت، ب فەلسەفا رەخنێ هاتیە نیاسین. د هزرێن نوو دا هزر ب رەخ ئەقلی ڤە نینە، بەلکو هزر ب خوە رەخنەیە، چونکو پرۆسێسا رەخنێ جودای پرۆسێسا تێهزرکرنێ نینە. مرۆڤ دکاریت بێژیت، هزرێن نوو ب خوە رەخنەنە، رەخنە ب خوە ژێ ئالاڤەکێ ڤەژاندنا ئەقلیە. ئەگەر رەخنە و ڤەگەر نەبیت، ئەم نکارین ب رژدی هزر بکەین، رەخنە درۆڤەکێ تێهزرکرنا ئازادە، دڤێت مرۆڤ ب ئازادی هزر بکەت یان بلا هەر نەکەت!

دڤێت کارێ هزر و هشمەندێ کورد گەریان و دەسنیشانا نەخوەشیێن جڤاکی بیت، داکو ئەگەر و ژێدەرێن ژانگرتنێن گەلی مە دیار و بەرچاڤ بن، چونکو ئێدی هشمەندی ب خـوە ڤەبوونا هزر و تێهزرکرنا بەر ب بوون و هەبوونێ ڤەیە. ئەم هێشتا ژ قووناغا گوندان دەربازی باژێران نەبووینە، ئەگەر ئەڤ ئەنجامە راست بیت، پا ئەم چما ل سەر کەوال، چوتوکێل و زەڤیێ نا ئاخڤین؟

ئەقل ب خوە گەریانا ل ئەگەرانە/ ئەرستۆ، لەورا دەما مرۆڤ بەحسێ ئەقلی کوردی دکەت، دڤێت هزرا کۆچەریا ئەقلی مرۆڤی کورد ژ بیر نەکەت. ئەنجام و رەوشا ئیرۆ بەرچاڤ دکەن، نە ماقوولیا ئەقلی مرۆڤی کورد زالی سەر هەموو رەفتار و کریاران بوویە. ئەڤ رەوشا ئیرۆ کوردستان تێرا دەرباز دبیت، مرۆڤی نەچار دکەت، دووبارە هزر د تێگەهشتنا ئەقلی مرۆڤی کورد دا بکەت. ئها ل ڤێرێ نێرینا مرۆڤی کورد بۆ تشتان و رێکا سەرەدەریا دگەل وەرگرتنا زانین و بیاڤێ

***لەورا مە نیرۆ پێدڤی ب میتۆدەکێ رەخنەییێیە، بکاریت راڤەکرنا جڤاکێ ب هەردوو رەهەندێن دیرۆکی و کولتوری بکەت***

بەرهەمئینانێ ل گۆر مەرجێن دیرۆکی، ناگونجن.

ب ڕاستی تێهزرکرن ب خوە فۆرمەکێ ڕەخنێیە، ڕەخنا ئەپیستمیا ئۆلی ژێ دەسپێکا تەڤایا ڕەخنانە، چونکو تا نوکە ل نک مە ئۆل و ئەفسانەکرنا هزرا مرۆڤێ کورد هاتیەکرن، بەلێ زانست و سێکولارکرنا مرۆڤێ کورد نەهاتیەکرن، لەورا دڤێت ڕەخنا بنکەهێ ئەقل ل سەر ئاڤابووی، بهێتەکرن.

ئەنجامێن دیرۆک و ئەزموونێن ئەقلێ مرۆڤێ کورد دیار دکەن، ڤی ئەقلی پێدڤی ب هلکۆلان و ڕەخنێن دژوارە! ڕاستە مرۆڤێن دۆگما/ سەرهشک، دکارن ل سەر تەڤ ڕەوش و ئەنجامان، ب کوتەکی باوریا خوە گەرم و بەردەوام بکەن، بەلێ پا ئەڤ تێگەهشتنە تا داویێ خزمەتا وان باوریان ب خوە ژێ ناکەت! داکو «ئەقلێن دەرگرتی ژ پەرژانێن دۆگمائی بهێنە ڤەکرن و ڕزگارکرن»[١٨]، ئەڤە ژێ ل گۆر کووراتیا نێرینێ، کووراتیا ڕەخنا ئەقلی بەرهەمدئینیت. ب ڕاستی، ئاریشەکا مەزنە ئەقلێن دوورهێلی وەک خوە نەبینن، بەلکو ب خەیالا خوە دوورهێلی ببینن. دڤێت ئەڤ ئەقلە ل بەر ڕۆناهیا دیرۆکێ و میتۆدێن ڕەخنێ بهێتە هلکۆلان، چونکو دەما ل کولتور و دیرۆکا دەڤەرێ دهێتە کۆلان، دیار دبیت مە گەلەک گرێکێن نەخوەشیێن ئەقلی هەنە. سەرباری، دڤێت هشمەندێ کورد ل هندەک ئالاڤ و میتۆدان بگەڕیێت، بکێر ڕەخنە و شرۆڤەکرنا ئەقلێ مرۆڤێ کورد بهێن. داکو ژ ئاموور و میکانیزمێن بەرهەڤێن دەرەکی ڕزگار بین، چونکو ئەزموون و ئەنجامان خویا کر، ئەو بکێر کێشان و پیڤانێن ئاریشێن مە ناهێن.

**دهۆک ٢٠٢٣.١٠.١١**

**سەرچاوەکان:**


١) أم الزين بنشيخة المسكيني ـ كانت ڕاهنا/ أو الانسان في حدود مجرد العقل ـ المركز الثقافي العربي، ط١، دار البيضاء ـ المغرب، ٢٠٠٦ ص ٢٧.

٢) خديم أسماء ـ العلوم الدقيقة كأرضية حتمية للفلسفة/ الفلسفة الحديثة كانط نمونجا ـ مجموعة/ حوار فلسفة العلم/ سؤال الثبات و التحول ـ منشورات الاختلاف، ط١، بيروت ـ لبنان، ٢٠١٢ ص١٠٥.

٣) محمد عابد الجابري ـ تكوين العقل العربي ـ مركز دراسات الوحدة العربية، ج١، ط١١، بيروت ـ لبنان، ٢٠١١ ص٥.

٤) اوموت اوزكيريملي ـ نظريات القومية/ مقدمة نقدية ـ ترجمة: معين الإمام، المركز العربي للأبحاث و دراسة السياسات، ط١، بيروت ـ لبنان، ٢٠١٣ ص٣٨.

*) مینا پەرتووکێن «ڕەخنا ئەقلێ پاک ـ Kritik der reinen Vernunft/ ١٧٨١» و «ڕەخنا ئەقلێ پراکتیکی ـ Kritik der praktischen Vernunft/ ١٧٨٨ ».

٥) د. جاسم سلطان ـ أزمة التنظيمات الإسلامية/ الإخوان نموذجا ـ الشبكة العربية للأبحاث و النشر، ط٢، بيروت ـ لبنان، ٢٠١٥ ص١٠٢.

٦) د. كمال عبداللطيف ـ الفكر الفلسفي في المغرب/ قراءات في أعمال العروي و الجابري، مطبعة رؤيا للنشر و التوزيع، ط١، القاهرة ـ مصر، ٢٠٠٨ ص١٦٣.

٧) فهيمة بوحفص ـ كارل ماركس: من نقد الدين الى نقد السياسة ـ مجلة العلوم الانسانية، المجلد ٣١، عدد ٢، الجزائر، ٢٠٢٠ ص١٢٠.

٨) داريوش شايغان ـ النفس المبتورة/ هاجس الغرب في مجتمعاتنا ـ ترجمة: محمد علي مقلد، دار الساقي، ط١، بيروت ـ لبنان، ١٩٩١ ص٩٨.

٩) ناصيف نصار ـ مطارحات للعقل الملتزم/ في بعض مشكلات السياسة و الدين و الايديولوجيا ـ دار الطليعة للطباعة و النشر، ط١، بيروت ـ لبنان، ١٩٨٦ ص١١٣.

١٠) د. محمد المصباحي ـ كانط: من العقل الخالص الى الإيمان الخالص ـ مجموعة/ قراءة في كتاب الدين في حدود بساطة العقل ـ فلسفة الدين/ مقولة المقدس بين الإيديولوجيا و اليوتوبيا و سؤال التعددية ـ منشورات ضفاف، ط١، بيروت ـ لبنان، ٢٠١٢ ٧٢.

١١) د. محمد المصباحي/ مجموعة. ژێدەرێ بەرێ، بپ٧٣.

١٢) محمد عابد الجابري ـ العقل السياسي العربي ـ مركز دراسات الوحدة العربية، ط٣، بيروت ـ لبنان، ١٩٩٥ ص٤٧.

*) ئارکیۆلۆگیا، هلوشگەری و ڕەخنەیێن سەنتەرێ بنواشی/ هلوشگەریا درایدا، سەنتەرێ تێکستی/ ئارکیۆلۆگیا فۆکوی و خواندنا گۆتارێ و سەنتەرێ واتەیێ/ هێرمینیوتیکا گادامێر و ریکور.

١٣) ديفيد إنغليز و جون هيوسون ـ مدخل الى سوسيولوجيا الثقافة ـ ترجمة: لما نصير، المركز العربي للأبحاث و دراسة السياسات، ط١، بيروت ـ لبنان، ٢٠١٣ ص٦٨.

١٤) مليكة بن دودة ـ فلسفة السياسة عند حنة آرندت ـ منشورات الاختلاف، ط١، بيروت ـ لبنان، ٢٠١٥ ص١١١.

١٥) حنة ارنت ـ في السياسة وعدا ـ تحرير و تقديم: جيروم كوهن، ترجمة و تقديم: معز مديوني، من منشورات دار الجمل، ط١، بيروت ـ لبنان، ٢٠١٨ ص١٠.

١٦) فرانسوا شاتيله ـ تاريخ الايديولوجيات ـ ترجمة: د. انطون حمصي، ج١، منشورات وزارة الثقافة، دمشق ـ سورية، ١٩٩٧ ص١٦٨.

١٧) إلياس بلكا ـ الغيب و العقل/ دراسة في حدود المعرفة البشرية ـ المعهد العالمي للفكر الإسلامي، ط١، فرجينيا الولاية المتحدة الامريكية، ٢٠٠٨ ص١٧.

١٨) عبدالرحمن الحاج ابراهيم ـ من النزعة الانسنية الى إستكشاف العقل الاستطلاعي/ تحولات مشروع محمد اركون النقدي ـ اوراق فلسفية، عدد ٩، يناير ٢٠٠٤ ص١٠.

# دیدار

# جەلیل کاکەوەیس

دوای چەند جارێک پەیوەندی پێوەکردنی، ڕازی بوو ئەو دیدارە بکەین، بەلام پێشنیازی کرد، ئەگەر من پێم ئاسایی بێت، ئەو دیدارە لە خەلوەتگەکەی لە گوندی حەساری گەورە، لە نزیک کەرکووک، کە ماوەیەکە لە زێدی خۆی دروستی کردووە، ئەنجام بدەین، منیش دلم نەشکاند، لەسەر هەموو شتێک ڕێککەوتین.

ڕۆژی ٢٠٢٣/١١/١٢ لە هەولێرەوە بەڕێکەوتین، دەوروبەری سەعات یەک و چارەگێک گەیشتینە خەلوەتگەکەی، دوای پشوویەکی کورت، دەستمان پێکرد، بۆ ماوەی یەک سەعات و پەنجا چرکە گفتوگۆمان کرد.

**دیداری: سمکۆ عەبدولکەریم**

# جەلیل کاکەوەیس :

# ڕۆمانی بەدگۆڕان-ی کافکام بۆ یەکەم جار لای فەرهاد پیرباڵ بە سێ سەت دینار چاپ کرد

دیداری: سمکۆ عەبدولکەریم



**- با لەوەوە دەست پێ بکەین، تۆ لە پەراوێزی ڕوانگەییەکان سەرت هەڵدا و لەژێر کاریگەریی ئەوان دەستت پێکرد؟ چونکە ئەوەندەی من ئاگادار بم، تۆ لەسەروبەندی ئەوان هاتیە نێو دونیای ئەدەب؟ دەکرێ بزانین ڕوانگەییەکان چ کاریگەرییەکیان لەسەرت هەبوو؟**

+ بێگومان، پێکات، ڕێک وایە. کاک سمکۆ من پێشتر، پێش سەردەمی ڕوانگە خەریکی خوێندنەوە بووم، خوێندنەوەی ئەو داستانە فۆلکلۆریانەی، کە کاتی خۆی (موحەممەدئەمین عەصری) لە کەرکووک چاپی دەکردن، من زیاتر خەریکی خوێندنەوەی ئەو وردە شتانە بووم. ئەوکاتەش، کە قوتابی بووم، لە قۆناغی ئامادەیی، هەندێک کتێبم خوێندنەوە، بەڵام هێشتە تەواو پێنەگەیشتبووم، نەگەیشتبوومە قۆناغی نووسین.

ساڵی (١٩٦٩-١٩٧٠) سەرەتای قۆناغی زانکۆم بوو لە بەغدا، لە کۆلێژی ئاداب بەشی زمان و ئەدەبی کوردیی، لەوێ کۆمەڵێ مامۆستای دانسقە وانەیان پێ دەگوتین، وەکو: (دکتۆر مارف خەزنەدار، دکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ، مامۆستای گەورەمان عەلائەدین سەجادی، دکتۆر ئیحسان فوئاد و دکتۆر کاوێس قەفتان) ئەمانە هەموویان مامۆستای ئێمە بوون، بەهۆی ئەوانەوە ئاشنایەتیمان لەگەڵ دونیای کتێب پەیدا کرد. مامۆستا عەلائەدین سەجادی کتێبەکانی خۆی کردبوونە پرۆگرام، وەک: مێژووی ئەدەبی کوردی، ئەدەبی کوردی و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی، نرخ شناسی و دەقەکانی ئەدەبی کوردی.

دکتۆر (عزەددین مستەفا ڕەسووڵ)یش لە ڕێگەی داستانی (مەم و زین)ەوە زۆر سوودم لێ وەرگرتووە، چونکە ئەم داستانە وەکو بەرنامەی خوێندن چوار ساڵ خوێندمان.

لە قۆناغی یەکەمی زانکۆ بووم، کە بزووتنەوەی ڕوانگە سەری هەڵدا و بەیاننامەیەکیان بڵاوکردەوە، ئەوەی ڕاستی بێت، ئەو بەرهەمانەی ڕوانگە، کە بڵاودەکرانەوە، ئێمەمانانیش بەباشی لێیان تێنەدەگەیشتین، چونکە هەمووی هێما بوو.

هەر لەو بەینەدا لەتیف هەڵمەت-یش هاتە مەیدان و دیوانە شیعری (خوا و شارە بچکۆلەکەمان)ی چاپکرد و لەگەڵ هاوڕێکانی، خۆیان وەک گرووپی (کفری) ناساند، ئەوانەش هاوشانی ڕوانگەییەکان کاریگەریی زۆریان لەسەر شیعری کوردیی هەبوو، لەتیف حامد-یش ئەگەرچی ئەو سەر بەگرووپی کفری نەبوو، بەڵام یەکێک بوو لەوانەی، کە تازەگەری لە شیعری کوردیی دروست کرد.

**- ئەم دووانە، ڕوانگەییەکان و گرووپی کفری دژی یەکیش بوون؟**

+ بەڵێ دژی یەکیش بوون. من لەو سەروبەندە، هاتمە نێو دونیای ئەدەب و دەستم کرد بە خوێندنەوە. ئەوکاتانەش وا باو بوو، ئەوەی خوێندەوار و حەزی لە نووسین بوایە، دەبوایە شارەزای ئەلبێرت کامو، سارتەر، کافکا و ئەمانە بێت. منیش دەستم کرد بە خوێندنەوەی ئەو کتێبانەی، سەر بە دونیای عەبەسییەت بوون، هەر لەو سەردەمە، بەهەمان نەفەسی عەبەسییەت لە ساڵی (١٩٧٤) چیرۆکێکم نووسی.

**- واتە تۆ لە دەرەوەی ڕوانگە، خۆت بە بەشێک لەوان دەزانی؟**

*ئەو بەرهەمانەی ڕوانگە، کە بڵاودەکرانەوە، ئێمەمانانیش بەباشی لێیان تێنەدەگەیشتین، چونکە هەمووی هێما بوو*

+ خۆم بە بەشێک لە ڕوانگەییەکان نەدەزانی، بەڵام لەژێر کاریگەریی ئەوان دابووم، چونکە من ئەوکاتە ناوێک نەبووم لە ئەدەبی کوردیی، تازەکار بووم. هەر لەژێر کاریگەریی ئەوانیش چیرۆکێکم نووسی بەناوی (چرپە چرپی مناڵی شەقامەکانی شار) تۆ سەیری ناوونیشانەکەی بکە، ناوونیشانێکی هێماداره، کە ئەو چیرۆکەم نووسی یەکسەر ناردم بۆ ڕۆژنامەی (ڕۆشنبیری نوێ) کە دکتۆر ئیحسان فوئاد سەرنووسەری بوو، یەکسەر بڵاوکرایەوە و هاوڕێکانیشم پیرۆزباییان لێ کردم.

**- ئەوە یەکەم چیرۆکت بوو، هەستت چۆن بوو، کە بڵاوکرایەوە؟**

+ یەکەم چیرۆکم بوو، خۆت دەزانی لەو تەمەنە هەست و جۆشوخرۆشی گەنج چۆنە، منیش ئەوکاتە گەنجێک بووم، هەستم دەکرد، منیش شتێکم کردووە، ئەمە

وایکرد، چیرۆکێکی دیکەشم نووسی ناومنا (تەنگ و چەڵەمەی شانۆکە) کە ئەویشیان هەر چیرۆکێکی هێماداری ڕوانگەییانە بوو، ئەویشان هەر لە (ڕۆشنبیری نوێ) بڵاوکرایەوە. ئیدی لەوێوە توانیم خۆم بناسمەوە.

**- بەڵام، تۆ بۆ کەوتیتە ژێر کاریگەریی ڕوانگەییەکان؟ چی وای لێکردی وەک هەوادارێک، یان شوێنکەوتوێکی ئەوان بێتە نێو دونیای ئەدەب و نووسینی چیرۆک؟ بەچیی ئەوان سەرسام بوویت؟**

+ ڕوانگەییەکان، شتی ناباویان دەنووسی، من سەرسام بووم بە ناباوییەکەیان، چونکە هەموو شتێکی ناباو سەرنج ڕاکێشە.

**- تۆ، ئەودەمە چی لەو هێماییانە تێدەگەیشتی؟**

+ بڕوام پێ بکە لە هەندێکی هەر تێنەدەگەیشتم، حوسێن عارف چیرۆکێکی بە ناوی (وەچەی یاسای خۆڵ و دۆڵ) بڵاوکردوە، کە خوێندمەوە، هیچی لێ تێنەگەیشتم تەقەی سەرم دەهات نەمدەزانی باسی چی دەکات.

**- ڕوانگە هیچ پەیوەندییەکی بە سیاسەت و فیکرەوە هەبوو؟**

+ زیاتر فەلسەفیی بوو، چونکە پێش ڕوانگە، بیرم چوو باسی بکەم. لە کەرکووک کۆمەڵێک هەبوو وەک فازڵ عەزاوی و هاوڕێکانی، خەریکی تازەگەری بوون، بزووتنەوەی ڕوانگە لەژێر کاریگەریی ئەوان دروست بوو، کە وێستگەیەکی گۆرانی ئەدەبی کوردیی بوو، چونکە پێش ڕوانگە، بەتایبەتی ئەدەبیاتی شەستەکان، جیاوازە.

**- دوایساڵی ١٩٧٥ ئەو ڕەوتەی ڕوانگە، سەبرسەبر خامۆش بووەوە، تۆ بەچ ئاراستەیەکدا هەنگاوت نا؟**

+ دوای ساڵی ١٩٧٥ من یەکسەر بووم بە مامۆستا و ڕەوانەی (حەمدانیە) کرام، لەوێ زۆر بەچڕی دەستم بەخوێندنەوە کرد. هەرچی بەرهەمی نەجیب مەحفووز و سەلامە موسا هەبوو، خوێندمەوە، هەتا ساڵی ١٩٧٨ لەوێ بووم، دواتر گەڕامەوە و نەقلی (بازیان)ی لای سلێمانی کرام، لەوێ نەفەسێکی دیکەم وەرگرت، دەستم بە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی ئەمریکای لاتین وەکو (جۆرج ئەمادۆ، باڤێس بێسا) ئەو بەرهەمانەم دەخوێندەوە، ئەودەمیش زیاتر لەژێر کاریگەری ئەوان دابووم.




ساڵی ١٩٨٣ لە ڕێگەی برادەرێکی خۆشەویستم، ڕەخنەگری گەورە مامۆستا (عەبدوڵڵا تایەر بەرزنجی) کە پێکەوە مامۆستا بووین لەوێ. ڕۆژێکیان ڕۆمانی (مەسخ-ی کافکا)ی بۆم هێنا، کە خوێندمەوە، یەکجار زۆر پێی سەرسام بووم.

**- ئەو بۆ ئەو ڕۆمانەی بۆت هێنا؟**

+ ڕۆژی پێشتر باسمان کردبوو، گوتم شتی تازە چیت لایە؟ ئەویش گوتی: ئەو ڕۆمانەی کافکا-م لایە زۆر سەیرە، گوتم بۆم بێنە، کە خوێندمەوە، بەڕاستی زۆر عەجایب بوو، بۆیە دووجار خوێندمەوە.

**- عەجاییبیەکەی لەچی دابوو، تۆ بۆ هێندە پێی سەرسام بوویت؟**

+ کاک سمکۆ یەک شتت پێ بڵێم ئێستەشی لەگەڵدا بێ، من حەزم لەشتی باو نییە، ئەوەی کەسانێک لە منداڵییەوە کەوتوونەتە دوای، حەز دەکەم خۆم شتێک بدۆزمەوە

> ***خۆم بە بەشێک لە ڕوانگەییەکان نەدەزانی، بەڵام لەژێر کاریگەریی ئەوان دابووم، چونکە من ئەوکاتە ناوێک نەبووم لە ئەدەبی کوردیی***

ڕێچکەیەک، بەرهەمێکی دەگمەن بدۆزمەوە، ئاسایی نەبێت، پێموابوو ئەو ڕۆمانەی کافکا ئاسایی نەبوو، بۆیە ئیزنم لە مامۆستا عەبدوڵڵا وەرگرت و بڕیارم دا تەرجوومەی بکەم.

**- ئەمە یەکەم بەرهەمی وەرگێڕدراوت بوو؟**

+ ئەرێ، یەکەم بەرهەمی وەرگێڕدراومە.

**- وەک بیستوومە، ئەو کارەت چیرۆکێکی دوورودرێژی هەیە؟**

+ساڵی ١٩٨٣ کە دەستم بە تەرجوومەی ئەو بەرهەمە کرد، یەکەم جار زۆر بەدوای وشەیەکی کوردییدا گەڕام لە بەرانبەر وشەی (مەسخ) زۆر پرسیارم کرد، هیچ سوودی نەبوو.

بەنێو زۆر فەرهەنگاندا گەڕام، لەدوایی هەر خۆم گەیشتمە ئەو تێگەیشتنەی، کە کافکا باسی گۆڕانێکی فەسلەجی، گۆڕانێک لە ناخەوە، لەهەموو ڕوویەکەوە (گۆڕان، گۆڕان، گۆڕان) دەکات، ویستم تێبگەم ئەم گۆڕانە چۆنە؟ باشە، یان خراپە؟ هەرخۆم، بەخۆمم گوت: گۆڕانێکی خراپە، بۆیە ناومنا (بەدگۆڕان) لەسەر وەزنی (بەدخۆراکی)

بەدخۆراکی و بەدحاڵی بوون، گۆڕانێکن بەلای خراپیا دەشکێنەوە. ئیدی ئەم وشەیە جێی خۆی گرت، بەڵام لەوساوە، تا ساڵی (١٩٨٩) مایەوە و چاپم نەکرد.

**- بۆ چاپت نەکرد؟**

+ بەهۆی سەرقاڵیم بە مامۆستایەتی و وانەگوتنەوە. ئیمکانیەتی ماددیشم نەبوو. ساڵی ١٩٨٩ بردم بۆ ڕەقابەی کتێب لەبەغدا، ئەوسەردەم، هیچ کتێبێک بێ ڕەزامەندیی ئەو ڕقابەیە نەدەتوانرا چاپ بکرێت. دوای ئەوەی مۆری ڕێگەپێدانیان لێدا، لە ڕێگەی گەڕانەوەم، چێشتخانەیەک هەبوو لەبەینی (دوبز و سلێمان بەگ) بۆ نانخواردن لەوێ لامان دا. کاتێک تەواو بووم، سەیرم کرد، ئۆتۆبێلەکە ڕۆیشتووە و منی بەجێهێشتووە، چەندین کتێب و دەستنووسی ڕۆمانەکەش، هەر هەمووی، کە لەنێو ئۆتۆمبێلەکە دابوون، لەدەستم چوون، ئێستەش نەمبینینەوە. هەتا ساڵی (١٩٩٥ - ١٩٩٦) جارێکی دیکە تەرجوومەم کردەوە و لەسەر ئەرکی خۆم چاپم کرد.

**- لە کوێ چاپت کرد؟**

+ ڕۆمانی بەدگۆڕان-ی کافکام بۆ یەکەم جار لای فەرهاد پیرباڵ بە سێ سەت دینار چاپ کرد، ئەوسەردەم، فەرهاد دوکانێکی فۆتۆکۆپی هەبوو. گوتی: بێنە بۆت چاپ دەکەم. دوای ئەوەش چەند جارێکی دیکە چاپ کرایەوە.

**- تۆ، کە زۆربەی سەرچاوەکانی خوێندنەوەت بە زمانی عەرەبیی بووە، ئەو زمانی کوردییە پاراوە لەکوێ فێربوویت؟**

+ هەموو ئەو کەسانەی عاشقی ئەدەبن، هەمیشە لەهەوڵی ئەوەدان زمانێک بدۆزنەوە تایبەت بێت بەخۆی. ئەو زمانە کوردییەی، من پێی دەنووسم تایبەتە بەخۆم، موڵکی هیچ کەسێکی دیکە نییە، من زۆر تاقیبی سەرچاوەی دەگمەنم کردووە، بەڵام دواجار دەبێت ئەوە بڵێم، کە من لە بنەماڵەیەکی ساکار و خاکەڕای ئەم گوندەی (حەسار)ی گەورەیە هاتوومەتە دونیاوە.




دایکم و باوکم بە کوردییەکی زۆر پاک قسەیان دەکرد، لەیادمە هەر قسەیەکی دەکرد پەندێکی پێشینانی لەگەڵ بەکاردەهێنا، ئێستە خەڵک نایزانن ئەو پەندانە تێهەڵکێشی قسەکردن بکەن، کە مەغزای قسەکە دەگۆڕێ و ڕێڕەوی ڕیتمەکان بەهێز دەکا. من بە پلەی یەک قەرزاری دایک و باوکم، ئینجا قەرزاری کتێبەکان.

**- تۆ باسی زمانی قسەکردنی دایک و باوکت دەکەی، کە بەزمانێکی کوردیی پاراو قسەیان کردووە، تۆش لەوانت وەرگرتووە و دواجار لەژیانی ئەدەبیت، لە نووسین ئەزموونت کردووە، بەڵام لەنێوان زمانی نووسین و قسەکردن جیاوازیی زۆر هەیە، تۆ چۆن ئەو زمانی قسەکردنەت هێنا نێو نووسین؟**

+ نانا کاک سمکۆ، من زۆر سوودم لە ڕەوانبێژیی بینیوە، جا خوێندنەوەی زۆر و هەوڵدان بۆ ئەوەی ببم بەخاوەن

**ڕوانگەییەکان، شتی ناباویان دەنووسی، من سەرسام بووم بە ناباوییەکەیان، چونکە هەموو شتێکی ناباو سەرنج ڕادەکێشە**

شێوازی تایبەت بەخۆم، کە من دەڵێم باوک و دایکم، مەبەستم ئەوەیە، ئەوان بەزمانێکی پاراو قسەیان دەکرد، من هاتم سوودم لەو زمانپاراوییەی ئەوان وەرگرت و لەنێو دونیای کتێب و خوێندنەوە پەرەم پێدا.

یانی ئەوە نییە هاتبم دەقــاودەق قسەکانی ئەوانم گوازتبێتەوە نێو نووسین و سەر کاغەز، شتم خستوتە سەری و لێم کەم کردووە، چونکە زمان دونیایەکی فراوانە، زمان وەکو هەر بونەوەرێک لە گەشەکردن دایە، وەک چۆن بونەوەر گەشە دەکات، زمانیش ئاوایە، گەشە دەکات و دەپووکێتەوە، جاری وا هەیە کاریگەریی دەرەکی دێتە سەر حازرەکی و شێوازی زمانەکە تێک دەدا. ئێمە ئەگەر ئاگامان لەخۆمان نەبێت ڕەنگە زمانی عەرەبیی، فارسیی و تورکیی کاریگەریی لەسەر زمانەکەمان دابنێن، بۆیە دەبێت ئێمە لەوە بەهێزتر بین، کە خۆمان بەدەستەوە بدەین.

**- کەواتە ئایندەی زمانی کوردیی چۆن دەبینی؟**

+ شێخ ڕەزا شیعرێکی هەیە دەڵێ: (تری ئەولادی ئەم عەسرە بە کێرم، کە من مردم مەگەر گوو بکەن بەخێرم) زمانی کوردیی، کێ هەیە خزمەتی بکا؟ (عەزیز گەردی) بوو ڕۆیی (مارف خەزنەدار و عیزەدین مستەفا ڕەسوول) ئەمانە هەموو ڕۆیشتن، ئێستە مەیدانەکە چۆڵە لەگەڵ ڕێزمدا، کابرا ئەکادیمییە دوو ڕستەی کوردیی بەباشی نازانێ.

بەڵام زمانی کوردیی، ئەوە سەدان ساڵە ئەو هەموو گەمارۆیەی لەسەرە نەفەوتاوە، قەت نافەوتێ ڕەگی قووڵە، زمانی کوردیی شێوەزاری زۆرە، ئەوەش بۆ زمانەکە سوودبەخشە.

**- تۆش وەکو زۆر لە ئەدیب و نووسەرانی دیکە، شیعرت نووسیووە؟**

+ بە شیعر دەستم پێکرد، بەڵام تیایدا سەرکەوتوو نەبووم.

**- هیچ شیعرت بڵاوکردەوە؟**

+ وابزانم ساڵی ١٩٧١ بوو، لە گۆڤاری (شمس کوردستان) شیعرێکم بڵاوکرایەوە، بەڵام لەگۆشەی خوێنەران، دوایی سەیرم کرد ئەوە بەکەڵکی من نایێ و لەگەڵ شیعر ئەوەندە ئاشنا نیم. زیاتر خولیای چیرۆک و پەخشان بووم، چونکە من پێشتر لە بەغدا زۆربەی زۆری ژمارەکانی گۆڤاری (گەلاوێژ)م خوێندەوە.

**- یانی، دەکرێ بڵێین خولیات بۆ چیرۆکنووسین و پەخشان لە گەلاوێژەوە سەرچاوەی گرتووە؟**

+ من وا هەست دەکەم گۆڤاری گەلاوێژ کاریگەرییەکی زۆری لەسەرم هەبووە، چونکە (شاکر فەتاح، عەلائەدین سەجادی، ئیبراهیم ئەحمەد) ئەم سێ کەسە لە گۆڤاری گەلاوێژ ڕۆڵێکی باڵایان هەبووە.

دوای ئەوە، قۆناغی سەرەتای پەنجاکانیشم خوێندەوە، چیرۆکەکانی (حەسەنی قزلجی) دوای ئەوەش گۆڤاری (شەفەق)یشم خوێندەوە، ئەوانەش هەموویان کاریگەری زۆر گەورەیان هەبوو، ئەوانە هەموویان بوونە پاشخانێک، بۆ ئەوەی زیاتر هونەری پەخشان-م خۆش بووێت.



**لەگەڵ ئەوەی، کە وەکو چیرۆکنووس دەستت پێکردووە، هەر لەو سەروبەندەشدا دەستت بە وەرگێڕان کردووە، ئێستە تۆ خۆت وەکو چیرۆکنووس دەناسێنی، یان وەرگێڕ؟**

+ ئەوە پرسیارەکی تۆزەک قورسە، بەڵام من خۆم هەر بە چیرۆکنووس دەزانم. هەر چیرۆک سەرنجمی ڕاکێشاوە، من ئێستە نزیکەی هەشتا چیرۆکی بڵاوکراوەم هەیە. شەش کۆمەڵە چیرۆکم هەیە شانازییان پێوە دەکەم. ڕەنجم لەگەڵیاندا کێشاوە، پێموایە دەقی چیرۆکەکانی من جیاوازن لەگەڵ چیرۆکی خەڵکی دیکە، زۆر جیاوازن.

**- باشە مەرجە کەسێک، کە چیرۆکی نووسی ڕۆمانیش بنووسێت، یان ئایا مەرجە کەسێک، کە لە چیرۆکنووسین سەرکەوتوو بوو، لە نووسینی ڕۆمانیش سەرکەوتوو بێت؟**

+ نەخێر، مەرج نییە، ئەگەر بەراوردی نێوان هونەری چیرۆک و ڕۆمان بکەی هەندێک لێکچوون لەنێوانیاندا هەیە، وەکو گێڕانەوە، کەسایەتییەکان، بەڵام دونیای ڕۆمان بەربڵاوترە.

چیرۆک چڕکراوەی کۆمەڵێ شتە، چڕ، زۆر چڕکراوەتەوە. جیاوازییەکەیان لەوەدایە، ئەگینا کات، شوێن، تەکنیک و گێڕانەوە لە هەردووکیاندا هەیە، واتە جیاوازییەکەیان لەوەدایە، ئەو چڕکراوەتەوە ئەمیش بەربڵاوتر و فراوانترە.

**- تۆش چەند ڕۆمانێکت نووسیوە، لەخۆت ڕازی بوویت؟**

+ من تا ئێستە دوو ڕۆمانم هەیە، یەکەمیان بەناوی (وتیارێک ڕووی لەکەس نییە) لە ساڵی ٢٠١١ نووسیم، دووەمیشیان (بۆنی بنیادەم) کە باس لە سەربوردەی مەولانا خالید دەکا، بەڵام ڕاستەوخۆنا، بەڵکوو وەک ڕووداوێکی تێهەڵکێش بۆ سەفەرەکەی بۆ هیندستان و گەڕانەوەی.

سەبارەت بەوەش، کە لە خۆم ڕازی بووم؟ ئەری وەڵا ڕازی بووم، چونکە هەستم دەکرد لە ڕۆمانی یەکەمم، کە تۆزێک ڕەمزییە، تەکنیکێکی تایبەت بەخۆمم بەکارهێناوە، کە لەهیچ ڕۆمانێکی دیکەدا نییە، دووەمیشیان، هەرچەندە تۆزێ بەلای مێژوودا سەردەکێشی، بەڵام خاڵی نییە لەتەکنیک و هونەری تازەی ڕۆمان.

**- ماوەیەکە دیاردەیەک دروست بووە زۆربەی زۆری ڕۆماننووسەکان پەنا دەبەنە بەر ڕووداو و کاراکتەرە مێژووییەکان، وەک خۆشت باست کرد، تۆش پەنات بردووەتە بەر مەولانا خالید. تۆ پێت وایە هۆکاری ئەمە چییە؟ لەکاتێکدا دونیای چیرۆک و ڕۆمان، دونیایەکی هێندەی خەیاڵە هێندە واقیع نییە، نووسەر چۆن دەتوانێ ئەو تێکهەڵکێشەیە لەنێوان خەیاڵ و واقیعدا دروست بکات؟**




+ کاک سمکۆ گیان، لێرەیا با سەرچێغ نەچین، هەر دەقێکی ئەدەبیی ئەگەر خەیاڵێکی فراوان و چڕوپڕی تیانەبوو نابێتە ئەدەبێکی تۆکمە، پێم سەیرە تۆ پرسیارەکەت ئاوایە، خۆ من نەهاتوومە باسی مەولانا خالید بکەم وەکو خۆی، بەڵکوو بە خەیاڵ دروستم کردووە، هەندێک شتم باس کردووە، کە مەولانا خالید نەیکردووە خەیاڵی خۆمە و دروست بووە.

**- مەبەستم ئەوەیە تۆ بۆ بە خەیاڵ مەولانا خالیدێکی دیکە دروست ناکەی، بۆ مەولانا خالیدی واقیعی دێنیە نێو ڕۆمانەکەت و بەرجەستەی دەکەی. خۆ چیرۆکنووس و ڕۆماننووسەکان پێشتریش کاراکتەریان لە دەرەوەی ئەو ڕووداوە واقیعیانە بونیادناوە؟**

+ پرسیارەکەت گەلێ جوانە، زۆر مەعقوولە، بەڵام ئەوەشت لەبیر نەچێ دونیای ئەدەب لەگەشەکردن و



**حوسێن عارف چیرۆکێکی بە ناوی (وەچەی یاسای خۆڵ و دۆڵ) بڵاوکردەوە، کە خوێندمەوە، هیچی لێ تێنەگەیشتم تەقەی سەرم دەهات نەمدەزانی باسی چی دەکات**

پەرەسەندن دایە ئەوەی تۆش دەیڵێی راستە، ئەوەی دیکەش هەر راستە، یانی کەلک وەرگرتن لە کەسایەتی مێژوویی دەکرێ بکرێتە خەیاڵیش، چونکە رۆمان دەبێ خەیاڵی نووسەرەکەی تیابێ، دەبێ ئەو خەیاڵە بشگونجێ لەگەڵ رەوتی رووداوەکان، ئەمە شتێک نییە بڵێین تازە داهێنرابێ، ئەگەر نووسەر تەنیا بەو رووت و قووتیە و لە دەروەی خەیاڵ باسی کەسایەتییەکی مێژوویی بکات مانای وایە مێژووی نووسیوەتەوە، چونکە رۆمان جیایە لە مێژوو. لە رەوتی مێژوودا خەیاڵ ئەوەندە کاریگەر نییە، بەڵام رۆمان دەبێ خەیاڵی تیابێ، هەندێک شت لە رۆماندا دروست دەبێ، ئەسڵەن لەژیانی کەسایەتییەکەدا رووی نەداوە، بەڵام ئەوە خەیاڵی نووسەرە دروستی دەکات، کە دواجار ئەوەش کەوتۆتە سەر زەوق و سەلیقەی نووسەر.

**- بەس خەیاڵ، ئەی زمان چ رۆڵێکی هەیە؟**

+ زمان، ئای زمان. زمان کەشتیەوانە، چۆن کەشتییەک لەنێو دەریایەکی پڕ شەپۆل دەڕوا، ئەگەر کەشتیوانێکی نەبێت، رەنگە نقووم بێت و هەموو سەرنشینەکانی بخنکێن. زمانی تۆکمە ئەو کەشتیەوانەیە، کە رووداوەکان بەرەو پێشەوە دەبات، بەڵام زمانێک بەمانای وشە زمان بێت، زمانێکی بە ئاهەنگ و پڕ ئاواز بێت، پڕ بێت لە کۆدی مەعقووڵ و گونجاو، پڕ بێت لە رەوانبێژیی.

**- تۆ تا چەند لەگەڵ ئەوەدای نووسەر پەنا بەرێتە بەر شێوەزمانی ناوچەیی؟**

+ ماوەیەکە هەندێک برادەر پێم دەڵێن تۆ زیاتر شێوەی گێڕانەوەکەت بەرەو گەرمیان و کەرکووک دەبەیت، من تارادەیەک لەگەڵ ئەوەدام، پێویستە ئێمە شارەزاییمان لەسەر شێوەزارەکان هەبێت، هیچ نەبێ، بۆ هەندێک وشە و دەستەواژە و بیانهێنینە نێو شێوەزاری نووسینی ئێستەی باو، مەسەلەن من وشەی لەجیاتی ئەوەی بڵێم (بەدوایا دەگەڕێ) دەڵێم (نەی دەکات) نەی دەکات، یانی لێی دەگەڕێ.

**- تۆ ئامانجت چییە لە هێنانی ئەو شێوە وشە و زاراوە ناوچەییانە بۆ نێو دەقی ئەدەبیی؟**

+ دەمەوێ بڵێم. برۆ لە بادینان، ئامەد، کفری و کەلار وشەیەک وەرگرە. مانای وایە زمانەکەت دەوڵەمەند کرد، من ئەوە ئامانجمە.

**- بەڵام پێت وانییە، بەم هۆیەوە جۆرێک سەرلێشێوان بۆ خوێنەر دروست دەبێ؟ خوێنەر تاوانی چییە سەرقاڵی بکەین بە گەڕان بۆ مانای ئەو وشە و زاراوانە، لە کاتێکدا هەندێک زاراوە و وشە هەن، چەندین ساڵە بەکاردەهێندرێن و هەمووان لێی تێدەگەین؟**

+ راست دەکەی، بەڵام دەزانی زمانیش ئەوەندە لە شوێن خۆی بمێنێتەوە ئەسوێ. زمان پێویستی بە نوێکردنەوە هەیە، پێویستی بەوەیە بەرگێکی تازەی بەبەردا بکرێ، ئەمە زۆر پێویستە، ئێمە زمان و جوگرافیایەکی دەوڵەمەندمان هەیە، بۆیە لەهەر شوێنێک وشەیەک بێنین، زۆر ئاساییە، دەکرێ فەرهەنگۆکەیەکی بۆ دروست بکرێ، من وادەکەم لەکۆتایی هەر دەقێک فەرهەنگێکی بچکۆلە دروست دەکەم، ئەو وشانەی کەم بیستراون، یان هەر نەبیستراون، چونکە دواجار ئەم وشانەش دەبنە وشەی ئاسایی.

**- پێت وانیە ئەمە زیاتر کاری فەرهەنگییە، دەکرێ لە چوارچێوەی پرۆژەی فەرهەنگیا ئەوە چارەسەر بکرێ، نەک لەنێو دەقی ئەدەبیی؟**

+ هەرکەسەو شێوازی خۆی هەیە، دواتر ئەمە ئەرکی ئەکادیمیای کوردییە، من بەش بەحاڵی خۆم زۆر گلەییم لێیان هەیە، داهێنانێکی ئەوتۆیان نییە، بۆیە ناکرێ ئێمەش دەستەوەستان دانیشین و شتەکان دووبارە و سێبارە و سەدبارە بکەینەوە، پێویستمان بەگۆڕان هەیە، من هەر چاوەڕێ بکەم، دەزگایەکی فەرهەنگیی وەک ئەکادیمیا ئەمانەم بۆ بکا، کە نایکەن، من چیان لێ بکەم تۆ باشتری لێ دەزانی قەیچی ئەکا، تۆ بیکە، تۆ لە رێگەی دەقێکەوە دەتوانی کۆمەڵێ وشە بێنی و زیندوویان بکەیتەوە، ئاساییە مرۆڤ ئاوا دەست بەستراو نەبێ.

**- بەڵام دەکرێ ئەمە بۆ وشە و زاراوەیەک بکرێ، کە وشەیەکی گونجاوی کوردییمان بەرانبەری نەبێت. دەکرێ نووسەر لێرەدا پەنا بباتە بەر شێوەزارەکان، یان ناوچەیەکی دیاریکراو لە گەرمیان، یان بادینان.**

**وەکو خۆت باست کرد، بۆ دۆزینەوەی وشەیەک لەبەرانبەر (مەسخ) زۆر ماندوو بوویت، تا توانیوتە وشەیەکی پڕ بە پێستی خۆی بۆ بدۆزیتەوە، بەڵام بۆ هەندێک وشەی دیکەی بەکارهێنراوی باو، پێموایە پێویست ناکا، من زیاتر مەبەستم ئەوەیە.**

+ من ناڵێم تۆ وەرە دەستبەرداری زمانی نووسینی باوبە، ئەوەی کە هەموومان پێی ئاشناین، بەلام دواجار ئەم وشانەش دەبێ زاوزێ بکەن و پەرەبسەنن، شتی دیکەی هاوشانیان بێنین، منیش مەبەستەکەم ئەوەیە. زمان وەکو هەر زیندەوەرێک بەردەوام لە جووڵەدایە و گەشە دەکا. بۆیە دەبێ وشە نەبیستراوەکان بێنینە نێو نووسین، جا لە هەر ناوچەیەک بێت، تۆ بیهێنە و بەکاری بێنە، فەرهەنگۆکەیەکیشی بۆ دروست بکە، با نەوەکانی ئایندە پێی ئاشنا بن. بە پێچەوانەوە ئەگەر وانەکەین زمانەکەمان دەپوکێتەوە.

**- زۆر باشە، بەلام ناوە ناوە هەست دەکەم خەیاڵت دەڕوا و داڵغە لێ دەدەی؟**

+ کەی، ئێستە؟

**- ئێستە و پێشتریش. تێبینیم کردووە داڵغەت زۆرە، خەیاڵت بۆ کوێ دەڕوا؟**

+ وەڵاهی کاکە سمکۆ تۆ پیاوێکی زیرەکی، وەڵاهی ڕاست دەکەی، وەڵاهی قسەکەت ڕێک وایە، من جاری وا هەیە فیکرم دەڕوا.

**- بۆ کوێ دەڕوا؟**

+ لەگەڵ تۆ قسە دەکەم، بەلام بیرم لای دەقێکی ئەدەبییە، بیرم لای شتێکە، کە کەس نەیکردبێ، بیر لەو شتانە دەکەمەوە، هەر لەخۆمەوە وەکو تەونکەر. تەون دەزانی چییە؟ ئەوەی تەون دەکا و دەچنێ مێشکی منیش ئاوایە.

**- یانی داڵغە و فیکرت هەر بۆ نێو دونیای ئەدەبە، یان شتی دیکەش هەن؟**

+ شتی دیکەشی تێدەکەوێ، بەلام بەزۆری ئەمانەیە، من زۆرجار گلەیم لێ کراوە، لە ماڵەوەش گلەییم لێ کراوە، دەڵێن تۆ لەبەر دونیای کتێب و نووسینەکانی خۆت ئاگات لەئێمە هەر نییە. ڕاست دەکەن، جاری وا هەیە لە بەیانییەوە تا ئێوارە، قسەم لەگەڵ یەک کەس نەکردووە، هەر خەریکی ئەو بەزمەی خۆمم.

**- جا شتی تازەت بۆ دێ؟**

***ئێستەشی لەگەڵدا بێ، من حەزم لەشتی باو نییە، ئەوەی کەسانێک لە منداڵییەوە کەوتوونەتە دوای***

+ زۆر، جاری وا هەیە لە وشەی یەکێکەوە شتێکی گەورەم بۆ دێ (تەلعەت تاهیر) دەیناسی، ڕۆژێک لە بەرنامەیەکی تەلەفزیۆنیی، باسی شتێکی کرد گوتی: فیکرەیەک هەیە، خۆزگە یەکێک دەیکردە چیرۆک، گوتی: دەڵێن لەسەردەمی ئەنفال گەنجێک بەڕووی لەنێو شەرواڵەکەی بووە، خۆی و بەرووەکە کەوتوونەتە بەر ئەنفال، دوای ماوەیەک بەرووەکە شین بووە، ئەوە لای من بووە چیرۆک و بڵاوم کردەوە؟ بەناوی (دار بەرووەکەی بنار حەمرین) من کردوومەتە گەرمیانی، باسی ئەو گەنجە دەکەم لەناوچەی قەرەداغ

**- بنار حەمرین، یان بناری حەمرین، ئێوە ئەو (ی)یە بەکاری ناهێنن؟**


جەلیل کاکەوەیس

+ هەموو جار (دکتۆر مارف خەزنەدار) یادی بەخێر دیگوت ئەم کەرکووکیانە دوژمنیان ئامرازی پەیوەندییە، ڕاستیشی دەکرد، بەلام من زەمانم گۆڕاوە، زۆریش گۆڕاوە، بەئاراستەی ئەو زەمانە ئەدەبییە، بەلام کە بیرم کردەوە، گوتم: خۆ کەرکووک نالێ (بناری حەمرین) دەڵێ (بنار حەمرین) منیش ڕێک وام لێکرد.

**- تۆ لەسەرەتای دەست پێکردنت و هاتنە نێو دونیای ئەدەب و خوێندنەوە، خۆت لەنێو چی جۆرە فیکر و فەلسەفەیەک دۆزیەوە؟**

+ من زیاتر لەژێر کاریگەریی (ئەلبێرت کامۆ، سارتەر و کافکا) دابووم، ئەو دونیا عەبەسییە و بێهودەییەم پێ خۆش بوو، دواییش ئەمریکای لاتین و مارکس و ئەمانە. مارکس زۆر کاریگەریی لەمن کرد.

**- یانی بیرکردنەوەیەکی سۆشیالیستیانەت هەبووە؟**

+ پێموایە، ئەگەر خۆمان هەڵنەخەڵەتێنین، هەموو مرۆڤێک، ئەگەر تۆزێ فام بکا و تێگەیشتوو بێت، هەستێکی چەپایەتی هەر هەیە، بەلام من ئێستە تا سەر ئێسقان، خۆم بە مرۆڤێکی نەتەوەیی دەزانم، یەک بستی ئەم خاک، نیشتیمان، میللەت و کوردەوارییەی خۆم بەهەموو دونیا ناگۆڕمەوە. زۆرجار بۆم هەڵکەوتوە برۆم، بەلام هەموو جار گوتوومە پیسترین شوێنی ئەم وڵاتەی خۆم ناگۆڕمەوە بە بەهەشتەکەی ئەورووپا، من دەبێ لێرە بمرم.

**- سەرەتای گەنجیەتیشت هەر ئەوە بیرکردنەوەت بوو؟**

+ هەروا بووم، بەلام مرۆڤ لە قۆناغەکانی تەمەنیا جۆرە یاخیبوونێکی هەیە، هەموو مرۆڤێک ئەم حاڵەتانەی هەیە، بەلام لای من درێژخایەن نەبوو.

**- زۆرجار لە کۆڕ و کۆبوونەوەکان گوێبیستی ئەوە دەبین، کە کورد چیرۆک و ڕۆمانی نییە فیکری نییە کورد هیچ شتێکی نییە، تۆ پێت وایە بەوشێوەیە بێت؟**

***هەموو ئەو کەسانەی عاشقی ئەدەبن، هەمیشە لەهەوڵی ئەوەدان زمانێک بدۆزنەوە تایبەت بێت بەخۆی. ئەو زمانە کوردییەی، من پێی دەنووسم تایبەتە بەخۆم***

+ هەندێک خەڵک هەیە، کورد گوتەنی (تەقە بە تاریکە شەوەوە دەنێن) بۆ دەقمان نییە، بۆ نووسەرمان نییە؟ حوسێن عارف، ڕەئوف بێگەرد، کاکەمەم بۆتانی و موحەممەد مەولوود مەم-مان هەیە. بۆ کەسێکی وەکو (شێرزاد حەسەن) کەمە؟

**- ئەوانەی تۆ ناوت هێنان، هەموویان ڕابردوون. ئەی ئێستە چیمان هەیە؟**

+ بۆ نیمانە؟

**- من نالێم نیمانە، دەڵێم کێمان هەیە؟ ئەو ناوانەی تۆ گوتت هەموویان ڕابردوون، تۆ خۆت، یەکێک لەسەرنجەکانت ئەوەیە، کە دوو دەیەی ڕابردووی حەفتاکان و هەشتاکان، دوو دەیەی دەوڵەمەندترین قۆناغی ئەدەبیی بوون، بەلام کە باسی ئێستە، بە بەراورد بەو دوو دەیە دەکەین ئاسمان و ڕێسمانە؟**

+ کورد گوتەنی ئەم قسەیەی تۆ، ئەم پرسیارەت (هەویرێکە و ئاو زۆر دەکێشێ) ئەو دوو دەیەی حەفتا و هەشتاکان، ئەمە دەبێ شی بکرێتەوە، چونکە لقوپۆپی زۆری لێ دەبێتەوە، کۆمەلایەتی، سیاسیی و ئابووریی. ئەمانە هەمووی کاریگەرییان هەبووە، من نایشارمەوە، ئەوەی لەپێش ڕاپەڕین نووسراوە داهێنانی گەورەی تیایە. لە چیرۆکدا (حەمەفەریق حەسەن و حوسێن عارف)ی تیایە، لەشاعیرەکان، کەڵەپیاوێکی گەورەی وەکو شێرکۆ بێکەسی تیایە (بەری خۆر بە بێژینگ ناگیرێ)

**- ئەی دوای ڕاپەڕین؟**

+ دوای ڕاپەڕین، ئیدی مەبەستەکەی من ئەوەیە، لەدوای ڕاپەڕین تێکەڵوێکەیەک دروست بوو، خەڵک زیاتر ڕووی کردە دونیای سیاسەت و حزبایەتی، تەنانەت لەنێوەندی ئەدەبیش، ئەو حزبانە خەڵکی داهێنەریان ڕاکێشا و لەکەداریان کردن.

**- تۆ لەژیانی خۆتا قەت حزبی نەبوویتە؟**

+ هەرگیز، بەلام سەرەتا، لەکۆتایی شەستەکان لە یەکێتیی قوتابیان ئیشم کردووە، لەدوای ئەوە بە دوای هیچ حیزبێکا نەچووم، تا ئەم کاتە.

**- بۆ پێت وایە ئەدەب هیچ پەیوەندیەکی تۆرگانیی لەگەڵ سیاسەتدا نییە؟**

+ هەشیبێ، دەزانی چۆنە؟ ئەدیبێکی بێلایەن، ئەدیبێک، کە تەواو خۆی تەرخان کردبێت بۆ ئەدەب جیاوازە لەگەڵ ئەدیبێک، کە وابەستەی حزبێک بێت، ئەوەی دووەم

ئەدەبەکەی وردە وردە کاڵ دەبێتەوە، بەڵام ئەوەی خۆی تەنیا بۆ ئەدەب تەرخان کردوە قەت لێی مەترسێ.

**- تۆ چۆن بڕیار لەسەر وەرگێڕانی کتێبێک دەدەیت؟**

+ پێش هەموو شتێک دەقەکە دەخوێنمەوە لە ناوەڕۆکەکەی و تەکنیکەکەی ورد دەبمەوە، بەبێ ئەوەی بزانم نووسەرەکەی کێیە. نموونەیەکت بۆ دەگێڕمەوە. ساڵی ٢٠٠٧ دەقێکم خوێندەوە، کە ڕۆمانێکی (جەنگیز ئیتماتوف) بەناوی (ویطول الیوم اکثر من قرن - ڕۆژێک لەسەدەیەک درێژتر دەبێت) خوێندمەوە یەکجار سەرنجی ڕاکێشام، زۆر پێی سەرسام بووم.

**- ناونیشانەکەی سەرنجی ڕاکێشایت؟**

+ ناونیشانێکی غەریب بوو، زۆر سەرنج ڕاکێش بوو، ڕۆژێک بەقەد سەدەیەک کارەسات تیایا ڕوودەدات. ناوەڕۆکەکەی لەوچوارچێوەیە دابوو، شتی وای تیایە پیاو سەری سوڕ دەمێنێ، زۆر عەزیمە، ساڵی ٢٠٠٧ تەرجوومەم کرد

**- تۆ پێڕەوی چ شێوازێکی وەرگێڕان دەکەی؟**

+ ئەم پرسیارە زۆر جوانە، من نایەم وشە بە وشە، ڕستە بە ڕستە تەرجوومە بکەم، من پەرەگرافێک دەخوێنمەوە، ئەگەر هەستم کرد ئاڵۆزییەکی تیایە جارێکی دیکەش دەیخوێنمەوە، کە لێی تێگەیشتم ئینجا دێم بەزمان و شێوازی خۆم دایدەڕێژمەوە، هەندێک وەرگێڕانم خوێندۆتەوە، هەستم کردووە وشە بەوشە ڕستە بەرستە تەرجوومەی کردووە، واتاکەی لەنگە.

**- بەڵام پێت وانیە هەندێک وشە دەبێ وەکو خۆی تەرجوومە بکرێ؟**

+ جاری وا هەیە پەراوێزی بۆ دەنووسم، هەندێک وشەی لاتینی هەبووە، لەپەراوێزدا ڕوونم کردووەتەوە، بەڵام کردوومەتە یەک وشەی کوردیی و لەگەڵی ڕێکم خستووە.

**- ڕات چییە لەسەر دووبارە و چەندبارە وەرگێڕانی بەرهەمێک؟**

+ بێ مەعنایە.

**- چۆن بوو، بیرت لەوەکردەوە چل ڕێساکەی عەشق-ی (ئەلیف شەفەق) تەرجوومە بکەیت**

+ بە سودفە بوو، لەپێشانگەی نێودەوڵەتی کتێب بەرچاوم کەوت، تۆزێکم لێ خوێندەوە، هەستم کرد سەرنج ڕاکێشە، باسی (جەلالەدینی ڕۆمی و شەمسی تەبریزی) دەکات، لەپاڵ ئەوەش بە تەکنیکێکی جوان نووسرابوو، بڕیارم دا تەرجوومەی بکەم، دواتر دەزگای سەردەم بۆیان چاپ کردم، تا ئێستەش چوار جار چاپ کراوەتەوە. دواتریش بەرهەمێکی دیکەی ئەوم بە ناوی (کوڕەی شەیدا و مامۆستاکەی) کردە کوردیی.




**- تەرجوومەکردنی چل ڕێساکەی عەشق چەندی خایاند؟**

+ وابزانم چوار مانگی پێچوو.

**- پێت وایە چوار مانگ بەسە بۆ وەرگێڕانی بەرهەمێکی لەوشێوەیە؟**

+ ئاخر، من شەو و ڕۆژ ئیشم تیایا کرد، وازم لەهەموو شتێک هێنابوو.

**- پێشتر ئەلیف شەفەق-ت دەناسی، ناویت گوێ لێ بیوو؟**

+ نەخێر، بەهیچ شێوەیەک.

**- تێگەیشتنت بۆ ئەلیف شەفەق وەک ڕۆماننوسێکی تورک چییە، لە کاتێکدا ئێستە زۆربەی بەرهەمەکانی تەرجوومەی کوردیی کراون؟**

+ من یەکەم کەس بووم، بەرهەمی ئەوەم کردە کوردیی، ڕۆماننووسێکی گەورەیە، ئەوەی من تێگەیشتبم لەگەڵ سیاسەتی ئێستەی تورکیا دانییە، ئەو زیاتر بەرەو دونیای مرۆڤایەتی کراوەتەوە، هەست بە مافی نەتەوەکانی دیکە دەکات، ڕاستییەکەی ئەلیف شەفەق، یەکێکە لە نووسەرەکانی ئێستەی تورکیا، کە لەدوای ئۆرهان پامۆک، ناوبانگێکی گەورەی هەیە.

**- بەڵام تێبینی ئەوەی لەسەر هەیە، ڕەخنەی لێدەگیرێ،**



**– کە جۆرێک لە جیاوازیی نەتەوەیی لە ڕۆمانەکانیدا هەستی پێدەکرێ، تۆ هەستت بەوە کردووە؟**

+ ئەو شتانەی من خوێندوومنەتەوە، بەو شێوەیە نییە، من پێموایە، کە دەڵێی نووسەری گەورە، جا لەهەر نەتەوەیەک بێ، بەچاوێکی مرۆڤدۆستانە تەماشای هەموو گەلانی دونیا دەکا، ئەگەر وانەبوو، مانای وایە بۆشاییەک لەکەسایەتیدا هەیە، ئەدیب زۆر فراوان

> ***مەبەستم ئەوەیە باوک و دایکم بەزمانێکی پاراو قسەیان دەکرد، من هاتم سوودم لەو زمانپاراوییەی ئەوان وەرگرت و لەنێو دونیای کتێب و خوێندنەوە پەرەم پێدا***

دەڕوانێتە ئەم دونیایە، مرۆڤ لای ئەو چەقی هەموو شتەکانە، بەڵام بەداخەوە نووسەری خۆفرۆش، عەقڵ شێواو و دۆڕاویش هەن، ئەمانە هەریەکە و بەجۆرێک لێیان دەڕواندرێ، پێموانییە (ئەلیف شەفەق) لەو کەسانە بێ.

**– کەواتە تۆ چۆن دەڕوانیتە نووسەری سەرکەوتوو؟ نووسەر مەرجە هەڵوێستی هەبێ لەبەرانبەر هەموو ئەوەی، کە ڕوودەدات؟**

+ بەدڵنیاییەوە، زوڵم لەهەر شوێنێک هەبێ، ئەو دژی دەوەستێتەوە، چۆن دەکرێ من دڵم نەکەوێتە ئازار بۆ بریندارێکی ئۆکرانیا، یان ڕووسیا، یان ئەوەی لە غەززە و ئیسرائیل ڕوودەدات، لە هەردوو لایان مرۆڤ دەکوژرێ. مرۆڤ خەڵاتی خوایە بۆ ئەو گەردوونە، تۆ چۆن دەتوانی دەستکاری بکەی، پێم سەیرە مرۆڤ ئەوەندە بیرتەسک بێ، بەهۆی خراپەکاری یەک کەس لەنێو نەتەوەیەکدا، تەواوی نەتەوەکەت لەبەرچاو بکەوێ، شتی وا چۆن دەبێ. نووسەری ڕاستەقینە نووسەرێکە پەیامەکەی بۆ ئاشتی، مرۆڤدۆستی و پێکەوەژیانە.

**– تۆ چۆن دەڕوانیتە مەسەلەی ترس لەناخی هەر نووسەرێکدا؟ ترس لای تۆ چییە؟ دەکرێ نووسەر بترسێ؟**

+ ڕەنگە ترس لە نووسین لای هەریەکەمان جۆرێک بێت، بەومانایەی نووسەر لەوە بترسێ، کە ئاخۆ دەبێ ئەوەی دەینووسێ بەدڵی خوێنەر بێ، تو بڵێی دڵی یەکێک زویر نەکا، یان ئەم نووسینەی لەئاستی نووسینەکانی دیکەی نەهێنێتەخوارەوە. بە کوردییەکەی لە شکۆی خۆی بترسێ، پێموایە ئەو ترسە وەهمێکی بێ واتایە. نووسەر، کاتێک دەکەوێتە سەر ڕاستەڕێ و ڕێچکەی خۆی ئیدی ترسی نامێنێ، ئەگەر هەشبێت هیچ مانایەکی نییە.

**– تۆ هیچ شتێک هەیە لێی بترسی؟**

+ من لەهیچ ناترسم. ڕەنگە دەقێ بنووسم وەکو دەقێکی ساڵی لەمەوپێشترم بەهێز نەبێ، دوایێ خۆم بیر دەکەمەوە و دەڵێم هەر دەقە و لەدایکبووی ساتەوەختی خۆیەتی، لەوانەیە ئەوکات بیرکردنەوەم، تێڕوانینم، وشیاریم بۆ دەوروبەرم لەگەڵ ئێستە جیاواز بووبێت، لەبەر ئەوە پێویست بەترس ناکا.

زۆر ئاساییە نووسەر دەقێکی باش، یان مامناوەند، هەندێک جاریش دەقێکی خراپ بنووسێ، چونکە مرۆڤ لە ژیانیدا لە دۆخێکدا نامێنێ.

**– ئێستە دۆخی ڕۆمانی کوردیی چۆن دەبینی؟**

+ لە دۆخێکی باشدا نایبینم، چونکە ئێستە ئەو خەیاڵە بەپیت و چڕوپڕەی جاران نەماوە، هۆیەکەشی ئەوەیە، خەڵکی تێکەڵی ئەم دونیای تەکنەلۆجیا تازەیە بووە، دونیای مۆبایل و ئایپاد و بەزم و ڕەزم، بتەوێ و نەتەوێ، کاریگەریی خۆی هەیە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتیی ئەو جۆشوخرۆشەی جاران نەمایە، من وای تێدەگەم.

**– تۆش لە نووسینی ڕۆمان بەردەوام نەبوویت، هەر ئەودوو ڕۆمانەت نووسین، کە باست کرد؟**

+ بەردەوام نەبووم، ئەگەرچی ماوەیەکە خەیاڵی ڕۆمانێک لەمێشکمایە، بەڵام نازانم کەی دەستی پێدەکەم، ڕەنگە وەرگێڕان زیانی پێم گەیاندبێ، کاتێک خەریکی کارێکی وەرگێڕان دەبم، دەبێ کارەکەی خۆم فەرامۆش بکەم.

**– وەرگێڕان چی پێت بەخشیوە؟**

+ لەزەتێکە. کاتێک تێکەڵی ئەو دونیایە دەبم، بەتایبەتی لە وەرگێڕانی ڕۆماندا، چونکە زیاتر هەوڵدەدەم بە زمانێکی تایبەت بەخۆم تەرجوومەکە بکەم.

**- هەست دەکەم زۆر عەوداڵی زمانی؟**

+ ئەری وەڵا زۆر، زۆر حەز دەکەم زمانێکی تایبەت بەخۆم هەبێت، بەردەوام هەوڵدەدەم هەندێک وشەی لەولاو لەملای فەرامۆشکراو بێنم و زیندوویان بکەمەوە، من ئەوەم زۆر مەبەستە.

**- یەکێک لەو گرفتانەی زۆر قسەی لەبارەوە دەکرێ، یەکدی نەخوێندنەوە و بەهەند وەرنەگرتنی دەقی خۆمانەیە، هێندەی چاومان لەسەر بەرهەم و نووسەرانی بیانییە، هێندە چاومان لەسەر نووسەر و دەقی خۆمانە نییە؟**

+ لێرە لە نێوەندی ئەدەبیی لەنێو نووسەران جۆرە ئیرەییەک هەیە، یەکدی ناخوێنینەوە، ئەوەش بۆ خۆی نەخۆشییەکی دەروونییە لای نووسەری کورد.

**- تۆ باوەڕت بەوە هەیە، کاتێک نووسەر ڕۆمانێک دەنووسێ، ئەو شوێنەی لە ڕۆمانەکەیدا باسی دەکات سەردانی کردبێت و بینیبێتی، یان هەر لە خەیاڵی خۆی وێنای بکات؟**

+ ئەمەی تۆ باسی دەکەی بابەتێکی هەستیارە. ئەگەر ڕۆماننووسەکە بچێت ئەو شوێنە رووماڵ بکا، کە دەیەوێت لە ڕۆمانەکەیدا باسی بکات، بێت و وەکو خۆی بیگوازێتەوە هیچ مانایەکی نییە، ئەی خەیاڵەکەی خۆی لەکوێیە؟ من پێموایە هەموو دەقێکی ئەدەبیی لەسەر خەیاڵ بونیاد دەنرێ. من هەندێک چیرۆکم هەیە ئەو شوێنەم هەر نەبینیوە، کە باسم کردووە، بەڵام خوێنەر، کە دەیخوێنێتەوە هەست دەکا شوێنەکەی لا ئاشنایە.

**- سەفەرت کردووە بۆ دەرەوەی وڵات؟**

+ تەنیا چوومەتە تورکیا و ئێران.

**- پێت وانییە سەفەرکردن بۆ نووسەر، بۆ چیرۆکنووس و ڕۆماننووس زۆر گرنگە؟**

+ ئەو پرسیارەم زۆر لێکراوە، هەمووجار دەڵێم، من لە ڕێگەی خوێندنەوەی ڕۆمانەکانی جیهانیی هەموو دونیام بینیوە.

**- پێتوایە ئەوە بەسە بۆ نووسەر؟**

+ پێموایە باشتریشە، ئەگەر من تەنیا وەکو جەستە چووبمە ئەوێ، ئەوە لەنێو خەیاڵم کاریگەریی نابێ، بەڵام ئەگەر بەخەیاڵ بێت، پێموایە نوسەرەکە زیاتر توانای بەسەردا دەشکێ.

**- ئەو مامۆستایانەی لە کەرکووک دەرسیان پێگوتییت، کەسیانت بیرماوە؟**

+ مامۆستایەکمان هەبوو لە قۆناغی ئامادەیی دکتۆر (ویسام عوسمان) بیرمە ساڵی (١٩٦٨ ـ ١٩٦٩) دەرسی عەرەبی پێمان دەگوت، ئەو مامۆستایە جاری واهەبوو دەرسەکەی تەواو دەکرد دەچووینە نێو دونیای کتێب، بۆ یەکەم جار ناوی (سارتەر)م لەو گوێ لێبوو، بەڵام لە قۆناغی سەرەتاییم لەم گوندی حەسارە مامۆستا (لەتیف عەبدولرەحمان) هەبوو، تا ئێستەش لە شێوەی نووسین لاسایی دەست وخەتەکەی ئەو دەکەمەوە

**- ئێستەش تۆ هەر بەدەست دەنووسی؟**

+ ئێستەش هەر بە دەست دەنووسم، بەڵام خۆم تایپی دەکەم، لەبەر ئەوەی لە نووسینا زۆر بەتەنگ مەسەلەی

> ***ئەگەر نووسەر تەنیا بەو ڕووت و قووتیە و لە دەرەوەی خەیاڵ باسی کەسایەتییەکی مێژوویی بکات مانای وایە مێژووی نووسیوەتەوە***

زمان و تەکنیکەوەم، ئەو ڕۆمانانەی، کە تەرجوومەم کردوون، ئەوانەشی، کە نووسیومن زێدەڕۆیی نەبێت هەر یەکەی سێ چوار جار نووسیومنەتەوە، چونکە دڵم ئاو ناخواتەوە، دەمەوێ دەقێکی تۆکمە بێ، هەر کتێبێکم ڕەنگە جاری وا هەیە شەش مانگی خایاندووە، ڕازیش نابم کەس دەستکاری نووسینەکانم بکات.

**- دوای شازدە ساڵ ژیان لە بازیانی سلێمانی، دواجار چۆن بوو ڕووتکردە هەولێر؟**

+ لەبەر خوێندنی منداڵەکان، منداڵەکانم هەمووی تازە خەریک بوو بچنە زانکۆ، لەگەڵ ئەوەشدا با ڕاستگۆ بم لەگەڵتا، ئەوکاتە زۆر دەستم کورت بوو، بەدوای ئیشێکدا دەگەڕام، بەتایبەتی کاری ڕۆژنامەنووسیی، بە سوتفە تووشی (زاهیر ڕۆژبەیانی) بووم گوتی: وەرە لای ئێمە ببە بە (هەڵەچن) چوومە ڕۆژنامەی برایەتی، دوایی وەک نووسەر لای ئەوان ئیشم کرد، بەبێ وابەستەیی حزبی، خوا وەکیلە یەک لەحزە حزبایەتیم نەکردووە.

**– له چ ڕۆژنامەیەکی دیش کارت کردووە؟**

+ ساڵی ١٩٩٥ له ڕۆژنامەی ئاڵای ئازادی-یش ئیشم کردووه، لاپەڕەیەکی ئەدەبییان هەبوو، من سەرپەرشتیم دەکرد.

**– تۆش وەک زۆر نووسەر و ئەدیبی دیکە دوای کۆتایی هاتنی ڕێکەوتننامەی ئازار لە ساڵی ١٩٧٤ چوویتە شاخ؟**

+ بەڵێ چووم، ساڵێک لەشاخ بووم. ئەوکاتە قوتابی دواقۆناغی زانکۆ بووم، دوو مانگ مابوو تەواو بم، ئەوکاتە بوو، کە ئەندامی یەکێتیی قوتابیان بووم، کۆمەڵێ برادەر گیران، منیش چوومە شاخ و ساڵێک لەپاش ئەوەی شۆڕش هەرەسی هێنا گەڕامەوە و چوومەوە زانکۆ. ئەمە دوای ئەوەی چوار مانگیش لە ئێران مامەوە و وەک مامۆستا دەرسم گوتەوە.

**– له چ ناوچەیەک بوویت و کێت لەگەڵ بوو؟**

> ***زمانیش ئەوەندە لە شوێن خۆی بمێنێتەوە ئەسوێ. زمان پێویستی بە نوێکردنەوە هەیە، پێویستی بەوەیە بەرگێکی تازەی بەبەردا بکرێ***

+ لە ئۆردوگایەک بوو پێیان دەگوت (ئەنزڵ) دەکەوێتە نێوان کرمانشان و قەسری شیرین چوار مانگ لەوێ بووم، دواتر لەگەڵ نەوزاد ڕەفعەت و حەمەکەریم عارف، بەیەکەوە هاتینەوە

**– ئەوکاتە ژنت هێنابوو؟**

+ نەخێر، هێشتە ژنم نەهێنابوو، من بزەبت لە ١٩٧٥/٦/٢٥ ژنم هێنا.

**– ژنت هێنا، یان بۆیان هێنایت؟**

+ بۆیان هێنام، باوکم بۆی هێنام، بەڵام دەتوانم بڵێم خێزانێکم هەیە لەهەموو دونیام خۆشتر دەوێ. ئەو بۆتە هەموو شتێکی من، دەستوپێمە. ئێستە ئەو نەبێ لە ماڵەوە هیچم بۆ ناکرێ، من پێش گواستنەوە عاشقی نەبووم، بەڵام کە بوو بەخێزانم عاشقی بووم، تا ئێستاش عاشقیمە.

**– کەواتە تێڕوانینی تۆ بۆ ژن چییە؟**

+ ئەم گەردوونە ژنی تیا نەبێ کاولە. ژن جوانیی ژیانە. ژن مایەی بەختەوەری ئینسانە. هەموو ئینسانێکە. ژن لەهەر شوێنێ بێ، ئەو شوێنە ئاوەدانە ئەو شوێنە بەرەونەقە، ئەو شوێنە جوانە، ژن خەڵاتێکە خوا بەئێمەی بەخشیوە.

**– چەند منداڵت هەن؟**

+ پێنج منداڵم هەنە، دوو کچ و سێ کوڕ.

**– ناوەکانیان کوردین؟**

+ وەڵا هەموو کوردین، کچەکانم: ژیان و میدیا، کوڕەکانیش: هانا، ئاکار و هێژا.

**– ئەو ناوانەت بە چ بەمەبەستێک لێناون؟**

+ ئەوەی ڕاستی بێت هیچ مەبەستێکم نەبووە، تەنیا لە ناوێکی کوردی گەڕاوم، مۆسیقایەکی تیابێ و خۆش بێت. تەنیا ناوی ئاکار، ئەوەی ڕاستی بێ وشەیەکە لە هێمنی شاعیر وەرمگرت. لە دیوانەکەی هێمن خوێندمەوە، سەیرم کرد فەرهەنگۆکێکی بۆ کردووە وشەی ئاکار یانی (ئەخلاق - ڕەوشت) بەدڵم بوو. ئاکار لەبازیان لە دایکبووە، لەخەستەخانەکە، کە تۆمارکرا، ئیدی ئەوناوە بڵاوەبووەوە، ئێستە لەبازیانیش زۆرکەس ناویان لێناوە ئاکار.

**– کاکەوەیس، ناوی ئەسڵی باوکتە، ئەی یەکەم بەرهەمت هەر بەناوی (جەلیل کاکەوەیس) بڵاوکردەوە؟**

+ من ناوم (جەلیل کاکەوەیس ئیسماعیل)ە کاکەوەیس ناوی باوکمە، حەکیم برازامە (حەکیم عەبدوڵڵا کاکەوەیس) یەکەم بەرهەمم، ئەو چیرۆکەی کە باسم کرد، بەناوی (جەلیل حەساری)یەوە بوو، دوو چیرۆکم بەوناوەوە بڵاوکردووەتەوە، دوای ئەوە یەکسەر گۆڕیم، کردمەوە (جەلیل کاکەوەیس).

**– بۆ گۆڕیت؟**

+ سەیرم کرد ناوی باوکم، ناوێکی دەگمەنە، ناوێکە بۆنێو دونیای ئەدەب خۆشترە، دواتر بیرم کردەوە یانی چی، من خەریکی ناوچەگەریەتی بم.

**– ئەو زەمانە باوبوو هەموو کەسێک نازناوێکی هەبوو؟**

+ وایە، من ئەوکاتە بیرم لەوە کردەوە گوتم من دوای ئەو هەڵایە ناکەوم، ناوی باوکم لەهەمووی بە ئاهەنگترە.

**– نـاوەکـەی خـۆت پێـخـۆشـە یـان قـەت بـیـرت لـەوە کردووەتەوە بیگۆڕی؟**

+ نەخێر، ئێستە هەست دەکەم، لەهەر شوێنێ ناوم بێ خەڵک دەمناسێ، ناوی جەلیل، بەعەرەبی یانی (بەهادار - بەنرخ) ئیدی بۆ پیم ناخۆش بێ، کاکەوەیس-یش لە کوردستان زۆر دەگمەنە، دەبێ شانازیی پێوەبکەم.

**- هەست دەکەم پەیوەندییەکی تایبەت لەنێوان تۆ و حەکیم کاکەوەیسی برازات هەبووە؟**

+ ئێمە یەک تەمەن بووین، من سێ مانگ لەو گەورەتر بووم، لەژیانمدا هیچ کەسم ئەوەندەی ئەو خۆشنەویستووە، تەنانەت براکانیشم.

**- تەنانەت خێزانەکەشت؟**

+ نا. ناوەڵا. نا، خێزانەکەم جیایە. خێزانەکەم ڕەگی لەنێو ڕوحمایە، لە دڵمایە.

**- پەیوەندییەکانتان پەیوەندییەکی ئەدەبی بوو، یان پەیوەندییەکی زیاتر کۆمەڵایەتی؟**

+ پەیوەندی من و حەکیم، پەیوەندییەکی خوڕسکانە بوو. حەکایەتێک لەژیانیایا هەیە، بەمنداڵی باوکی و دایکی لەیەک جیابوونەتەوە، حەکیم هاتوتە ماڵی ئێمە، هاوتەمەنی منیش بووە سێ بۆ چوار ساڵ هەر لە ماڵی ئێمە بووە، کە لە سوید-یش گەڕایەوە، نەچووە لای هیچ کەسێک، بارگەی لای من خست گوتی: من لای تۆ دەژیم، پەیوەندییەکی ڕۆحی ئەوتۆمان هەبوو، ناتوانم وەسفی بکەم.

**- ئەو لەژێر کاریگەری تۆدا بوو، یان تۆ لەژێر کاریگەری ئەودا بووی؟**

+ نازانم، بەس ئەوەندە دەڵێم من پێش ئەو دەستم پێکردووە.

**- ئەی پەیوەندی عەزیز گەردی لەگەڵ حەکیم کاکە وەیس لەکوێوە سەرچاوەی گرتبوو، تۆش هاریبەتیتان لەگەڵی هەبوو؟**

+ وەڵاهی حەزم لەو پرسیارە نییە کاک سمکۆ، داوای لێبووردن دەکەم.

**- چۆنت لە حوسێن عارف ڕوانیوە، ڕات لەسەری چییە؟**

+ لەدونیای چیرۆکدا بە مامۆستای خۆمی دەزانم.

**- دەکرێ بڵێین، کاریگەریی لەسەر تۆ هەبووە؟**

+ من نالێم کاریگەریی، بەڵام خوێنەرێکی چاکی ئەو بووم. من کابرایەکی خوڕسکانەم، بەهەوڵ و ماندووبوون و بیرکردنەوەی خۆم، ئەوەی هەیە بەدەستم هێناوە، پێموانییە یەک وشەیەکم لەژێر کاریگەریی هیچ کەسێکدا بێ.


حەکیم کاکەوەیس برازای جەلیل کاکەوەیس

**- ئێستە تۆ سەرقاڵی چیی، لەو دیوەخانەی، کە لێرە لە گوندی حەساری گەورە دروستت کردووە؟**

+ تۆ یەکەم کەسی دێیتە ئێرە. سمکۆ عەبدولکەریم. یەکەم کەسە دێ دیدارێکم لەگەڵ دەکا لەنێو ئەم بەهەشتە تازەیە.

**- ئێرە لای تۆ بەهەشتە؟**

+ بەهەشتە. ئێرە زێدی منە، ڕاستە کوردستان وڵاتی منە، بەڵام لە کوردستانیش ئەم حەسارە بەهەشتەکەی منە.

**- بەڵام تۆ دەڵێی لە ساڵی ١٩٦٤-ەوە بەجێم هێشتووە سەرم پیانەکردوەتەوە؟**

+ ئێ، ئاخر ڕۆژگار ئەوەی بەسەرما سەپاندبوو، ئەگینا من لێرە بێزار نەبووم، ڕاستە زۆر خۆشەویستم لێرە

***زمان وەکو هەر زیندەوەرێک بەردەوام لە جووڵەدایە و گەشە دەکا. بۆیە دەبێ وشە نەبیستراوەکان بێنینە نێو نووسین، جا لە هەر ناوچەیەک بێت***

نەماون، زۆربەیان سەریان ناوەتەوە، بەڵام من هی ئەو خاک و خۆڵەم، کاکە سمکۆ. ئەمەشم بۆیە کردووە، ئەوها ناوبەناو هەروەکو چۆن من و تۆ بە خەڵوەتی دانیشتوین و ئەم دیدارە دەکەین، ناوبەناو دێم لێرە خەریکی نووسینی خۆم دەبم، ئەوها دێمە هەوارگەکەم (هەوارگە تازەکەم).

**- ئێستە خەریکی نووسینی چیی؟**

+ خەریکی تەرجوومەکردنی ڕۆمانێکی (جەنگیز ئێتماتۆف)م بەناوی (کاتێک چیاکان هەرەس دێنن) عینوانێکی فەرعیشی هەیە بەناوی (بووکە نەمرەکە)

**- چ ڕووداوێک لەژیانتدا هەیە و لەبیرت ناچێتەوە؟**

+ مردنی دایکم، قەت بیرم ناچێ، ئێستەش بەو تەمەنەوە، کە دایکم دێتەوە بیر، هەست بەمنداڵی خۆم دەکەم. هەست دەکەم ئێستەش منداڵم، جاری وا هەیە دەگریم، بیانوو دەگرم، داوای شتێک دەکەم، کەچی هەست دەکەم کەس نییە بۆم بکا.

**- ئێستە لەژیانتدا زیاتر بەچی ماندووی، چی ماندووت دەکا؟**

+ ناکۆکی و ناتەبایی میللەتەکەم زۆر ماندووی کردووم، بڕوایێت بێ، کە سەیری میللەتانی دیکە دەکەم، تەبان و خەریکی پێشکەوتنن، گەنجی خۆیان هان دەدەن پێیان بگەیەنن، کەچی لای ئێمە تەقەی سەری دێ، ئەوە ئازارم دەدا، ناتەبایی میللەتەکەم زۆر ئازارم دەدا.

**- لەگەڵ کتێب خوێندنەوە چۆنی؟**

+بەردەوامم، بەیارمەتی عەینەکەکەم و ڕووناکی زیاتر، دەتوانم لە خوێندنەوە بەردەوام بم، چاوم تۆزێ کز بووە، بەڵام هێشتە کۆڵم نەداوە

**- زیاتر چی دەخوێنیتەوە؟**



+ زیاتر ڕۆمان دەخوێنمەوە، زۆر بەکەمی سەیری تەلەفزیۆن دەکەم

**- ئەی لەگەڵ گوێگرتن لەگۆرانیی چۆنی؟**

+ زۆر حەزی لێ دەکەم، بەتایبەتی مەقامی (ئای ئای)

**- لەبەر خۆتەوە گۆرانیی دەڵێی؟**

+ جاربەجار مەقامی ئای ئای دەڵێمەوە (کۆپلەیەکی گوت) بەمشێوەیە، تەسجیلی مەکە، ئیدی زۆر حەز لە مەقامەکانی (عەلی مەردان و سیوە) دەکەم، بەبرای خۆم بڵێم (خودادادعەلی) گۆرانییەکی هەیە (ئەڵوەند) گەلێ خۆشە (تایەر تۆفیق) و ئەوانی دیکەش (بەهجەت یەحیا و عەدنان کەریم) حەزیان لێ دەکەم.

**- دەست خۆش، وابزنم ماندووم کردی؟**

+ وەڵا تۆزێ هەست بەماندوویەتی دەکەم، بەڵام قەت دڵت ناشکێنم.











# هونـــەر

- **نمایشی میوانیَکی دوور لەبەر ڕۆشنایی تیۆری وەرگرتندا**

حەمەسوار عەزیز

# نمایشی میوانێکی دوور

## لەبەر ڕۆشنایی تیۆری وەرگرتندا




محەممەد قازی  ئاسۆ ڕەفیق  بابان عومەر  دیدار عومەر  سان سوارە  کاڵێ سەباح  لوقمان عومەر

کۆژین جوانڕۆ  ژینۆ کەیوان  نێچیر خەلیل  مەتین هێژا  میران ئازاد  ڕۆژان کارزان

دەرهێنەر **ڕاڤیار نەوزاد**  نووسەر **بەختیار عەلی**  بەرهەمهێنەر **بلهۆز نەسرەدین**

بەڕێوبەری بەرهەمهێنان شکار جەبار  بەڕێوبەری هونەری ئارام لەحمەد  بەڕێوبەری مارکێتین ڕەها حەسەن  مۆزیکدانەر شلد حەیدەر

تیمی بەڕێوبردن بەرزی لەسرەدین  یاد بەختیار  محەممەد خالید  سەهەند بەهادین  تیمی بەڕێوبردنی هونەری هێوری عەلی  بەرهەم عەزیز

تیمی مۆزیک داستان ڕزگار  شاگوڵ جەلال  ژیار گۆران  تیمی مارکێتین ئاراز حەسەن  محەممەد سێلمان

تیۆری وەرگرتن (التلقی) یەکێکە لەو تیۆرە ڕەخنەییە پۆست مۆدێرنانەی، بایەخی سەرەکی بە وەرگر دەدات، وەک داهێنەری دووەم و هاوتای داهێنەری یەکەم، کە نوسەر و هونەرمەندە.

ئەم تیۆرە ڕەخنەییە جیاواز لە هەموو تیۆرە ڕەخنەییەکانی پێش خۆی، کە هەمیشە، لە هەموو بوارە مێژوویی و کۆمەلایەتی و سایکۆلۆژییەکانەوە، بایەخیان بە خودی تێکست، دونیای تێکست، کۆدەکان، بونیادەکانی و نووسەری تێکست داوە.

ئەم تیۆرە بەتەواوی چاوی لەسەر بینەر و وەرگرە، وەک کۆتا داهێنەری تێکست مامەڵەی لەگەڵ دەکات، مەرجەعیەت و بنەمای ئەم تیۆرەش بۆ هەبوونی کاریگەریی فۆرمگەرا ڕووسەکان و فەلسەفەی دیاردەگەرایی و تیۆری هێرمۆنیتیک بۆ سەر داهێنەرانی ئەم تیۆرە ڕەخنەییە دەگەڕێتەوە، کە بایەخی زۆر بە ئەدەبیاتی ئەدەب، ئامادەیی فۆرم، زمانی ناباو و بەشداری وەرگر لە نووسینەوە و داتاشینی مانا دەدەن، بەتایبەت فەلسەفەی دیاردەگەرایی، کە دووپاتەی ئەوە دەکاتەوە، هیچ داهێنانێکی ئەدەبیی، یان هونەریی لە دەرەوەی وەرگرێکی بە ئاگا بوونی نییە، بەو مانایەی هەموو داهێنانە ئەدەبیی و هونەرییەکان ئەوکاتە بەها وەردەگرن، کە وەرگرێک بەر ئەو داهێنانە دەکەوێت، درکی پێدەکات و مانا، بەها و بوونی پێدەبەخشێت.

ئەم تیۆرە ڕەخنەییە، سەر بە ڕەخنەی پۆست مۆدێرنە، سەرەتای سەرهەڵدانی بۆ سەرەتای شەستەکانی سەدەی ڕابردوو دەگەڕێتەوە و لەسەر دەستی هەردوو فەیلەسوفی ئەڵمانی (هانز یاوس و ڤۆڵفانگ ئیزەر) کە مامۆستا بوون لە زانکۆی کۆنستانسی لە ئەڵمانیا، تیۆرە ڕەخنەییەکەش پێداگری لەسەر ڕۆڵی وەرگر و بینەر دەکات، وەک داهێنەرێکی هاوتای داهێنەری تێکستە ئەدەبییەکە، یان هونەرییەکە.

ئەم تیۆرە ڕەخنەییە لەسەر چوار بنەمای سەرەکی وەستاوە، هەوڵدەدەین لە ڕێگەی خوێندنەوەی نمایشی شانۆیی (میوانێکی دوور)ی نوسەر و ڕۆژنامەنووس بەختیار عەلی و دەرهێنەر ڕاڤیار نەوزاد، هەڵوەستە لەسەر هەر چوار بنەماکە بکەین و نمایشە شانۆییەکەی ڕاڤیار بخەینە نێو مەرجەعییەتەکانی ئەم تیۆرە ڕەخنەییە و شیکردنەوە و خوێندنەوەی بۆ بکەین.

### ئاسۆی پێشبینی

یەکێک لە گرنگترین بنەماکانی ئەم تیۆرە ڕەخنەییە لەسەر ئاسۆی پێشبینی وەرگر وەستاوە، ئەم تیۆرە بایەخ بە ئاسۆی پێشبینی وەرگر دەدات بۆ هەر کارێکی هونەریی و ئەدەبیی و توانای کارەکە لە تێکشکاندنی ئەو ئاسۆیەی، کە وەرگر لەو کارە چاوەڕێی دەکات، ئەم پێشبینییەی وەرگر لە سێ فاکتەر سەرچاوە دەگرێت:

یەکەمیان ڕەگەزی کارەکەیە، بەو مانایەی، کە وەرگر دەچێتە کارێکی شانۆیی و پێشبینی ئەوە دەکات، کە کۆمەڵێک ئەکتەر ببینێت لەنێو فەزایەکی گریمانەکراودا لە ڕێگەی بەرجەستەکردنەوە چیرۆکێکی بۆ بگێڕنەوە، کە هەڵگری هزر و فەلسەفەیەکی دیاریکراوە.

بنەمای دووەم پرسی دەقئاوێزان و بەرکەوتنی ئەو وەرگرەیە، بە ئەزموونەکانی ئەو نووسەر و دەرهێنەرەی، کە نمایشەکەیان دروستکردووە، ئەو دەقە شانۆییانەی، کە پێشتر لەلایەن ئەو نووسەر و دەرهێنەر و ئەو گرووپە پێشکەش کراوە، ئەمەش دەبێتە سەرچاوەیەکی دەقئاوێزان بۆ دروستکردنی ئەو کارە شانۆییە، بەو مانایەی وەرگر هەمیشە چاوەڕێی ئەوە دەکات، کە نووسەر و هونەرمەند، دەقئاوێزان لە کارەکانی پێشوویان بکەن و ڕەنگدانەوەشی بەسەر کاری ئێستەیاندا هەبێت.

بنەمای سێیەمیش توانای خەیاڵکردن و پێشبینیکردنی وەرگرە بۆ فۆرم و فەلسەفەی ئەو کارە شانۆییە، لە ڕوانگەی باکگراوندی مەعریفیی و کولتووری بینین و ئەو ڕەگەزە شانۆییانەی، کە بەردەستن، وەک ناوی نمایش، نووسەر، دەرهێنەر، ئەکتەرەکان، پۆستەری نمایش، هۆڵی نمایش و کاتی نمایش، هەموو ئەو ڕەگەزانەش، کە لەگەڵ دەسپێکی نمایشەکە بەریان دەکەوێت، وەک دیکۆر، جلوبەرگ، ڕوناکیی، شێوازی جووڵە، ئەدای ئەکتەر و شێوازی دانانی بینەر، هەموو


حەمەسوار عەزیز

ئەمانە وا لە وەرگر دەکەن، ئاستی خەیاڵکردنی چالاک بکات، بۆ پێشبینیکردنی ڕووداوەکانی دواتری نمایشەکە، وەک فۆرمە هونەرییەکەی، کە نمایشەکە پێشکەشی دەکات، لەگەڵ ئەو سەرەنجامەی، کە نمایشەکە لە کۆتاییدا پێیدەگات.

ڕاڤیار نەوزاد، کە یەکێکە لەو دەرهێنەرە جیاوازانەی، هەمیشە هەوڵ دەدات ڕووبەری دیکە تاقیبکاتەوە، نمایش لە فۆرمی باوەوە بباتە نێو کۆمەڵێک فۆرمی جیاوازی دیکە. هەوڵ دەدات شوناسێکی کارکردن بۆ خۆی و گرووپەکەی دروست بکات، هەموو ئەمانە وا لە بینەر دەکەن هەمیشە چاوەڕێی دیدگای جیاواز و بونیادنانی جیاواز لە ڕاڤیار بکەن.

**هەر تێکستێک، لە دەرەوە و نێدراکی وەرگر تەواو بێت، تێکستێکی مردووە و داهێنانی تێدا نییە**

لەم نمایشەشدا، کە وەرگر دەچێت بۆ بینینی، دڵنیایە کە دەرهێنەر نمایشێکی نەریتگەرا و تەقلیدی پێشکەش ناکات، وەرگر دەخاتە نێو فۆرم و ئەزموونێکی جیاواز، ئەمەش کاتێک دێتەدی، کە وەرگر یان بینەر دەچێتە نێو هۆڵەکە و دەبینێت هۆڵەکە بەشێوەیەکی ناباو دیزاین کراوە و کراسێکی زۆری ژنانە لە ناوەڕاستی هۆڵەکە هەڵواسراون و هۆڵەکەی کردوتە دوو ڕووبەری جیاواز و جودا.

ئەمە جگە لەوەی ڕاڤیار ئاستی وەرگرتنی ئاسایی تێکدەشکێنێت، کاتێک بینەر دەتوانێت لە سێ لاوە نمایشەکە ببینێت و سێ دیواری نمایش بۆ بینەر واڵا دەکات، ئەوەش کاتێک دێتەدی، کە بەشێکی زۆری بینەرەکانی دەخاتە سەر تەختەی شانۆ و لە هەردوولای تەختە جێگیریان دەکات، لە پرسی پەیوەستبوونی بینەر بە نمایشی شانۆییەکە، شێوازێکی نیوەبازنەیی دروست دەکات.

ڕەنگە نەتوانم بڵێم ڕاڤیار لەم دابەشکردنە و گۆڕینی شێوازی وەرگرتنی بینەر، کارێکی چاوەڕواننەکراوی کردووە، چونکە ئەم کارەی دەرهێنەر درێژکراوەی شێوازی بەرکەوتنی کارە شانۆییەکانی دیکەیەتی، کە هەمیشە بینەر دەخاتە نێو ڕووبەرێکی جیاوازی وەرگرتن و پەیوەست بوونەوە بە نمایش، بۆیە ئەم شێوازی کارکردنەی



دیمەنێک لە نمایشەکە

ڕاڤیار لەم نمایشەدا، ئاسۆی پێشبینییەکانی بینەر تێکناشکێنێت، چونکە ڕاڤیار وەک دەرهێنەر، ئەو فۆرمە دووبـارە دەکاتـەوە، کە لە نمایشەکانی پێشوویدا پیادەی کردوون.

لەڕووی فۆرمی دیزاینکردنی فەزا و سینۆگرافیاوە، ڕەنگە جۆرێک لە جیـاوازبـوون و کارکردنی جیـاوازی تێدابێت، کاتێک فـەزای شانۆکەی بەشێوەیەکی فەنتازی، وەک ڕێگەیەکی دوور لە ڕێگەی بونیادێکی سینۆگرافی ناباوەوە دروست دەکـات و بینەر دەخاتە سـەر هـەردوو لێواری ڕێگەکە و هەوڵ دەدات لەگەڵ نمایشەکەیدا ئەو سەفەرەی پێبکات.

ئـەم فۆرمە دیزاینە سینۆگرافییە، ئەگەرچی تا ڕادەیەک چاوەڕوانکراوە، بەڵام لیڤڵی جوانناسی لە دیزاینەکە بەشێوەیەکی بەرچاو ئاسۆی پێشبینی بینەر تێکدەشکێنێت، چونکە ڕاڤیار توانیویەتی فـەزایـەک بونیاد بنێت، کە لـە ڕووی فـۆرم و جوانناسییەوە هەموو ئـەو کارانـەی پێشووی تێدەپەڕێنێت، بەشێوەیەک ئەم فەزایە، کۆنتاکتێکی داهێنەرانەی لەگەڵ نـاوی تێکستەکەو فەلسەفە بابەتی و هزری تێکستەکە دروستکردووە، ئەمە جگە لـەوەی لـە ڕووی ئاوێتەبوونی هـەردوو بونیادی سینۆگرافیا و مەنزومەی ئەدای ئەکتەر، ئەم فەزایە توانیویەتی ڕووبەرێکی تەبا بێت بۆ ئەو بەرکەوتن و ئاوێتە بوونە، بەشێوەیەک، کە بتوانێت لە تەنیشت کردەی درامی و جەستەی بینراوی نمایش، فۆرمێکی ناباو وێنا بکات، کە لیڤڵی جوانناسیی و گوتـاری بینراوی دیدەیی تیاییدا بەرز بێتەوە، بۆیە ئەگەر فۆرمی جەستەیی و بونیادنراوی نمایش لای ڕاڤیار، لەم نمایشەدا پێشبینیکراو بوو‌بێت، بەڵام ئاستی جوانناسیی لەو فۆرمە شانۆییەدا، لەم نمایشەدا بەتەواوی گەشەی کردووە، بۆیە بۆ وەرگر بونیادێکی چاوەڕوانکراو نەبوو.

ئەم دارشتنە فۆرمگەرایە توانی لیڤڵی جوانناسیی لە کارە هونەرییەکانی دەرهێنەر بەرز بکاتەوە و جۆرێک لە سەرسوڕهێنەری جوانیی (الدهشە الجمالیە) لە ئاستی تەبابوون و ئاوێتەبوونی بابەت و جەستەی نمایش دروست بکات.



دیمەنێک لە نمایشەکە

**مەودای جوانیی**

هانز یـاوس پێیوایە ئاستی بـاڵای هەر کارێکی ئەدەبیی، یا هونەریی بەندە بە (مەودای جوانیی) کارەکەوە، ئەم مەودایەش بەو دوورییە پێناسە دەکرێت، کە لەنێوان فۆرمی ناباوی نمایشەکە، فۆرمی ئاسایی و باوی ژیان هەیە، بەو واتایەی مەودای جوانیی نمایش بەندە بە داهێنانی زمان و فۆرمی ناباو و جیاواز، بۆ گوزارشتکردن لە فۆرمێکی بـاوی واقیع، ئەم ڕوانینەش بەندە بە ڕوانینی فۆرمگەرا ڕووسەکان، کاتێک بانگەشەی (ئەدەبییەتی ئـەدەب)یـان دەکـرد، بـەو واتایەی، ئەدەب، هونەر و زمانی تایبەتی خۆیان هەیە، کە زمانێکی نوێکار و داهێنەرانەیە و لە زمانی باوی ڕۆژانـە ناچێت، فۆرمێکە بە تـەواوی دەکەوێتە نێو ڕووبــەری خـەیـاڵ و دونیابینی نوسـەر و هونەرمەند، کە واقیعی گریمانەکراو، فۆرمی ئاسایی باوی ژیان و واقیعی تێدەپەڕێنێت.

لـەم ڕوانگـەیـەوە هانز یـاوس پێیوایە، مـەودای جوانیی هـەرکـارێـکی ئـەدەبیی، یـان هونەریی وابەستەی ئـەو دوورییەیە، کە لەنێوان زمانی ناباوی کارە هونەرییەکە و زمانی باودا هەیە، تا ئەوەی، ئەو دوورییە فراوانتر و گەورەتر بێت،

**بەختیار عەلی کارەکتەری (نادیە)ی هاوشێوەی کارەکتەری ژنە جادوگەرەکانی ماکبێس و لێدی ماکبێس دروستکردووە**



دیمەنێکی نمایشەکە

بەهای هونەری کارەکە بەرزتر و باڵاتر دەبێت و وەرگر وەک جوانیناسێک چێژی زیاتر لە کارەکە دەبینێت.

ئەگەر لەبەر ڕۆشنایی ئەم بنەمایە، سەیری کارە شانۆییەکانی ڕاڤیار بکەین، دەبینین لە زۆربەی کارە شانۆییەکانی، توانیویەتی لەنێوان فۆرمی کارە هونەرییەکانی و فۆرمی باوی چاوەڕوانکراو مەودایەکی فراوان دروست بکات، ئەمەش وایکردووە کارەکانی هەمیشە بەهایەکی جوانناسیی گەورەیان هەبێت و جیاواز ببینرێن، ڕەنگە کاریگەرترین فۆرمیش لە بونیادی کاری شانۆیی بۆ ئەوەی لە فۆرمی چاوەڕوانکراوی باو دووربکەویتەوە، چەمکی بەشانۆکردن بێت (التمسرح).

لەم کارەدا، لەباری بونیاد و تەکنیکەوە، دەرهێنەر بەر تێکستێکی شانۆیی تەقلیدی دەکەوێت، هەرچەندە تێکستەکە بەشێوەیەک لە شێوەکان بارگاویکراوە بە گوتارێکی ئاماژەیی و ڕەمزیی، بەڵام وەک بونیاد و هەڵچنینی درامی، تێکستە شانۆییەکەی بەختیار عەلی، لەنێو تەکنیکێکی باودا گەشە دەکات و چیرۆک و دروستکردنی کردارە درامییەکان لەنێو ڕیزبەندێکی زەمەنی ئاسایی وێنادەکرێن و بەرجەستە دەبن، کارکردنیش لەنێو ئەم تەرزە تێکستە باوە، دەرهێنەر بەرەو ڕووبەرێکی باوی کارکردن دەبات و بژاردە ناباوەکانی کەم دەکاتەوە و ڕووبەری هەڵوەشاندنەوە و بونیادنانەکەی بەرتەسک دەکاتەوە، کە یەکێکە لە فاکتەرە سەرەکییەکانی فراوانکردنی مەودای جوانیی تێکست و وەرگر.

**_لەم کارەدا، لەباری بونیاد و تەکنیکەوە، دەرهێنەر بەر تێکستێکی شانۆیی تەقلیدی دەکەوێت، هەرچەندە تێکستەکە بەشێوەیەک لە شێوەکان بارگاویکراوە بە گوتارێکی ئاماژەیی و ڕەمزیی_**

ئەوەی لەم نمایشەدا گرنگە، دەرهێنەر هەوڵ دەدات تەسلیمی ئەو فۆرمە تەقلیدییە باوە نەبێت، کە وەک تەکنیک بۆتە بەشێکی گەورەی گوتاری تێکستە ئەدەبییەکە، ئەو هەوڵیداوە ئەو فۆرمە بە تەواوی بخاتە ژێر سێبەری گوتاری بەشانۆکردن و شانۆواندن (التمسرح و المسرحە) کە گوتارێکی هەڵوەشانگەراییە و لە ڕووی فۆرم و تەکنیک و جەستەوە، توانای هەڵوەشاندنەوە و دووبارە بونیادنانەوەی تێکستی هەیە، بۆیە ڕاڤیار هەر زوو هەوڵ دەدات ئەم تێکستە لەنێو ڕووبەرە تەقلیدییەکەی دەرباز بکات و لە ڕێگەی بەرزکردنەوەی لیڤڵی بە شانۆکردنی کردە درامییەکان، فۆرمە واقعییەکە تێکبشکێنێت و فۆرمێکی ناباو بونیاد بنێت، کە توانای فراوانکردنی مەودای جوانیی هەبێت، لەم کردارەش لە هەندێک جومگەدا بە تەواوی ئامانجی پێکاوە و فۆرمێکی تەواو ناباوی دروستکردووە، وەک لە دیمەنی وێناکردنی سەرۆک، کە بە بڕوای من یەکێکە لە جیاوازترین دیمەنە شانۆییەکانی ئەو نمایشە، کە کرداری بەشانۆکردن تیایدا دەگاتە لووتکەی جوانیی و داهێنان و بەرجەستەکردنێکی ناباو.

دیمەنی بەکاربردنی کۆمەڵێک موزیکژەن وەک فاکتەرێک بۆ تێکشکاندنی گوتار و فۆرمی بەرجەستەکردنی واقیعی نێو تێکستە شانۆییەکە و بەکاربردنی کۆمەڵێک ئاواز و مەقام، کە تەریب و تەبا بوون لەگەڵ جەستەی داهێنراوی نمایش، بەڵام لە هەندێک حاڵەتیش کەوتۆتە نێو داوی گوتاری تەقلیدی سەردەستەی تێکست و نەیتوانیوە، ئەو ڕووبەرە واقیعیی و باوە تێپەڕێنێت، وەک وێناکردنی کردار و فۆرمی دەسەڵاتە داعشیی و تەکفیرییەکان و شێوازی دووبارەی وێناکردنی ئەم دەسەڵاتە لە فۆرمێکی دووبارەی تەقلیدی.

دەرهێنەر نەیتوانیوە لەم ڕووبەرەدا هیچ فۆرمێکی جیاواز پێشنیاز بکات و مەودای جوانیی نمایش باڵا بکات و بتوانێت ئەو گوتارە لەو فۆرمە تەقلیدییە بباتە نێو فۆرمێکی ناباوی داهێنەرانە، تەنانەت لە ڕووی مەنزومەی ئەدای ئەکتەریشەوە جۆرێک لە ناتەبایی بەڕوونی دەبینرێت، بەشێکی زۆری ئەدای ئەکتەر لەم نمایشەدا لەنێو مەنزومەی ئەدای پێشکەشکاری (تقدیمی) یاری شانۆیی بونیادنراوە، تەنانەت دەرهێنەر بۆ سەپاندنی ئەم فۆرمە ئەداییە زۆرجار زیادەڕۆیی دەکات لە بەکاربردنی کۆمەڵێک ئیعازی وەک (لەو کارەکتەرە وەرە دەرەوە، یا بڕۆ نێو کارەکتەرێکی دی) و چەند ئیعازێکی دیکەی هاوشێوە، کە من پێموایە دەبێت ئەو دووپاتکردنەوەیە، لە کرداری درامی ببینرێت، نەک لەو ئیعازە سواوانە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم فۆرمە ئەداییە لە هەندێک جومگەی نمایشەکە بەتەواوی دەچێتە نێو ڕووبەرێکی واقیعی و ناوەکی، کە بە تەواوی لەگەڵ مەنزومەی بونیادی نمایش و مەنزومەی ئەدا ناتەبایە، وەک ئەدای دیدار عومەر لە بەشێکی زۆری کارەکتەری نادیە، تەقەموس و قوڵبوونەوەی ناوەکی لە ئەدای ئەو کارەکتەرە، هەروەها ئەدای کۆژین جوانرۆ لە نمایشکردنی کارەکتەری (ئەمیر)ی داعشیی، کە ئەدایەکی تەقلیدی باوە و دەرهێنەر نەیتوانیوە بەو فۆرمە دەرەکییە سادەیەی، ئەدای ئەو تەرزە کارەکتەرە تێپەڕێنێت.

هەوڵدانێکی دیکەی دەرهێنەر بۆ بەرزکردنەوەی لیڤڵی بەشانۆکردن لەم نمایشە، کارکردن بوو بەشێوەیەکی جیاواز لەنێو کارەکتەری (نادیە_ دیدار عومەر) بەتایبەتی، لە دارشتنی فۆرمی کارەکتەرەکە، دەرهێنەر هەوڵی دابوو ئەم کارەکتەرەلەنێو فۆرمی کارەکتەری(مایسترۆ)یەکی مۆسیقی دابڕێژێتەوە و لەو فەزا واقیعی و تەقلیدییەی نێو تێکستەکەی بەختیار عەلی دەربازی بکات، ئەم هەوڵدانەی دەرهێنەر لە هەڵوەشاندنەوە و دارشتنەوەی ئەم کارەکتەرە، بەشێکە لە وەزیفەی داهێنەرانەی دەرهێنەر، کاتێک دەیەوێت مەودای جوانیی نمایش باڵا بکات و کارەکتەر لەنێو سیاقی نەریتگەرایی بباتە نێو فەزایەکی هونەریی چاوەڕوان نەکراو،

بەڵام ئەوەی جێگەی داخە ئەم هەڵوەشاندنەوە و بونیادنانەوەی ڕاڤیار نەوزاد، ئەگەرچی لە ڕووی فۆرم و پرسی فۆرمگەرایی لەنێو نمایشەکە، خزمەتێکی زۆری نمایشەکەی کردبوو، توانیبووی گوتار و لیڤڵی جوانناسیی و فۆرمی جیاوازبوون و تێپەڕاندنی ئایکۆن لەنێو نمایشەکە بەشێوەیەکی بەرچاو بەرز بکاتەوە، بەڵام لە ڕووی بابەتییەوە دەستکاریکردنی فۆرمی ئەم کارەکتەرە، بەدەر لە ڕەهەندە جیاوازەکانی دیکەی کارەکتەر، جۆرێک لە دووفاقی لەنێو بونیادی ئەو کارەکتەرە دروست دەکات، بەختیار عەلی کارەکتەری (نادیە)ی هاوشێوەی کارەکتەری ژنە جادوگەرەکانی ماکبیس و لیدی ماکبیس دروست کردووە، کارەکتەرێکن هەمیشە دەبن بە پاڵنەر بۆ باڵاکردنی پرسی شەڕانگێزیی لەنێو مرۆڤ، هەمیشە شەیتانە خەوتووەکانی نێو مرۆڤەکان بەئاگا دێننەوە، بەتایبەتی لەم تێکستەی بەختیار عەلی دا، کە کارەکتەری نادیەی بە تەواوی لە کارەکتەرێکی بەرژەوەندیخواز، ماستاوچی و پینەچی دەسەڵات کورتکردۆتەوە.

نادیە وا لە سوپاسالار دەکات، کە خەڵک گەمژە و ناچار بکات، کارەکتەری (سوندس_حۆریەکە) بە کارەکتەرێکی ئاسمانیی ببینن، ئەم پلانەی نادیە بەشێکە لە پلانێکی قێزەوەن، کە کار لەسەر بەگەمژەکردنی کۆمەڵگا دەکات و هەمیشە دەیانەوێت ڕەوایی بە هەموو کردارەکانی دەسەڵات بدەن و بەرگێکی ئایینی، ئاسمانیی و نیشتمانیی

ڕەنگە نەتوانم بڵێم ڕاڤیار لەم دابەشکردنە و گۆڕینی شێوازی وەرگرتنی بینەر، کارێکی چاوەڕواننەکراوی کردووە، چونکە ئەم کارەی دەرهێنەر درێژکراوەی شێوازی بەرکەوتنی کارە شانۆییەکانی دیکەیەتی



دیمەنێکی نمایشەکە

پێیبەخشن، دەسەڵات بە پیرۆز وێنا بکەن، تەنانەت کاتێک دەسەڵات بە تەواوی هەڵدەگەڕێتەوە و دەکەوێتە دەستی داعشییەکان، نادیە هەمان ڕۆڵ دەبینێت، وەک عەرابی دەسەڵاتدار دەردەکەوێت، گرنگیش نییە خزمەتی چ جۆرە دەسەڵاتێک دەکات، وەکو کارەکتەری پۆلۆنیوس لە هاملێت، کە هەمیشە بە حەق و ناحەق لە هەوڵی ڕازیکردنی پادشایە، بۆیە وێناکردنی ئەم کارەکتەرە لە فۆرمی کارەکتەرێکی مۆسیقیی، کە جوانیی و ژیان دەبەخشێتەوە، لە کۆمەڵێک ڕوو ناتەبایە بەو کارەکتەرەی نادیە، لە تێکستەکەی بەختیار عەلی و خودی نمایشەکەی ڕاقیار، دەبوو دەرهێنەر لەگەڵ گۆڕینی فۆرمی کارەکتەر، بونیادی کارەکتەریش بەشێوەیەک دابڕێژێتەوە، کە تەبا بێت لەگەڵ فۆرمە داهێنراوەکەی کارەکتەر، ئەوەی لەم نمایشەدا دەبینرێت تەواو ناتەبایە، کە کارەکتەری نادیە لەنێو دوو فۆرمی ناتەبا دەردەکەوێت، دانەیەکیان فۆرمی مایستروّیە، کە پڕە لە جوانیی و ژیان، ڕووەکەی دیکەش فۆرمی چڵکاوخۆرێکی دەسەڵاتە، کە هەمیشە لە خەمی ڕازیکردنی دەسەڵات و بە پیرۆزکردنیەتی، بۆیە ناتەباییەکی گەورە لەنێوان ڕەهەندە جیاوازەکانی کارەکتەر و فۆرمی داسەپێنراو هەیە، بۆ ئەو فۆرمە، دەبوایە ڕاقیار ئەو کارەکتەرە لەو ڕووبەرەی نوسەر دەربکات و بەشێوەیەکی دی تەوزیفی بکاتەوە، کە تەبا بێت لەگەڵ کارەکتەری ژنێکی مۆزیسیان، کە فرمێسک بۆ شکانی کەمانێک دەڕێژێت.

**وەک بونیاد و هەڵچنینی درامی، تێکستە شانۆییەکەی بەختیار عەلی، لەنێو تەکنیکێکی باودا گەشە دەکات و چیرۆک و دروستکردنی کردارە درامییەکان لەنێو ڕیزبەندیکی زەمەنی ئاسایی وێنادەکرێن و بەرجەستە دەبن**

## پڕکردنەوەی بۆشاییەکان

بنەمای سینەمی ئەم تیۆرە، کە وەک ڤۆلفگانگ ئیزەر ئاماژەی پێدەدات، پڕکردنەوەوی بۆشاییەکانی تێکست و نمایشە لەلایەن وەرگرەوە، بۆیە لە لایەن ئیزەرەوە کاتێک تێکست مانا وەردەگرێت، کە لە لایەن وەرگرەوە بۆشاییەکانی پڕدەکرێتەوە و تەواو دەکرێت، بەو مانایەی هەموو تێکستەکان (ئەدەبیی_هونەریی) تێکستی ناتەواون و وەرگر فاکتەری سەرەکی تەواوکردنی ئەو تێکستانەیە، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ فەلسەفەی (دیاردەگەرایی) کە هەموو بوونێک لە دەرەوەی خودێکی وەرگر و درکپێکەردا ڕەتدەکاتەوە.

لەم نمایشەدا نووسەری تێکست (بەختیار عەلی) هەوڵیداوە بۆشاییەک بۆ وەرگر بەجێبێڵێت لە شێوەکردنی کارەکتەری (سوندس_حۆریەکە) بەختیار عەلی بەهیچ شێوەیەک ئەو کارەکتەرە ناخاتە بەر دیدەی بینەر، دەروازەکە واڵا دەکات بۆ ئەوەی بینەر خۆی بەشدار بێت لە وێناکردنی ئەو کارەکتەرە و لێکدانەوەی ڕەهەندە جۆراوجۆرەکانی، بەڵام لەم نمایشەدا ئەوەی کە بۆ من کارێکی چاوەڕوان نەکراو بوو، دەرهێنەر ئەو کارەکتەرە لەو فۆرمە سادەیە بەرجەستە بکات و بیخاتە بەر دیدەی وەرگر، ئەم کارەی دەرهێنەر لە بەرجەستەکردنی ئەم کارەکتەرە لە دوو لاوە زیانی بەو نمایشە گەیاند.

لایەنی یەکەم لە کوشتنی خەیاڵی وەرگر و لێسەندنەوەی مافی لێکدانەوە و دروستکردن و وێناکردنی ئەم کارەکتەرە لە وەرگر وایکرد نمایشەکە هیچ بۆشاییەکی داهێنەرانە نەهێڵێتەوە بۆ بەشداری کارای بینەر لە ئیدراککردن و بونیادنانی مانا لەنێو نمایشە شانۆییەکە، ئەم بەرجەستەکردن و وێناکردنە وایکرد نمایشەکە لە تێکستێکی کراوە ببێتە تێکستێکی داخراو و بە تەنیا هەڵگری دیدگا و ئاماژەی مەبەستداری دەرهێنەر بێت، ئەم داخرانەش فاکتەرێکی گرنگی کوشتنی وەرگرە لەنێو تێکست و نمایشە شانۆییەکەش، لە ڕووبەری کراوەی فرەمانایەوە بەرەو ڕووبەری داخراوی تاکمانایی، بەشێوەیەک تێکستێکی مردوو دەخاتە بەردەم وەرگر، کە هیچ بۆشاییەکی تێدا نەماوەتەوە بۆ بەشداریکردنی بینەر، ئەمەش یەکێکە لە خراپترین تێکستەکان.

دووەم لە ڕووی جوانیی و جوانناسییەوە، ئەو فۆرمە بینراوەی، کە دەرهێنەر لە بەرجەستەکردنی کارەکتەری (سوندس) پیادەی کردووە، فۆرمێکە لەڕووی جوانییەوە زۆر لەو فۆرمە خەیاڵکراوەی بینەر بچووکتر و سادەترە، چونکە هەمیشە دونیای خەیاڵ و پێشبینی، پێشینەی هەیە بەسەر واقیع، بۆیە فۆرمی پێشبینیکراوی وەرگر بۆ کارەکتەری سوندس لە تێکستەکەی بەختیار عەلی، فۆرمێکی باڵاتر، کاریگەرتر و جوانترە لەو فۆرمە سادەیەی، کە دەرهێنەر لە بەرجەستەکردنی کارەکتەری سوندس



دیمەنێک لە نمایشەکە

پیادەی کرد، ڕووبەرێکی گەورەی تەئویلکردن و لێکدانەوەی بەردەم وەرگری داخست، نمایشەکەی تارادەی سادەیی و تاکگوتاری، سادە کردەوە، ئەم جۆرە بەرجەستەکردنە کاریگەریی نەرێنی بەسەر وەرگرەوە دروست دەکات، ڕێگە نادات وەرگر لە ڕێگەی کۆمەڵێک پاشخانی مەعریفیی، کولتووریی، ئەزموون و بەرکەوتن، پیادەی مافێکی ڕەوای خۆی بکات، کە لێکدانەوە و دروستکردنی چیرۆکێکی تایبەتە، ئەمە جگە لەوەی هەر تێکستێک، لە دەرەوە و ئیدراکی وەرگر تەواو بێت، تێکستێکی مردووە و داهێنانی تێدا نییە.

بونیادێکی دیکەی ئەم تیورە بەندە بە پڕکردنەوەی بۆشایی کارەکتەر لە لایەن ئەکتەرەوە کاتێک ئەدای دەکات، چونکە کارەکتەر بۆ ئەکتەر تەنیا چەند دیالۆگێکی دیاریکراوە، ئەوە ئەکتەرە بە پڕکردنەوەی بۆشاییەکانی ئەم کارەکتەرە بە بۆچوون و داهێنانی خۆی، فۆرمی کارەکتەر تەواو دەکات، لەم نمایشەدا کۆمەڵێک ئەکتەری بەهرەدار دەبینران، کە هەوڵیان دەدا کاریگەریی و ئامادەییان هەبێت لە پڕکردنەوەی بۆشایی کارەکتەر، لەم نێوەندا ڕوزان مستەفا لە ئەداکردنی کارەکتەری سەرۆک توانی بۆشایی کارەکتەر بەشێوەیەکی زۆر داهێنەرانە و چاوەڕوان نەکراو پڕبکاتەوە، بابان عومەر، ئاسۆ ڕەفیق، کالی سەباح و میران ئازادیش لەنێو فۆرمێکی ئەداکردن، کە لیڤڵی بەشانۆکردن تیایدا سیمای کارەکتەر وێنا دەکات، توانیویانە جیاواز دەرکەون، ئەوەی بۆ من کێشە بوو ئەدای دیدار عومەر بوو، کە لە ئەداکردنی فۆرمی کارەکتەری مایسترۆ ئەدایەکی سەرسوڕهێنەری زۆر جیاواز تایبەت دەکات و نوێبوونەوە و هەڵگەڕانەوە بە مەنزومەی ئەداکردن لە نمایشەکە دەبەستێت، بەڵام کاتێک، کە دەخزێتە نێو ئەدایەکی واقیعی و ناوەکی، کە هەست و کروزانەوە تیایدا باڵا دەکات، پێموایە ئەو فۆرمە کاڵ دەکاتەوە و ئەدایەکی زۆر واقیعی چاوەڕوانکراو پێشکەش دەکات، کە هیچ جۆرە داهێنانێکی تیادا نییە.

**ڕاقیار نەوزاد، کە یەکێکە لەو دەرهێنەرە جیاوازانەی، هەمیشە هەوڵ دەدات ڕووبەری دیکە تاقیبکاتەوە، نمایش لە فۆرمی باوەوە بباتە نێو کۆمەڵێک فۆرمی جیاوازی دیکە**

## وەرگری شاراوە و وەرگری ڕاستەقینە

وەرگری شاراوە، ئەو وەرگرەیە، کە هاوشانی نووسەر و داهێنەری تێکستە، لە هەموو قۆناغەکانی دروستکردنی تێکست بەشداریی دەکات و کاریگەریی دوو لایەنەی بەسەر تێکستەوە هەیە،

> **ئەوەی لەم نمایشەدا دەبینرێت تەواو ناتەبایە، کە کارەکتەری نادیە لەنێو دوو فۆرمی ناتەبا دەردەکەوێت، یەکیان فۆرمی مایسترۆیە، کە پڕە لە جوانیی و ژیان، ڕووەکەی دیکەش فۆرمی چڵکاوخۆرێکی دەسەڵاتە**

بۆیە هەر دەرهێنەرێک کارێکی شانۆیی دروست دەکات، لە هەموو قۆناغێکدا خەیاڵی وەرگرێکی شانۆیی دەکات، کە بەر نمایشەکە دەکەوێت و پەیوەندییەکی دیالکتی لەنێوان وەرگر و تێکست دروست دەبێت بەشێوەیەکی تەریب لەگەڵ قۆناغەکانی دروستکردنی تێکست، یان نمایش، بۆیە ئامادەیی وەرگر لە ساتی نمایشکردنی نمایشەوە دەست پێناکات، بەڵکو ئامادەییەکە لەساتی دەست پێکردنی بیرۆکەی تێکست و نمایشەکە دەست پێدەکات و نووسەر و دەرهێنەر لەو ساتەوە بەر وەرگرێکی گریمانەکراو دەکەون، مامەڵەی لەگەڵ دەکەن و بەشداری نووسینەوەی تێکستەکە دەکەن. هەموو تێکستێکی ئەدەبیی، یان هونەریی لەسەر دوو ئاست کۆنتاکت لەگەڵ وەرگر دەکەن.

ئاستی یەکەم: لەسەر درکپێکردنی ڕاستەوخۆ (الادراک المباشر) کار دەکات و هەموو ئەو ئایکۆن و ئاماژە و هێمایانە دەگرێتەوە، کە نمایش بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ تیایدا بەر بینەر دەکەوێت، جیاکاریی و مانای جیاواز لای وەرگر دروست ناکات و لەسەر گوتارێکی ڕاستەوخۆی دەرەکی تاکمانا بونیاد دەنرێت.

ئاستی دووەم: پەیوەندیی و جیاوازیی نێوان وەرگر و تێکستە، ئاستێکە کە پەیوەستە بە درکپێکردنی ناڕاستەوخۆ و ناوەکی، ئەم پەیوەندییە لەسەر ئاستی زەین و خەیاڵ و جیهانبینیی و مەعریفەی وەرگر دروست دەبێت و نمایش دەباتە نێو ڕووبەری جیاوازیی لێکدانەوە، دروستبووونی بۆچوون، دیدگا، تێگەیشتنی جیاواز و ڕاکێشانی نمایش بۆ نێو ڕووبەری فرە مانایی، خوێندنەوەی جیاواز و درکپێکردنی تاک.

ئەم نمایشە لەم ڕووەوە ناتوانێت ئەو پەیوەندییە لە جۆری دووەم دروست بکات، وەرگر ناچار دەکات بەر خراپترین جۆری پەیوەندیی بکەوێت ئەویش (تێکستێکی داخراو و خوێندنەوەیەکی داخراوە) هەروەکو ڕەخنەگری ئیتاڵی (ئەمبرتۆ ئیکۆ) ئاماژەی پێدەدات.

خوێندنەوەی تێکست (نمایش لەم بابەتەدا) بەسەر چوار ئاست دابەش دەبێت، خراپترینیان ئەوەیە، تێکستێکی داخراو بخەیتە بەردەم وەرگر، چونکە تێکستی داخراو کێشە بۆ وەرگر دروست دەکات، تەنیا وەرگری تەقلیدیی بەو تێکستە خۆشحاڵە، چونکە ناتوانێت خوێندنەوەیەکی کراوەی بۆ تێکست هەبێت، هەمیشە پشت بە ئامادەیی و تاکمانایی تێکست دەبەستێت، بەو مانایە ڕازی و دڵخۆشە، کە تێکست، یان نمایش پێشکەشی دەکات و دەیخاتە بەردەمی.

ئەم نمایشەی ڕاقیار نەوزاد، ئاستی کرانەوەی تێکست، لەبەردەم وەرگر تەسک دەکاتەوە و تێکست هەوڵ دەدات پەیوەندییەکی ناتەندروست لەگەڵ بینەر ببەستێت، بینەر دەخاتە نێو گوتاری خوازراوی نمایش، ویست و گوتاری ئامانجداری نمایش، پەیوەندیی بینەر و نمایش نابەنە نێو پەیوەندییەکی عەقڵانی، کە تێدا هەردوولا بەشدار بن لە بەرهەمهێنانی مانا، بەڵکو نمایش گوتاری هزریی و بابەتی خۆی لەسەرەوە بۆ خوارەوە پیادە دەکات، وەرگر لەنێو فۆرمی ئەو وەرگرە شاراوەیە دەهێڵێتەوە، کە لەگەڵ دروستکردنی نمایش پێشبینیکراوە و ڕێگە دەگرێت لە دروستبوونی وەرگرێکی ڕاستەقینە، یان وەرگرێکی دانا و زانا و بەشدار لە پرۆسەی دروستکردنی مانا.

* شانۆیی (میوانێکی دوور) نووسینی بەختیار عەلی، دەرهێنانی (ڕاقیار نەوزاد) ئەداکردنی (موحەممەد قازی، ئاسۆ ڕەفیق، بابان عومەر، دیدار عومەر، سان سوارە، کاڵێ سەباح، لۆڤان عومەر، کۆژین جوانرۆ، ژینۆ کەیوان، نێچیر خەلیل، مەتین هێژا، میران ئازاد، ڕۆزان کارزان) بۆ ماوەی ٢٤ ڕۆژ لە هۆڵی ڕۆشنبیریی سلێمانی پێشکەش کرا، بەرهەمی کۆمپانیای میترۆنۆم پرۆداکشن بوو.

**تێبینی: بابەتێکم بە زمانی عەرەبیی لەسەر هەمان نمایش نوسیووە، بەڵام لەبەر ئەوەی لێرە لەبەر ڕۆشنایی تیۆرێکی تایبەت نمایشەکەم لێکداوەتەوە، نووسینە عەرەبییەکەم جیاواز دەردەکەوێت لەگەڵ ئەم نووسینە بە هۆی جیاوازیی مەرجەعیەتی هەردوو وتارەکە.**

# کوردبوون، سەلاحەدینی کردە سەرکردە مەزنەکە

ڕۆمانی مێژوویی سەلاحەدینی ئەیوبی لە نووسینی (تاریق عەلی) بەزمانی ئینگلیزیی و وەرگێرانی بۆسەر زمانی کوردیی، لە لایەن کاک شەفیقی حاجی خدر، ڕۆمانێکی ئاسایی نییە.

بەدەگمەن کتێبم لەسەر سەلاحەدینی ئەیوبی خوێندوونەتەوە، نایشارمەوە زانیارییکی ئەوتۆشم لەسەری نەبوو، تەنیا چەند زانیارییەکی سەرەتایی، کە سەلاحەدین کوردبووە و قودسی ڕزگار کردووە، هەقە ڕاستگۆبم و دان بەهەندێک ڕاستیدا بنێم، خۆشم نەمویستوە و شانازیشم پێیەوە نەکردووە، تاڕادەیەک نەمدەویست گوێم لەناویشی بێت، لەوانەیە بپرسن بۆ؟

لەراستیدا تێگەیشتنمان وابوو، کە سەلاحەدین هیچی بۆ کورد نەکردووە. عەرەبە شۆڤێنیەکان و سەرکردە دکتاتۆرەکانی عەرەب هەمیشە شانازیان پێوە دەکرد و ئیسلامی سیاسیی کوردیش تاڕادەیەک ئەو وێنەی لا دروست کردبووم.

ناسیۆنالیستی کوردیش کاریگەریی خۆی لە زهنمان جێهێشتبوو، بەڵام ددان بەو ڕاستیەدا دەنێم هەڵەبووم.

ئەی ئێستە چی وایکرد ئەم پەیڤانە بکەم بە ڕستە و لەدوو توێی ئەم پەرەگرافە ڕەنگرێژیان بکەم و بیانکەم بەم نووسینە، سەرەتا دوو، بۆ سێ جار سەیری فیلمی مەملەکەتی بەهەشتم کرد (the Kingdem of Heaven) ڕۆڵی سەلاحەدین لەو فلیمە بەخشەندانەبوو، چونکە دەوری سەلاحەدین لە ڕووخاندنی دەوڵەتی فاتمی باندۆرێکی خراپی لەسەر جێهێشتبووم،


سلێمان مستەفا حەسەن

لە لایەکیدیکەوە مێژوونووسی بە توانا و خاوەنی پەیامی جیا (سۆران حەمەڕەش) لەم ماوەیەدا لەسەر کتێبەکەی بەناوی مێژووی ون و بزرکراوی کورد چەندین دیمانەی لەگەڵ کراوە، ئەم کتێبەش باندۆرێکی باشی لەسەر ڕوئیا و بۆچوون و لێکدانەوەکانم دروست کرد.

لە دیمانەیێکدا ئەگەر هەڵەنەبم لە کەناڵی کوردسات بوو، پرسیارێکیان لێکرد ئایە دوای نووسینی ئەو کتێبە، ڕای بەرێزیان لەسەر سەلاحەدینی ئەیوبی چییە؟ لە وەڵامدا گوتی: سەرکردەیەکی گەورەیە و زۆرم خۆش دەوێت.

بەهەمان شێوە برای خۆشەویستم شەفیقی حاجی خدر هەمیشە لە سەرەتای دەستپێکی هەر پرۆژەیەکی وەرگێران لە واڵەکەی خۆی دەیکاتە مژدانە، کە دەست بە وەرگێرانی کتێبی نوێ دەکات، جا کە نۆرە هاتە سەر سەلاحەدینی ئەیوبی هەمیشە دەیگوت: یاران دەستم بە وەرگێرانی کتێبی سوڵتانە مەزنەکە کرد، ئەوانە هەموویان بوون بە هاندەر، بۆ ئەوەی بە چاوێکی جیا و هزرێکی ڕەخنەگرانە دەست بە خوێندنەوەی ئەم کتێبە بکەم.

کتێبەکە بەناوی سەلاحەدینی ئەیوبییە، بەڵام خۆی ڕۆمانە، ئەمما ڕۆمان! ڕۆمانێک بە میتۆدی ڕۆمانی مێژوویی نووسراوە، کە بە سەلیقەیێکی جوان و پشت ئەستوور بە سەرچاوەی مێژوویی داڕێژراوە، هەر لەگەڵ دەستپێکی، مرۆڤ کەمەندکێش دەکا، تا لە خوێندنەوەی بەردەوام بێت، دڵنیام ئەوانەی وەک من لە سەلاحەدین دەڕوانن بە خوێندنەوەی ڕایان دەگۆڕێت، لەوانەیە کتێب و سەرچاوەی زۆر، بە زمانی کوردیش لەسەر ئەم سەرکردە مەزنە هەبێت، بەڵام من هیچ کاتێک تامەزرۆی

خوێندنەوەیان نەبوومە.

کاک شەفیق لە وەرگێڕانی ئەم ڕۆمانە، هەر بە کوردیکی ڕەوان و بەکارهێنانی وشەی کوردی ناوچەی باڵەکایەتی و دانانی پەراوێز و نەوەستاوە، بەڵکوو دەستنووسەکەی داوە بە دکتۆر (موحسن محەمەد حەسەن و دکتۆر نەبەز مەجید ئەمین) ئەم دوو بەڕێزە، کە پسپۆرن لە بواری مێژوو، خوێندنەویەکی زەمەنیی و جوانیان بۆ کردووە و ددانیان بە وردەکاریی و سەلیقەی وەرگێڕ داناوە، جەختیان لەسەر ڕاستی سەرچاوە مێژووییەکان کردۆتەوە.




لەکۆتایی ڕۆمانەکەش پاشکۆیەک دانراوە، کە لێکۆڵینەوەیەکی خەلدونیانەیە بۆ کتێبەکەی سەلاحەدین ئەیوبی، لە نووسینی ئەحمەد سەعید ئیقبال و موحەممەد عاسف.

ئەم پاشکۆیە خوێندنەوەیەکی جوانە، لەهەمان کاتدا سەردێکە بۆ ژیانی سەلاحەدین و ڕۆمانەکە، باسی هەموو ئەو ڕۆمان و بەرهەمانەش دەکات، کە لەسەر ئەو سەرکردە مەزنە نووسراون، بەڕاستی هەستم بە کەمتەرخەمی و بێ باکی خۆم کرد، بۆیە ئەمە وایکرد ئەم بابەتە بنووسم و هانی خوێنەران بدەم، ئەم ڕۆمانە بخوێننەوە، ئەو کتێبە مێژوویی و ڕۆمانانەی لەسەر سەلاحەدین نوسراون بە کەم تەماشا نەکەن.

ئەم دوو نووسەرە ڕایان وایە، کە (دەمارگیریی و ئاوەدانیی) سەلاحەدینیان گەیاندە ئەو ڕۆژگارە و دەڵێن: تیۆری سووڕی دەورانی ئیبن خەلدون ڕێک لەگەڵ چوارچێوەی تیۆری ئەم لێکۆلینەوەیە دێتەوە، کە تاریق عەلی لە نووسینی کتێبەکەی پەیرەوی لێکردووە. لە لێکۆلینەوەکەشیان مافی خۆیان داوەتە سەلاحەدین، بەڵام ئەوەی لای من گرنگ بوو ئەو نمایشە ئەدەبیانە بوون، کە ئاماژەیان پێداوە، لەوانە:

***تێگەیشتنمان وابوو، کە سەڵاحەدین هیچی بۆ کورد نەکردووە. عەرەبە شۆڤێنیەکان و سەرکردە دکتاتۆرەکانی عەرەب هەمیشە شانازیان پێوە دەکرد***

یەکەمین بایۆگرافی، کە لەسەر سەلاحەدینی ئەیوبی نووسرابێت و بڵاوکرابێتەوە، کتێبی مێژووی سەلاحەدین بوو، لە لایەن (لویس مارین) لە ساڵی ١٧٥٨، هەروەها ساڵی ١٩٦٦ مێژونوسی فەرەنسی (میشیو) کتێبێکی لەسەر سەلاحەدین نووسی. سێر واڵتەر مێژوونوسی سکۆتلەندی کتێبێکی لەسەر سەلاحەدین نوسیوە، کە جەخت لەسەر دەوری ئەفسانەیی و دانایی و میهرەبانی و جوانیی ئەو سەرکردەیە دەکاتەوە.

هەریەک لەم سێ مێژوونووسەش ( ڕێنی گرۆست، ها.ئا.ر.گیب و ستانلی لێین پۆڵ) تیشکیان خستۆتە سەر لایەنێکی تایبەت، کە جێگەی ڕامانە، پرسیارەکەیان ئەوەیە: بۆ سەلاحەدین جەنگاوەرێکی عەرەبی تەواو جیاوازبوو، هەروەها باکگراوندی و ڕەگ و ڕیشەی کوردانەی لە سەرکردایەتی و

یەکخستنی عەرەب و جەنگان لەژێر ئاڵای ئیسلام .

هەریەک لە (مالکوڵم لیۆنس و داڤید جاکسن) کە مێژوونوس و ئەکادیمستن، لە کتێبەکەی خۆیاندا سەلاحەدین وەک سیاسەتوانێکی پراگماتی و ستراتیژوان وێنا دەکەن.

جۆن تۆلان و مارگریت جەب سەلاحەدین وەک ئاوێنەی سوارچاکیی، لەخەیاڵدانی ئەورووپیەکانی سەدەی ناوەڕاست وێنا دەکەن، خاڵی پۆستمۆدێرنانە بۆ ڕوانینی ئەفسانەی جوامێری سەلاحەدین دەخەنەڕوو، بەڵام لە دونیا و جیهان و دیدی عەرەبدا لێکدانەوەی جیا بۆ سەلاحەدین دەکەن، لە نووسین و سینەماو وتار، کە پێچەوانەی ڕاستییە مێژووییەکانن.

**ئەو ڕۆمانانەی لەسەر سەلاحەدین نووسراون:**

ڕۆمانی پۆستمۆدێرنی (جاک هایت) سێینەی سەلاحەدین، ڕۆمانی برایەتی ڕۆماننووس (ڕۆبن یەنگ)ی بریتانی، ڕۆمانی مەیدانی شمشێرەکانی باوەڕی ڕۆماننووس (ڕیچارد وارن) و ڕۆمانی (سایەی شمشێرەکانی ڕۆماننووس (کامەران پاشا).

لەکۆتایی ئەم چەند دێرەدا ئەگەر پرسیارێک بکەین: سەلاحەدین چۆن بوو بەو سەرکردە مەزنە؟ سەلاحەدین باوکێکی دانا و ئارامگرتوو و ورد و مامێکی ئازا و نەبەردی هەبوو، لەدوای مردنی شێرکۆی مامی، کە یەکێکە لەسەرکردە سەربازییەکانی ئەوکاتە، بازی چانس بەسەر سەلاحەدیندا دەنیشێتەوە، چونکە ئەوکاتە سەرکردە سەربازییەکانی تورک و عەرەب لەپێش سەلاحەدینەوە بوون، لەوێدا لەشکر و سەربازە کوردەکان دەکەونە دووڕیانێک، بەڵام لە کۆتاییدا ڕەگەزی کوردبوون ئەم پرسە یەکلادەکاتەوە و سەلاحەدین دەبێتە جێگرەوەی شێرکۆی مامی و دەبێتە وەزیری خەلیفەی فاتمی. بەدەر لەوەش سەلاحەدین لە بنەماڵەیەکی دەسەلاتدار چاوی بە دونیا هەڵێناوە، بەڵام دروستکەری ڕووداوەکان نەبووە، بەڵکوو ڕووداوەکان، دروستکەری پێگەی ئەو بوون، لە کۆتاییدا توانی پێگەی خۆی بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی بەدیبهێنێت، یەکێ لە وتە جوانەکانی سەلاحەدین بۆ ئەلئەفزەلی کوڕی:

(من ئیمپراتۆریەتێکی پانوپۆرم بەجێهێشتووە، هەرگیز لەبیری نەکەن، ئەوەی دروستم کردووە بە پشتیوانی خەڵکی خۆمان بووە، خۆ ئەگەر ئێوە خۆ لەوان دابڕن، زۆر نامێننەوە).

**من ئیمپراتۆریەتێکی پانوپۆرم بەجێهێشتوە، هەرگیز لەبیری نەکەن، ئەوەی دروستم کردوە بە پشتیوانی خەڵکی خۆمان بووە، خۆ ئەگەر ئێوە خۆ لەوان دابڕن، زۆر نامێننەوە**

دوای خوێندنەوەی ڕۆمانەکە و پاشکۆی ڕۆمانەکە چەند پرسیارێکی بێ وەڵامم لا گەڵاڵە بوون:

بۆچی سەلاحەدین بەو جوامێرییە بەو میهرەبانییە مامەڵەی لەگەڵ (عەرەب، جوو و مەسیحیی) کردووە؟ لە ڕزگارکردنی قودسیش لەدەستی خاچ پەرستانی سەدەکانی ناوەڕاست، جووەکان شان بەشانی ئیسلامەکان خۆیان بە براوە و سەرکەوتوو زانیوە؟ پرسیارەکە ئەوەیە بۆچی لەساڵی (١٩٤٨)ەوە، هاوکێشەکان ئەو گۆڕانکارییە گەورەیان بەسەردا هاتووە؟ بۆچی جووەکان بوون بە هاوسۆز و لایەنگری خۆراوا؟ خۆ شەڕی خاچپەرستان، لەشەڕە فراوان خوازەکەیان، هیچ پەیامێکی دینیی لەپشتەوە نەبووە؟ ئایا چاندنی تۆوی توندوتیژیی نێوانی ئیسلام، بەتایبەتی نەتەوەی عەرەب و جووەکان چۆن بەم ئاکامەی ئێستە گەیەنرا؟ بابەتێکی دی، کە لە خوێندنەوەی ئەم ڕۆمانە بۆتە جێگەی پرسیار لای بەندە، ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە مێژووی میللەتەکامان و سەرکردەکانی وەک خۆی بەیان بکەین و بەدوای سەرچاوە دروستەکانیاندا بگەڕێین؟ بۆ ئەوەی سوود و پەندی لێوەرگرین.

قانعی مەزن دەفەرموێ:

**تۆ نەمردووی ئەی سەلاحەدینی ئەیوبی لەقەب**

**هەر بژی ئەی فەخری کورد و حاکمی مولکی عەرەب**

**تاکو تۆ بووی لاوەکانی کوردستانم دەردەچوون**

**بۆ زەکاتی ملکی شام و خەراجی حەڵەب**

# وێستگەی دیوان

- (١) پرسیار (دڵزار حەسەن)
- دیوانی هەولێر (لەتیف قۆجەی هەولێری)

نازم دڵبەند

- گۆشەی دۆیوان (محەمەد عومەر عوسمان)
- لە زمانی خۆیانەوە (هاودەنگ بێبەش)
- جەلال زەنگابادی و پرشنگی دوو یادەوەری

خدر ئیبراهیم خدر

- شێرزاد هەینی: دەبێت کەسایەتیەکان کاری نووسینی بیرەوەری بدەنە نووسەرەکان وەکو هەموو وڵاتانی جیهان

رەوەست نەوزاد

- ساڵۆنی لاپەڕە (٩)
- راستکردنەوەی وەڵامێک و ڕوونکردنەوەیەکی پێویست

(١)
پرسیار

# چۆن دەڕوانیە پەیوەندی نێوان دەق و خوێنەر؟

**دڵزار حەسەن:**

نوسەر تەنیا دونیای تایبەت بەخۆی دروست ناکات، بەڵکوو شێوازی بیرکردنەوەی خوێنەریش دیاری دەکات، فۆرمە تایبەتەکانی گواستنەوەی ئەو ڕوئیایەش دەدۆزێتەوە، بۆ ئەوەی دواجار بەهۆی لێکەوتەی جیاجیاوە و بۆ نزیکبوونەوە لەو دونیایە دەست لە شێوازە سواوەکان هەڵبگرێت و فشار دروست دەکات.

وەک چۆن نوسەر لە ڕێگەی نووسینەکانیەوە دونیای تایبەت بەخۆی دەخولقێنێت، بە هەمان شێوە خوێنەریش لە ڕێگەی بەریەککەوتنی لەگەڵ کتێبدا جیهانێک پێکدەهێنێت، بەڵام ناکرێت بڵێین سەت دەرسەت هاوشێوەی دونیای نوسەرە، بەڵکوو بەشێوەیەک لەشێوەکان جۆرێکە لە زیاد و گەشەکردنی. واتە لە شوێنێک تەواوکەریەتی و لە جێگەیەکی دیکەش داینەمۆیەتی.

هەڵبەت لە ئێستەدا میراتێکی مەزنی لێکۆڵینەوەی ئەدەبیی و میتۆدناسانمان لەبەردەست دایە، کە لە ڕابردوودا بۆیان جێهێشتووین، کە تێیدا پێ لەسەر بایەخی خوێنەر لە کردەی پێکهێنانی کاری ئەدەبیی و هونەریی دادەگرن. هەرلەپرسی (مەرگی دانەر)ی ڕۆلان بارت، هەروەها لەکتێبی (پلەی سفری نوسین) ەکەیدا، یاخود لە پەرتووکی (نوسەر چییە؟)یەکەی مێشێل فۆکۆ، یاخود لەکتێبی (ئەدەب چییە)کەی جان پۆڵ سارتەر. بەهەمان شێوە لە کتێبە میتۆدیەکەی (کردەی خوێندنەوە)ی (ۆلفگانگ ئایزەر) و (مەرگی ئەدەب)ەکەی (ئالڤین کێرنان) و( مەرگی ڕەخنە)وە بگرە

> **وەک چۆن نوسەر لە ڕێگەی نووسینەکانیەوە دونیای تایبەت بەخۆی دەخولقێنێت، بە هەمان شێوە خوێنەریش لە ڕێگەی بەریەککەوتنی لەگەڵ کتێبدا جیهانێک پێکدەهێنێت**

تا دونیای ئێستەمان وایان کردووە پێداچوونەوە بۆ ئەو تێگەیشتنە بکرێت، کە لێکدانەوەی کاری ئەدەبیی تەنیا لە فۆرمی نوسەردا وێنا بکرێت و گرنگیی خوێنەر لەبەرچاونەگرێت، یاخود لە هەندێک کاتدا هێندە ئەو ڕۆڵە بچووک دەکاتەوە، کە پێیوایە خوێنەر هەر ئەوەیە شاشەیەکی لەبەردەم دایە و گوێ ناگرێت و بیرناکاتەوە! لەو گۆشەنیگایەوە بۆ قسەکردن و نزیکبوونەوە لە دونیای هەر نووسەرێک، پێویستمان بە پەنابردنە بۆ تێگەیشتن لە چەمک و ڕەهەندە مەعریفییەکانی دەق، بۆ ئەوەی جۆرێکی تازەی خوێندنەوە لە هەناوی تێکستەکەدا بەرهەم بهێنێت، کە لەو بەریەککەوتنەدا هاتبێتەبوون. ئەوە یارمەتیمان دەدا دووربین لە تێڕوانینی نابەجێ و نازانستیی و نالۆژیکی، واشمان لێ بکات بریاری پێشوەختە لەسەر هیچ نوسەر و دەقێک نەدەین.

وەک (مارتن هایدگەر) پێیوایە (بۆ ئەوەی جەوهەری هونەر بدۆزینەوە، لەسەرمانە بەدوای کاری ڕاستەقینەدا بگەڕێین، هەروەها بپرسین کاری هونەریی چییە و جەوهەرەکەی چۆنە؟) تەنیا کاتێک جەوهەری کارێکی هونەری دەبینین و دەتوانین دایەلۆگی لەگەڵ بکەین، کە ئەومان مەبەست بووە، نەک شتێکی دی. بەمشێوەیە لەوە دەگەین، کە خوێندنەوەی دەقی ئەدەبیی جۆرێکە لە گفتوگۆ لەنێوان دەق و خوێنەردا. هەر کاتێکیش ئەو دایەلۆگە لەنێوان خوێنەر و تێکستدا هیچ شتێکی بەدەستەوە نەدا، ئەوە دڵنیابە لەنێوانیان شتی نوێ دروست نابێت، کە ببێتە مایەی تێڕامان و وردبوونەوە. ئەوەیش ئەوە دەسەلمێنێت، کە هەر لە بنەڕەتەوە بەریەککەوتن لە نێوانیاندا دروست نەبووە. تێگەیشتن و دایەلۆگ بەر لە هەر کردەیەکی دیکە وامان لێدەکات قووڵایی ئەو بەرهەمە ببینین، کە مەبەستمانە لێوەی بدوێین. شێوازی خوێندنەوە خۆی لە خۆیدا هونەرێکە و هەمان پلەی هەیە، کە نووسین هەیەتی. نوسەر و خوێنەر لە کاری ئەدەبیدا بەشدارن، بێ ئەوەی ئەو هاوبەشییە سنوورێکی جیاکەرەوە

و دیاریکراوی هەبێت. وەک چۆن (هایدگەر) لەکتێبی (سەرچاوەی کاری هونەری)دا دەڵێت: (بوون بە هۆی زمانەوە لە ڕێگەی مرۆڤەوە دەدوێت. مرۆڤ بە زمان نادوێت، بەڵکوو ئەوە زمانە دەیدوێنێت) بەهەمان شێوە (ئەرستۆ) لە پەرتووکی (هونەری شیعر)دا زۆر بە وردی باسی ئەو پرسە دەکات «پێدەر و وەرگر» دەخاتە هەمان ژینگە و لەیەک دۆخدا دەیان بینێت، کە کۆنترین ڕێگەخۆشکەری میتۆدییە بۆ تیۆرێک، کە لە فەزای گشتیدا خوێنەر تێیدا هاتنە وەلامی سەرەکی دەبینێت. هاتنە وەلام لای ئەرستۆ بیرۆکەی پاککردنەوە لەخۆ دەگرێت، پاککردنەوەش لە تراژیدیادا بەرجەستە دەبێت، بەو پێیەی چەمکێکی سەرەکییە لە چەمکەکانی ئەزموونی جوانیی، بۆ نموونە: ئەرستۆ لە کتێبە بەناوبانگەکەی (پۆیەتیکا – شیعرناسی و هونەری گوتاردان - ڕیتۆریکا) کە لە بنەڕەتدا ناوی ئەم بەرهەمە (لەبارەی هونەری شیعرەوەیە) یەکێکە لەو دوو کتێبەی ئەرستۆ لەبارەی شیعر، گوتار، هونەری نووسین، ئاخاوتن و زمانەوانی، بەلای ئەرستووە ئەو دوو بەرهەمە زانستیی بەرهەمهێنانن و مەبەست لێیان یارمەتیدانی پێگەیاندنی شاعیری چاکە. جەوهەری فیکری ئەرستۆش گواستنەوەی ئەو حاڵەتەی شاعیر و دەقە لە کردەیەکی مەعریفییەوە بۆ هونەری چێژ وەرگرتن، ئەوانەیش دەبەستێتەوە بە کردەی لاساییکردنەوە. لەبەر ئەوەی ئەدەب باسی کردەوەکانی مروڤ دەکات، وەک چۆن هەر کردەوەیەک سروشت و خاسییەتی تایبەتی خۆی هەیە، مرۆڤیش کە ئەنجامدەری ئەو کردەوانەیە شێوەی سروشتی و خاسییەتی تایبەتی خۆی هەیە، چ خاسییەتی ناوەوە بێت، یاخود تایبەتمەندی دەرەوە. لە ڕاستیدا کردەوەکانی مرۆڤ چاکە و خراپە بەسەریدا زاڵە، هەموو ئەمانەیش بە پێوەری ڕەوشتپەروەریی پێوانە دەکرێن، بۆیە بابەتی لاساییکردنەوە لای ئەرستۆ دەبێتە مانیفستۆی ئەخلاقیی، تا لێیەوە مرۆڤ بناسێت، کە خۆی لە چەمکی چاکە و خراپە دەبینێتەوە. هەر ئەو جیاوازییەیە، کە پرسی دونیای کۆمیدیا و تراژیدیا لە یەک دادەبڕێنێ. کۆمیدیا هەوڵ دەدات خەڵک لە واقیعی خۆیان خراپتر وێنایان بکات، کەچی تراژیدیا هەوڵ دەدا چاکتر نیشانیان بدات.

کەسایەتییەکی وەک (هۆمیرۆس) کە هۆنراوەنووسێکی گریکی بەناوبانگ و نووسەری هەردوو داستانی بەناوبانگی «ئەلیادە و ئۆدیسایە« لە ڕێگەی ئەدەبەکەیەوە هەستا بە نەمرکردنی شەڕی تەڕوادە بەشێوەی هۆنراوە. کە مێژووناسان پێیانوایە لە دەورووبەری ساڵی ١٢٥٠ پ.ز ڕوویداوە. لەنێو دەقەکانیدا وێنەی کەسەکانی لە واقیعی خۆیان باشتر دەکێشا، کەچی (کلیۆفۆن) بەشێوەی ئاسایی خۆیان وێنەی دەکێشاو (هیگیمۆن) هەروەکوو شاعیرە کۆمیدییەکانی ئەو سەردەمەی یۆنانی کۆن، بە شێوەیەکی گاڵتەجارانە ڕەخنەی ئاراستەی دیاردە ناشیرین و کەم و کورتییەکانی کۆمەڵگەی ئەو سەردەمەی گریک کردووە و لە ڕێگەی دەقە شانۆیی و شیعرییەکانەوە، نارێکییەکانی دەرخستووە و داوای باشتربوونی کردووە. لەهەمان کاتدا کەسەکانی لە واقیع پەست و نزمتر پیشان دەدان.


دلزار حەسەن

شێوازی لاساییکردنەوە بەپێی بۆچوونەکانی ئەرستۆ دوو جۆرن: یان ئەوەیە ڕاستەوخۆیە لەسەر زمانی خۆیەوە قسە بکات، وەک ئەوەی هۆمیرۆس لە ئۆدیسەدا کردوویەتی و سیمایەکی درامی بە بەرهەمەکانی بەخشیوە، یاخود ناڕاستەوخۆیە لە ڕێگەی گێڕانەوە، بەشێوەیەکی گشتیی ئەوەیش بۆ دوو هۆ دەگەڕێتەوە:

یەکەم ئارەزووی مرۆڤ بۆ لاساییکردنەوە، چونکە لێیەوە چێژ وەردەگرێت، هەروەها هۆیەکە لە هۆیەکانی بەدەستهێنانی زانین. لەپاشان گرنگیی دەنگ و ئیقاع و گێڕانەوەیش بە بەشێک لەو لاساکردنەوەیە دادەنێت، کە چێژ دەبەخشێت.

ئەرستۆ لەبەشی چواری «پۆیەتیکا» ئاماژە بۆ ئەوە دەکات، کە سەرهەڵدانی شیعر لە مرۆڤدا بۆ دوو هۆی سروشتی دەگەڕێتەوە، بەڵام ئەگەر لە جەوهەردا لەو دوو شتە ورد ببینەوە هەندەک فراوانتر بۆی دەچین و زیاتر لە خاڵێک لەخۆ دەگرێت. بەمانایەکی دیکە ئەو دیاردەی لاسایرکردنەوەیە دەبن بە چوار جۆر

دوای هەڵاوێردکردن و وردبوونەوە لە چەمکی دەق و خوێنەر، باوەڕێکم بۆ دروست بووە، یەک ڕەهەندی بۆ تێگەیشتن لە دەق دواجار بە مەرگی دەق تەواو دەبێت

(مرۆڤ بوونەوەرێکی لاساییکەرەوەیە، چێژ لە بینینی لاساییکردنەوە وەردەگرێت، حەزی لە فێربوونە، بە سروشت حەز لە ئیقاع و کێش دەکات) ئەو بیرۆکەیەی ئەرستۆ بەپێی سەردەمەکان دەبێتە پەتێکی درامی و لای بیرمەندێکی وەک ( نیتچە) فۆڕم وەردەگرێت و لە چوارچێوەی فەلسەفەی حەقیقەتدا جارێکی دیکە دەیخاتە ژێر پرسیار و ڕەخنەوە، کە پێیوایە حەقیقەت وەستاو نییە، بەڵکوو بەردەوام پێویستمان بە حەقیقەتی دی هەیە. لێرەوە دەتوانین بڵێین گەڕان بە دوای حەقیقەتی نوێ بووەتە ڕەگەزێکی گرنگ و بەتەواوی خۆی خزاندووەتە نێو دونیای فیکری فەلسەفییەوە، بە ڕادەیەک ئەوە بووەتە جەوهەری فەلسەفەکانی سەردەمی ڕۆشنگەریی، کە ڕەخنەگران بە پلەی یەکەم ڕەخنەیان لە ناوەندگەرایی گرت، بەوەی هەموو ئەو شتانەی بەلاوە ناوە، گوایە لەگەڵ حەقیقەتی زانست و ڕۆشنگەریدا ناگونجێن.

فەیلەسووفێکی وەک (جینی هیرج) لە کتێبە دانسقەکەیدا، بەناوی (سەرسامیی فەلسەفی) پێیوایە بایەخدان بە حەقیقەت پاڵی بە (نیتچە)وە نا بپرسێت حەقیقەت چۆن پێک دێت؟ چۆن پێیی دەگەین؟ کاتێکیش دەستی پێوەدەگرین، ئینجا بۆمان دەردەکەوێت مەحاڵە بە تەواوی بەدەستی بهێنین.

بیرمەندێکی وەک (ژیل دۆلۆز) سەرسامی خۆی ناشارێتەوە بە ڕۆشنفکرانی سەردەمی ڕۆشنگەری و لە پەرتووکی «جیاوازی و دووبارە» دەنووسێت: لە ئێستەدا مەحاڵە بتوانین کتێبێکی فەلسەفی بەو شێوەیە بنووسین. ڕۆمانووسێکی وەک (گابریل گارسیا مارکیز) لە ڕۆمانی «پاییزی پەیتریارک»دا دەڵێت: هەر حەقیقەتێک حەقیقەتێکی دی دەشارێتەوە. ئایدیاسیۆنی گوتارگەلی لای میشێل فۆکۆش جیاواز دەکەوێتەوە. فۆکۆ هەر لەبنەڕەتدا پەیڕەوگیری و یەککگوتاری لەنێو دەقدا ڕەتدەکاتەوە و پێیوایە بۆ خوێندنەوەی دەق چەندین بنەمامان هەنە.

دوای هەڵاوێردکردن و وردبوونەوە لە چەمکی دەق و خوێنەر، باوەڕێکم بۆ دروست بووە، یەک ڕەهەندی بۆ تێگەیشتن لە دەق دواجار بە مەرگی دەق تەواو دەبێت، بۆیە دەڵێم: هەر کاتێک یەک دیوی دەقەکەمان بینی، کەواتە بە ڕاستەقینەیی بەر مەرگی دەق کەوتووین. لێرەدا تەنیا خوێنەرە دەبێتە فریادڕەسی دەق و دەبێتەوە بەو کارەکتەرە زیندووەی، کە هەموو دیوەکانی دەق دەبینێت و دەق لە مردن ڕزگار دەکات، دواجاریش بەهەستە ژیرانەییەکەی تێکست لەمەرگ دەپارێزێت و نەمری پێدەبەخشێت.

فەیلەسووفێکی وەک نیتچە، کە فۆکۆ سەرسامە پێی، هەر لە بنەڕەتدا دژی بنەمابووە، لای وایە بنەما بۆ خوێندنەوەی دەق کارێکی کوشندەیە و دەق تووشی ئیفلیجی دەکات. دوای کتێبی مەرگی نوسەرەکەی ڕۆلان بارتیش لای من پرسی مەرگی دەق دێتە ئاراوە، کە ئەوە تێزێکی تازەیە و من لە میانی لێکۆڵینەوە و گەیشتنم بە گرینگی خوێنەر بۆ دەق، ئەو تێگەیشتنەم بۆ دروست بووە.

ئەو بۆچوونەی، کە دەڵێت: خوێنەر تەواوکەری دەقە، لە زۆر کاتدا خودی دەقەکەشە. خوێنەر دەقە ڕاستەقینەکەیە، نەک تێکستەکە خۆی! تێگەیشتن لە ماهییەتی خوێنەر دەتگەیێنێتە ئەو ڕاستییەی، بێ خوێنەر، دەق مردووە، ئەوە زیندوویەتی خوێنەرە ڕۆح وەبەر دەقدا دەکات.

# لەتیف قۆجەی هەولێری

ڕۆژگارێـک ئـەو نێو فیتـەرانـەی ئێستەی هەولێرێی ڕێگای پیرمام تا گواستنەوەیان لەساڵی ١٩٧٩ لەو شێخەڵڵایە بوو، یەکێک لە فیتەرە ناسراوەکانی ئـەوێ ڕۆژێش (حاجی واحید، حاجی حەیدەر، لەتیف قۆجە، محیەدین و خەلیل ... هتد) بوون، هەمیشە بەدڵسۆزیی و ڕاستگۆییەوە کارەکانی خۆیانیان دەکرد،

(لەتیف سەلیم قۆجە) وەستایەکی دیاری هەولێریی بوو، ساڵی ١٩٢٩ لەقەڵاتی هەولێر لە دایکبووە، هەر لە منداڵییەوە، لەلای خاڵی وەستا (موسا کارەباچی) کە ئەویش یەکێک بووە لەوەستا بەناوبانگەکانی هەولێر، دەستی بە کاری فیتەریی کردووە، پێشتریش لەساڵانی چل و پەنجاکان لەنێوان هەولێر - بەغدا، شەقڵاوە- حاجی ئۆمەران کاری شوفێریشی کردووە.

لەتیف قۆجە لەگەڵ ئەم کاروکاسبیەشی، ڕۆحی کوردایەتی و نیشتمانپەروەریی بە ئەرکێکی پیرۆزی خۆی زانیوە. دوای کودەتای (١٤)ی ڕەمەزانی ساڵی ١٩٦٣ی بەعسییەکان و گرتنەدەستی دەسەڵات

هێزێکی حەرەس قەومییەکان دەچنە سەر ماڵەکەی، بەمەبەستی دەستگیرکردنی، کە ئەودەمی ماڵەکەیان لە گەڕەکی سەیداوە بوو، بەڵام ئەو زووتر پێی زانیبوو،

بۆیە زۆر بە وریایی لە پشتەوەی ماڵەکەی خۆی دەگەیەنێتە ماڵی (عەزیز مەحموود ئەحمەد چەمرگەیی) دراوسێیان، دوای ئەوەی ماڵەکەی دەپشکنن و دڵنیا دەبن، ئەو لە ماڵەوە نییە، بەناچاری ڕۆیشتوون. دوای ئەو ڕووداوە گەڕاوەتەوە ماڵ و دواییش چۆتە ماڵی (نازم ئاغای ئەسعەد)ی کە کەسایەتییەکی کوردپەروەر و ئەندامی (حزبی هیوا) بووە، بۆ ڕۆژی دواییش چۆتە بنەسڵاوە بۆ لای مفەوەز ئیبراهیم ئەفەندی، کە لێپرسراوی هێزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان بووە لەوێ. لەوڕۆژەوە لەتیف قۆجە چەکی پێشمەرگایەتی لەشان دەکات و دەبێتە پێشمەرگە.

ساڵی ١٩٦٢ ڕژێمی ئەوسای بەغدا لە هەولێر دەیانەوێ خواڵێخۆشبوو شەمسەدین موفتی

**یەکەمجار ڕادیۆی دەنگی کوردستان لەبەغدا لەلایەن کەمال عوسمان ئاغا دابینکراوە و لەتیف قۆجە و سەلاح عوسمان ئاغا بردوویانەتە شاخ**

دەستگیر بکەن، ئەویش دەچێتە دوکانی وەستا لەتیف قۆجە و هەواڵەکەی پێڕادەگەیەنێ و داوای لێ دەکات

ڕزگاری بکات، ئەویش ئامادەباشی خۆی دەردەبڕێ و بە ئۆتۆمۆبێلەکەی خۆی دەگەیەنێتە مەخفەرەکەی گۆمەسپان، کە ئەودەمە لەلایەن هێزی پێشمەرگەوە بەسەرکردایەتی (مەلا عەولا ـ مەلا ماتوڕ) ئازاد کرابوو.

مێژوو، سەربڵندیی، جورئەت و قارەمانێتی وەستا لەتیف قۆجە، دەگێڕێتەوە، ئەوەی نەجات یاسین نەجار) لەکتێبی (کەسایەتییە ناودارەکانی هەولێر) بەمشێوەیە تۆماری کردووە:

ئێزگەی شۆڕشی ئەیلول، یان دەنگی کوردستان، کە لە ڕێگای (کەمال عوسمان ئاغا) لەبەغدا پەیدا کرابوو، بەو پێیەی ناوبراو ئەوساکە لە بەغدا لەسەردەمی عەبدولکەریم قاسم سەرۆک وەزیرانی عێراق پیاوێکی دەستڕۆیشتوو بووە. وەستا (لەتیف قۆجە) لە بەغدا لەگەڵ سەلاح عوسمان ئاغا کە دەکاتە برای کەمال عوسمان ئاغا، چوونەتە لای کەمال سلێمان و ڕادیۆکەیان لێ وەرگرتووە، بەلام کاتێک لەگەڵ سەلاح عوسمان ویستوویانی ڕادیۆکە بێننەوە هەولێر، لە ڕێگەی گەڕانەوەیان تووشی شوفێرێکی خەتی هەولێر ـ بەغدا دەبن، کە ناوی (جەمال ستێک) بووە، ئەو شوفێرە پێیانی ڕاگەیاندوون، کە ئاشکرا بوونە و داروودەستەی ئەمن و پۆلیس زانیویانە، ئێوە ئێزگە بۆ هەولێر دەبەن، ئەوکاتیش (بەدرەدین عەلی) موتەسەریفی هەولێر بووە، کە کابرایەکی زۆر دژە کورد بووە، ئەوانیش دووبارە گەڕاونەتەوە لای (کەمال عوسمان ئاغا) ئەویش ڕێگەیەکی دیکەی بۆ دەربازبوون نیشانداون، دواتر ئەوانیش ئێزگەکەیان گەیاندۆتە شوێنی مەبەست و دەستی بەپەخشی ئاسایی خۆی کردووە.

ئەم هەڵوێستە و زۆری دیکەی وەستا لەتیف قۆجەی ڕەحمەتی شایانی ڕێزلێنانە، کە ئەوساکە خەڵکانێک هەبوون، هەموو بەرژەوەندییەکانی خۆیان بەلادا دەدا، بۆ بەرز ڕاگرتنی ڕۆحی کوردایەتی و نیشتمانپەروەریی، کە یەکێک لەوانە، ئەو پیاوە تێکۆشەرە قەڵاتییەی هەولێری بووە، تا لە (٢٠١١/٧/١٧) ماڵاوایی کرد و لەگۆڕستانی (مەعمەی قیر)ی هەولێر نێژرا، هەر بەو ڕۆحیەتەوە ژیا.

**• عیسا پژمان لە کتێبەکەیدا بەناوی نهێنییەکانی بەستنی پەیمانی ١٩٧٥ی جەزائیر، لەلاپەرە (٧٩-٨١) باسی چۆنیەتی دابینکردنی ئەو ڕادیۆیەی کردووە، کە خۆی لەسەر داوای شای ئێران چۆتە ئەڵمانیا و ئەو دەستگایەی بۆ کڕیون و بۆی دامەزراندوون ... گۆڤاری دیوان**




# محەمەد عومەر عوسمان:

# مرۆڤ تا کەم بزانێت باشترە، تا هەر هیچ نەزانێت باشترە!

هەڵبەتە، کۆمەڵێک موعاناتی فەلسەفی، غوربەت و عیشق، لەپڕ وەکو چۆن کانییەک دەتەقێتەوە، منیش تەقیمەوە.

ماوەیەکی کەم چووم بۆ سەربازیی، شەوێک هەموویان نووستبوون، هەستام و مۆمێکم لە هۆڵەکە داگیرساند، بەیانی، کە هەستام سەیرم کرد ئاوا دەستم پێکردبوو ١٣ بۆ ١٤ کۆپلەم نوسیبوو:

***سینی پڕە ئەم هەورەی تیا***
***لەچاوانمەوە باران دائاکا***
***هەوریشم بەفری بەر هەتاویکە***
***هەر ئەبێ بەشوێن مردنا ڕاکا***

عیشق هەوێنە بۆ هەموو شتەکان، لە سەرەتاوە کاریگەرییەک لەسەر دڵ و دەروونت بەجێ دێڵێت. کاتی خۆی تۆزێک دەستی نەقاشیی و شێوەکاریم هەبوو. لە ساڵی ١٩٧٥ یەکەم جار لەژیانمدا مەدالیایەکم وەرگرتبێت لەسەر وێنەکێشان بوو، ئەوکاتانە بەهۆی مامۆستا حیکمەت هیندیی-یەوە کاری نواندنیشم دەکرد، کۆمەڵێک بەهرەی باشم تیابوو، مرۆڤ تا کەم بزانێت باشترە، تا هەر هیچ نەزانێت باشترە، من هەمیشە وتوومە من نازانم، وەک چۆن تۆش ناتوانی پەی بەهەموو زانستێک، بەگەردوون، بەکەون و کائینات بەری، بەڵام دەشی مرۆڤ هەندێک شت بزانێت، کە خەڵکانی دی نایزانن، خەڵکی زۆرجار باس لە نەهامەتییەکانی خۆیان دەکەن، من هەست دەکەم ئێمەی خەڵکی ئەو وڵاتە، ڕەبتمان بەئاسمانەوە نەماوە، ئاسمان بەمانا میسالییەکەی نا، بەو مانایەی هەموو شتەکان کاریگەرییان لەسەر یەکتری هەیە.

بۆ نموونە تۆ ئەگەر مۆبایلەکەت بەرقەوە بدەیت بەعەرزا، بەجۆرێک لە جۆرەکان هەقت لێ دەکاتەوە، تۆ بەبێ گیان سەیری مەکە، یان ئەچیتەوە ماڵەوە با کۆمپیوتەرەکەت ئیش نەکات، لەوانەیە ئیشکالێکت لەگەڵی بووبێت.

من پێموایە دەنکە لمێک، گەردیلەیەک لەم کەونەدا نەبووە و نابێت، هیچ شتێکیش ناڕوات بەبێ ئەوەی کاریگەریی خۆی بەجێ بێڵێت، هەموو شتێک کاریگەریی خۆی بەجێ دێڵێت ئینجا ئەڕوات.

لەو ڕۆژانە شتێکم بە برادەرێک گوت، زۆر سەرسام بوو، وتم بەدرێژایی تەمەنتان، ئەو خەڵکەی بەهاران، کە دەچنە ژێر درەختێک، بۆ نموونە تۆ دەچیتە ژێر درەختێک و دەحەسێیتەوە قەت لەژیانتدا دوای ئەوەی لەژێر سێبەری درەختێکی سەوزدا حەساویتەوە هەستاویت و بڵێی سوپاست دەکەم، کە ئەوانیش ئیحساس و گفتوگۆی خۆیان هەیە، بەڵام بە زمانێکی جیاواز لەزمانی ئێمە، ئەو برادەرە زۆر سەرسام بوو.



**• ئەمە پووختەی چەند قسەیەکی محەمەد عومەر عوسمان-ە کە بەشێوەی دەنگ و ڕەنگ تۆمارکراوە.**

## لە زمانی خۆیانەوە

# هاودەنگ بێبەش:

## دوای خوێندنەوە و داخستنی کتێبەکەم خوێندنەوە ڕاستەقینەکە دەست پێ دەکات

ئامادەکردنی/ یووسف ئیسماعیل

وەکوو کتێب خوێندنەوە و خوێندنەوەی دەرەوەی مەنهەج و قوتابخانە، یەکەم کتێب، کە خوێندمەوە، مەم و زین بوو، کە هەژار موکریانی کردوویەتیە سۆرانیی، ئەوەش دوای ئەوەی کە ساڵی ٢٠١٧ ئەوکاتەی پۆلی هەشتی بنەڕەتی بووم، لە قوتابخانە وانەیەکمان لەسەر ئەحمەدی خانی و داستانە بەناوبانگەکەی، مەم و زین هەبوو، ئیدی کەڵکەڵەی خوێندنەوەی مەم و زینم کەوتە سەر.

دوای ئەوە زۆر کتێبخانە گەڕام دەستم نەکەوت، بەناچاریی لە ئینتەرنێت بەدوایدا گەڕام و دۆزیمەوە، کە کردمەوە بینیم لاپەڕلاپەڕ هەڵدەدرێتەوە و کتێبێکە بۆ خۆی، لەوێوە کتێبی ئەلیکترۆنیم دۆزییەوە و زۆر کتێبی ئەلیکترۆنی دیکەشم خوێندەوە. دوای ساڵێک وردە وردە حەزم کرد کتێب بکڕم، دواتریش کتێبخانەیەکم لە کتێبە خوێنراوەکانم پێک هێنا.

ئەگەرچی کاریگەریی خوێندنەوە وەکو سەرتاشین نییە، زوو پێتەوە دیاربێت، بەڵکوو وەک چاندنی تۆوێک وایە، کە وردەوردە گەشە دەکات و دەبێتە درەختێک لە مەعریفە، من لەم خوێندنەوانەم چێژم دەبینی و ئەزموونم لە ژیانی ئەوانی دی وەردەگرت خەیاڵم فراوان دەبوو بیرم لە شتانێک دەکردەوە، کە پێشتر بیرم لێیان نە کردبووەوە. زمانم پڕا و وشانێکم کەوتە سەر زار، کە پێشتر ماناشیانم نەدەزانی. هێمنتر بووم و هەستیاریم بەرانبەر ئەوانی دی زیادی کرد.

وشەی بۆم لە پێش هەموو کردارێکی دەوروبەرم دادەنا و وێڵی وەڵامەکانیان دەبووم.

ئێستە لەچاو ئەو سەرەتەم جیاوازییەکی زۆرم هەیە، سەرەتا خوێندنەوەکانم پەرت بوو، فرە بابەت و فرە ژانەر بوو، بۆ ئەوەی ڕۆشنبیرییەکی گشتیی کۆکەمەوە. دواتر بەپێی ئەوە حەز و خولیایەی بۆ شیعر و ئەدەبیات هەمبوو زیاتر تیشکم خستە سەر ئەدەبیات.

## پرۆفایل

هاودەنگ بێبەش- ناوی تەواوی هاودەنگ سەباح حسێن لە ٢٠٠٣/٧/١٤ لە شاری هەولێر هاتووەتە دونیاوە، لە ساڵی ٢٠٢٠ یەکەم نامیلکەی شیعری خۆی بە ناوی (سەدەی سەهۆڵ) چاپکردووە، لە ساڵی ٢٠٢٢ دەستی بە خوێندنی بەکالۆریۆس کردووە لە زانکۆی سەلاحەدین کۆلێژی پەروەردە بەشی زمانی کوردی. لە ساڵی ٢٠٢٣ خەڵاتی پلەی یەکەمی لە شەشەمین فیستیڤاڵی ئاران پێ بەخشراوە بۆ دەقی (ئێرە مرۆخۆرستانە) دەرچووی بەشی زمانی کوردی کۆلێژی زمانم لە زانکۆی سەلاحەدین، لە ئێستادا خەریکی کارکردنم و هیچ وەزیفەیەکم نییە.




پێشتر دوای ئەوەی کتێبەکەم دادەخست وازم لە خوێندنەوە دەهێنا، بەڵام ئێستە دوای خوێندنەوە، بیرکردنەوە و ڕامان دامدەگرێ، دەتوانم بڵێم دوای خوێندنەوە و داخستنی کتێبەکەم خوێندنەوە ڕاستەقینەکە دەست پێ دەکات، وەک پرسیارێک، کە هەمیشە لەخۆمی دەکەم، کە خوێندنەوەت بۆ ئەم کتێبە و بابەتەکانی ناوی چییە؟

دواجار خوێندنەوە هیچ نەبێت مێشکت کراوەتر دەکات بەرانبەر بیرکردنەوەی ئەوانی دی، وا دەکات بە چەند شێوەیەک وەڵامی پرسێک بدۆزیتەوە. لەچەند ڕوانگەیەکەوە بڕوانیتە دیاردەکانی دەوروبەر. وای کرد، کە بە زانیاریی تەنک و گشتیی ڕازی نەبم و بچمە نێو قووڵایی ئەو بابەتانەی ئارەزووم بۆیان هەیە

# جەلال زەنگابادی و

# پرشنگی دوو یادەوەری



خدر ئیبراهیم
خدر

لەماوەی خوێندنی زانکۆییم لە شاری هەولێر، جگە لە دروستکردنی رایەڵەی هاورێیەتی و ناسیاوەتی لەگەڵ ژمارەیەک لە خوێندکاران و مامۆستایانی شایستە بە هاورێیەتی، هاوکات لەدەرەوەی زانکۆش ژمارەیەک لەو مرۆڤانەم ناسی، کە لەنێو قەڵەمرەوی ئەدەب و نووسیندا لەکایە جۆرراوجۆرەکاندا دەیانـنووسی. لەهەمان کاتدا کاراکتەرێکی جوانی نێو ژیانی واقیعی بوون.

یەکێک لەو مرۆڤە سەنگینانە (جەلال زەنگابادی) بوو، ئەگەرچی زۆر بە کەمی دەمتوانی چاوم پێبکەوێت و لەتەکیدا سەبارەت بە دونیای وشە و نووسین بدوێین و جیهانبینیمان بخەینەروو، بەڵام بەو کەمە بینین و گفتوگۆیەش دەیسەلماند، کە مرۆڤێکی راستەقینەیە و شایستەی ئەوەیە لەپاش مەرگی ناوادەی، لە دڵەوە دروودی بۆ بنێرین و ستایشی مرۆڤبوونی بکەین.

لێرەدا، دەمەوێت دوو یادەوەری بچووک بخەمەروو، کە پەیوەستن بەو مرۆڤە و خەمخۆری وی بۆ کایەی رۆژنامەنووسیی و شارەزابوونی لە قۆرت و پێچەکانی نووسین.

یەکەم: لەدوای دامەزراندن و دەستبەکاربوونی یەکەم کابینەی حکومەتی هەرێمی کوردستان، وەزارەتی رۆشنبیری بریاریدا سێ گۆڤار و رۆژنامەیەک بڵاوبکاتەوە، کە بریتیبوون لە (گۆڤاری کاروان) وەک درێژەپێدەری (گۆڤاری کاروان)ی پێش راپەرین، گۆڤاری (هەنگ) بۆ منداڵان، گۆڤاری (القافلة) بە زمانی عەرەبی، کە ناوەکەی تەرجوومەی ناوی گۆڤاری (کاروان) بوو. رۆژنامەی (هەرێم) کە بەشێوەیەکی هەفتانە بڵاودەکرایەوە.

کاک (جەلال زەنگابادی) بەرێوەبەری نووسینی گۆڤاری (القافلة) بوو. کاتێک ئاگاداربووم ئەم گۆڤارە بەعەرەبی دەردەچێت و ئامانج لێی ئاراستەکردنی کولتوور و ئەدەبیات و مێژووی کوردە بە خوێنەرانی عەرەب. منیش وەک خوێنکارێکی بەشی مێژووی کۆلێژی ئەدەبیاتی زانکۆی سەلاحەدین و هەواداری مێژوو و ئەدەبیات و نووسین، پێم باشبوو لە ژمارەی (١)ی ئەم گۆڤارە، بە بابەتێک بەشداریم هەبێت. بیرم کردەوە بابەتێک بێت ئاراستەیەکی مێژوویی هەبێت. دواجار هاتمە سەر ئەوەی بابەتێک سەبارەت بە کۆنترین نەخشە ئامادە بکەم، کە تیایدا ئاماژە بە خاک و وڵاتی کوردان کراوە و لەلایەن زانا و مێژوونووسی تورکی موسوڵمان (مەحموود کاشغەری) لەچوارچێوەی کتێبی (دیوان لغات الترک)دا لەنێو نەخشەیەکدا، کە لەو کتێبەدا هاتووە.

مێژوونووسی ناوبراو کتێبەکەی لەسێ بەرگدا بە زمانی عەرەبی لە ساڵی (١٩١٥ ز - ١٣٣٣ ک) لە ئیستامبوڵ چاپکردووە و بڵاوکردۆتەوە. تیایدا ناوی وڵاتی کوردانی بە (ارز الاکراد) هێناوە، کە واتای (خاکی کوردان) دەگەیەنێت.

کۆچکردوو کاک جەلال زۆر خۆشحاڵ بوو بۆ ئەم بابەتە و لە ژمارە (١)ی گۆڤارەکەدا بڵاوکرایەوە. دواتر لەلایەن ژمارەیەک لە نووسەر و قەڵەمبەدەستانی شاری هەولێر و ژمارەیەک لە مامۆستایانی بەشی مێژووی

کۆلێژی ئەدەبیات دەستخۆشیم لێکرا، ئەمەش بۆ من جێگەی شادمانییەکی زۆربوو.

دووەم: لە ساڵی ٢٠٠٨ کە هێشتە هێندە لە زمانی فارسیی قووڵنەببوومەوە و نەمدەتوانی بەتەواوی سەر لەکون و کەلەبەر و پەناو پێچەکانی ئەو زمانە دەربکەم، جارێک ڕووبەڕووی وشەیەک بوومەوە، کە چەندی کردم نەمتوانی واتایەکی دروستی بۆ بدۆزمەوە، ئەویش وشەی (ذیاب آبی) بوو. ئەوەڵجار پەنام بۆ دوو سێ کەس لە هاوڕێیانی فارسزمانی تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووک برد، بەوپێیەی وەک وشەیەکی نێو زمانی دایک، بەبێ هیچ چەندوچوونێک دەتوانن سەری لێدەربکەن. کەچی ئەوانیش دەستەوەستان و نەیانتوانی سەری لێدەربکەن. دواتر کاک (جەلال زەنگابادی)م هاتەوە یاد، کە لەوە دڵنیابووم شارەزاییەکی باشی لە چەند زمانێک هەیە، کە یەکێک لەوان زمانی فارسییە. بۆیە پەیوەندیم پێوەکرد و پێمگوت : «خۆم و دوو سێ کەس لە هاوڕێیانی فارس زمان نەمانتوانیوە واتای ئەم وشەیە ڕاڤەبکەین، ئایا بەلای تووە چی دەگەیەنێت؟»

هێندەی پێنەچوو، کاک جەلال گرێی گرفتەکەی کردەوە و بۆی نووسیم کە ئەم وشەیە (هەڵەی چاپ)ە و ئەسڵی وشەکە (ذباب آبی)یە و لەچاپە فارسییەکەدا بەهەڵە خاڵیکی زیاد لە ژێر پیتی بێی ناوەڕاستی وشەی (ذباب) دانراوە. بەوپێیەش وشەکە بە واتای (مێشوولەی ئاوی) یاخود (مێشی سەرئاوی) دێت. کاتێک ئەمەم زانی، لەدڵەوە پێکەنیم، کە نەمن و نە ئەو هاوڕێ فارسیزمانانەی ئەودیو درکمان بەو هەڵە بچووکە نەکردبوو.



جەلال زەنگابادی ١٩٥١ - ٢٠٢٣/٩/٥

# شێرزاد هەینی:

# دەبێت کەسایەتییەکان کاری نووسینی بیرەوەری بدەنە نووسەرەکان وەکو هەموو وڵاتانی جیهان

ڕەوەست ئەوزاد

(شێرزاد هەینی) باسی لەژیانی خۆی و چوونی بۆ هەندەران و نووسینی کتێبەکانی کرد و گوتی: «دەمەوێت ئەوە بڵێم کە ئایا ئەگەر من لەهەولێر کاری ڕووپێوی شارەوانیم بکردبایە و نەڕۆشتمایە ئەورووپا، دەمتوانی ئەو هەموو کتێبە بنووسم؟ کە لەوانەیە هەر ئەو چەند نامیلکەیەم نوسیبایە، کە پێشتر لەهەولێر نوسیبووم، بۆیە ئەو بوارەی کە بۆ من لەوڵاتی سوید و کاروانی گەشتەکەم و ئارامی منداڵەکانم و بەردەوامی لەناو فرۆکە و شەوە جوانەکانی ستۆکهۆلم و بەفرە جوان و دارستانە سەرنجڕاکێشەکانی سوید بۆم ڕەخسا ڕەنگە هۆکاربن کە من توانام هەبێت بەردەوام بنووسم».

هەینی گوتیشی: «حەزدەکەم لەو کۆڕەدا لەباسی کۆتا ئەزموونم دەست پێ بکەم کە دوا دیدارم سێ مانگ لەناو کتێبخانەکەی فەرهاد عەونی بوو، کە بەقاوە خواردنەوە و دانیشتن و کتێب و یادگاری و بیرەوەری بەڕێم کرد کە کارم لەگەڵ ئەو پیاوە کرد کتێبێکم لەگەڵی نووسی، یەکەم ئەزموونیشم لەنووسین ئەوکات بوو کە لەشارەوانی هەولێر بووم لەتەک کارەکانی خۆم وەکو ئیفرازکردنی زەوی و بەڵێندەرایەتی، حەزم لەخوێندنەوە و کتێب بوو وتم با یادی سەد ساڵەی شارەوانی هەولێر بکەینەوە، ئەوەبوو چوومە لای بەڕێوبەری ئەوکاتی شارەوانی و پێموت حەزدەکەم کتێبێک لەسەر یادی سەد ساڵەی شارەوانی هەولێر ئامادەبکەین، ئەویش گوتی پشتیوانیت دەکەم. ئەوەبوو دەستمپێکرد کە (مەغدید حاجی) هاوکارێکی زۆرباشم بوو لەو کارە تا کتێبەکەمان بڵاوکردەوە».

سەبارەت بەکتێبەکانی دیکەی، شێرزاد هەینی دەڵێت: «هەر یەکێکیان چیرۆکێکی خۆی هەیە بۆ نموونە یەکێک لەو نامیلکانەی کە لەشاری سلێمانی بۆیان چاپکردم (مەملەکەتی فارگۆنەکان) بوو کە تێیدا باسی ژیانی ڕۆژانەی خۆم دەکەم لەکامپی وڵاتی یۆنان و سەربوردەی ئەو کەسانەی کە لەو ڕێگایانە بوون وەکو عاشق و سووتاو و حەشیشەخۆر و شەڕ و ئازارەکان و کاری باش و خراپ کە چل ڕۆژ لەگەڵیان بووم کە ئێستاش کەسایەتی (شێرزاد هەینی) بەمەملەکەتی فارگۆنەکان دەناسرێتەوە.

ئەو نووسەرە باسی یەکێکی دیکە لەبەرهەمەکانی خۆی کرد کە ئەویش (مەملەکەتی کەلاوەکان)ەو ڕایگەیاند: ئەو بەرهەمەش نامیلکەیەکی بچووکە کە دەکرێت بڵێم یەکەمین کتێبە لەسەر بیناسازی کوردی نووسرابێت و باسی کەرەستەکانی خانووی کوردەواری تێدابێت کە چەندین وشەی کوردیم تێدا نووسیوە کە زۆربەیانم لەو کەسانە وەرگرتووە کە بۆ کاری خۆیان سەردانی شارەوانیان کردووە، بەڵام بۆ ئەوەی تایبەتمەندیەکی بدەمێ ئەو نووسینەم کردە نامەیەکی دڵداری کە بریتییە لەوەی کوڕێک ئەو شتانە بۆ کچێک دەنووسێت کە دەڵێت (بیرتە وامان دەکرد و لەسەربان وەستا بووین کاتێک کاریتەمان دەبەستەوە تۆ قورت لەگەڵمان دەگرتەوە).

سەبارەت بەئەزموونی خۆی لەنووسینی ڕۆمان، هەینی گوتی: نوسەرانی عەرەبی زۆر ڕۆمانیان لەسەر شارەکانی خۆیان و بەناوی شارەکانیش نووسیوە، منیش وتم باشە هەولێر لەو شارانە گەورەتر و نازدارترە و سەربردەی زۆرە و کەسانی شۆڕشگێر و عاشق و تاوانبار و جوو و هەموو شتی تێدایە، بۆچی من نەیان نووسمەوە، ئەوەبوو ڕۆمانەکانی هەولێر نووسیەوە کە چەندین بابەتی تێدایە لەوانە چیرۆکی مەلایەکی

مزگەتێکی هەولێرم نووسیەوە کە چووبووە ئەمریکا و دواتر وێنەی ڤیدیۆیی خۆی بۆ کەسوکارەکەی دەنێریتەوە هەولێر کە بەدوانزە بەرگ و بەپەنجا هەزار وشە نووسیمەوە کە هەر یەکێکیان بەناوی گەرەکێکە و تەنیا یەکێکیان بەناوی شەهید سەعدی گچکەم کرد، چونکە ئەو شەهیدە یادگاریەکی پیرۆزی لەلای من هەیە کە ئەزموونێکی جوان و نوێ بوو لەهەولێر کە دەنگدانەوەیەکی باشی هەبوو.

ئەو نووسەرە بەشێکی گەورە لەکاری نوسینی بریتییە لەوەرگێڕان، لەو بارەیەوە شێرزاد دەڵێت: زۆرترین کاری وەرگێڕانم کە ژیان و رۆژانێکی زۆری لێبردم وەرگێڕانی هەموو رۆمانەکانی نووسەرێکی عێراقی بوو کە ئەویش عەلی بەدر بوو کە نووسەرێکی سەرکەش و ئازا بوو لەنووسین شێوازێکی نوێی لەرۆمان و ئەدەبی عەرەبی دروستکردووە بەرێکەوت رۆمانێکی ئەوم بینی بەناوی (پاسەوانی توتن) کە وامزانی باسی توتن و ئەو شتانە دەکات کە خوێندمەوە دەبینم باسی پیاوێکی جوو دەکات کە لەساڵی پەنجاکان لەبەغدا بۆ ئیسرائیل راگوازراوە کە چیرۆکەکەی بەلامەوە زۆر سەرنجراکێش بوو، بۆیە رۆمانەکەم وەرگێڕا بۆ سەر زمانی کوردی کە ١٠ تا ١٢ رۆمانی ئەو نووسەرە عەرەبەم وەرگێڕا وەکو (چراکانی ئۆرشەلیم) و (غاردان بەدوای گورگەکان)، لەدوای ئەوە هاتمە ناو وەرگێڕانی زۆر لەرۆمانی ژنە رۆماننووسە عەرەبەکان و بیانیەکان کە نزیکەی ١٥ رۆماننووسی ژنن کە باسی مەینەتیەکانی خۆیان دەکەن ئەگەرچی چاپکردنەکانیان سنووردار بوون، بەڵام رۆمانی نایابن لەوانە رۆمانی (پۆستی شەو) کە هی ژنە رۆماننووسێکی لوبنانیە کە خەڵاتی (بۆکەر)ی بەهۆیەوە وەرگرتووە، هەروەک دوو رۆمانی ژنە رۆماننووسێکی جەزائیریشم وەرگێڕاوە کە باسی مەینەتیەکانی ژنی ئەمازیغی دەکات.

سەبارەت بەئەزموونەکانی دیکەی خۆی لەنووسین، دەشڵێت: لەهەندێک کتێبەکانم باسی ئەزموونەکانی ژیانی خۆم و باوکم و دایکم و گەرەکی سەیداوە و کارکردنم لەشارەوانی هەولێر کردووە کە باوکم بەهۆی ئەوەی پۆلیس بووە بە (ئەبو ئیسماعیل) ناوم هێناوە و باسی دەکەم یا باسی خۆم دەکەم کە سەرباز بوویمە بەناوی ئەبو خەلیل یا باسی ئەوکاتە لەژیانی خۆم دەکەم کە کارمەندێکی رووپێوو بوویمە، هەروەک باسی خۆم دەکەم کە ناچارم کە بەناوی (مەجبور) چاپم کردیە جگە لەمانە لاپەرەی رەشی شەڕی ناوخۆشم بەچوار نامیلکە نوسیوەتەوە کە یەکەمیان (لەهەولێرەوە تا دبلن) بوو کە باسی سەرەتای یەکەم تەقەی شەڕی ناوخۆ تا کۆبوونەوەی ئاشتی دبلن دەکات ئەوی دیکەیان (لەهەولێرەوە بۆ بەغدا) کە بەسەرهاتی ئەو رۆژانەی تێدایە تا رۆژی ٣١ ی ئابی ١٩٩٦، یەکێکی دیکەیان بەناوی (پایزەساڵ) بوو کە باسی ساڵانی ١٩٩٣ و ١٩٩٤ دەکات کە ئەوکات هەولێر پایزە ساڵ بوو کە ئاردمان بەکیلۆ و رۆنمان بەنیو کیلۆ دەکری ئەو مەینەتیانەی کە بەنزین بەدەبە دەفرۆشراو ئاویان تێدەکرد.

سەبارەت بەئەزموونی داهاتووی نووسینی خۆی، هەینی ئاشکرای دەکات بڕیاریداوە ١٢ کتێب لەسەر کەسایەتی هەولێر بنووسی گوتی: چواریان چاپکراوە وەکو (یەکەم دەرمانسازی شۆڕشی کوردستان) و ئەوەی فەرهاد عەونی و نەوزاد باجگر، کتێبی پێنجەمیش ئێستا کاری لەسەر دەکەم کە هەمووشیان تەنیا سەبارەت بەخۆیان نانووسمەوە، بەڵکو لەسەر شاری هەولێریش دەیانووسمەوە.

هەروەها لەسەر کەسایەتی جەمال عەلەمدار کە یەکەم هەولێریە لەوڵاتی سوید نووسیومە کە زۆر وڵات گەڕاوە، ئێستاش پرۆژەیەکی دیکەم لەبەردەستە لەسەر پیاوێکی جوانی تەیراوەیە کە باس لەساڵانی حەفتاکانی پارتی و تەیراوە و شاری هەولێر دەکات، بۆیە ئەو کارانەی بیرەوەری ئامادە دەکەم، چونکە دەزانم خەڵکی ئێستا بەزۆری بیرەوەری دەخوێنێتەوە، بەلام ئەو بیرەوەرییە وشکانە نا کە وەکو راپۆرت نووسراون کە ئەوە بیرەوەری نییە، بۆیە دەبێت کەسایەتیەکان کاری نووسینی بیرەوەری بدەنە نووسەرەکان وەکو هەموو ولاتانی جیهان کە کەسایەتییە گەورەکان ئەوانەی بیرەوەریان هەیە خەڵکی دیکە بۆیان دەنووسێتەوە، چونکە تۆ نووسەر نیت و ئەزموونت نییە و خەیاڵت نییە کە خەیاڵیش بۆ نووسین زۆر گرنگە.

**• سەعات ١١ی رۆژی ٢٠٢٣/١٠/١٤ لەساڵۆنی لاپەڕە نوێ ناوەندی هەولێری مەکتەبی راگەیاندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان کۆڕێک بۆ نووسەر و رۆژنامەنووس و وەرگێڕ (شێرزاد هەینی) بەناونیشانی (لەئەزموونێکەوە بۆ ئەزموونێکی نوێ) بەڕێوەچوو**

# ساڵۆنی لاپەڕە (٩)

ئا: ڕەوەست نەوزاد

**لە درێژەی کۆڕەکانیدا ساڵۆنی لاپەڕە ٩ی ناوەندی هەولێری مەکتەبی ڕاگەیاندنی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە ماوەی ٢٠٢٣/١٠/٢٨ تا ٢٠٢٣/١١/١٨ ئەو کۆڕانەی ڕێکخست:**

## ٢٠٢٣/١٢/٢٣



مەراسیمی ناساندن و بڵاوکردنەوەی کتێبی (دەر و دراوسێی کوردستان) لەنوسینی نووسەر بورهان شێخ ڕەئوف




## ٢٠٢٣/١٢/١٦

**مەراسیمی ناساندن و بڵاوکردنەوەی کتێبی (دەروازەیەک بۆ ئەختەرناسی)**







لە سەرەتای کۆڕەکەدا سەلاح شێخ شەرەف باسی لە بیرۆکەی دەرچوونی کتێبی دەروازەیەک بۆ ئەختەرناسی کرد. پاشان نووسەر حاکم پێشرەو سەید برایم باسی لەناوەڕۆکی کتێبەکە کرد.

## ٢٠٢٣/١٢/٩



**مەراسیمی ناساندن و بڵاوکردنەوەی کتێبی (دلشاد ئەحمەد، سەربوردەی بەرنامە ٣١ ساڵییەکەی دەگێڕێتەوە)**






## ٢٠٢٣/١٢/٢




ـەڕاسیـمـی
ـاسـانـدن و
ـلاوکـردنـەوەی
کتێبی (قـەدەری
کـەرکـوک) لە
ـووسینی نووسەر
گۆران فەتحی




## ٢٠٢٣/١١/٢٥




مـەڕاسـیـمـی
نـاسـانـدن و
بـلاوکـردنـەوەی
کتێبی شیعری
(من) لە نووسینی
دلزار حەسەن

## ڕاستکردنەوەی وەڵامێک

لەگۆشەی (پرسیار)ی ژمارە (٢٧)ی گۆڤاری دیوان، لەوەڵامی چیرۆکی گۆرانی (پەری) کە شیعری (جەمال شارباژێڕی)ە، لەوەڵامی ئەو پرسیارە هونەرمەند (حەمە ڕەئوف) سەرەتا دەڵێت: (پێش من هونەرمەندان کەریم کابان و حەمە جەزا بەمەقام وتویانە) بۆ ڕاستکردنەوەی وەڵامی هونەرمەند بە پێویستم زانی ئەو ڕاستییە بخەمەڕوو، کە هونەرمەندی نەمر حەمە جەزا ئەو شیعرەی بەمەقام نەوتووە، چونکە ئەرشیفی حەمە جەزا لای منە و کتێبی (چریکە و سۆزی حەمە جەزا) کە سەرجەم گۆرانی و مەقام و سروودەکانی لەخۆ دەگرێت و لەکۆکردنەوە و ئامادەکردنی منە، هەر بۆ زیاتر دڵنیابوونیش پەیوەندیم بەهونەرمەند هونەر حەمە جەزا کرد ئەویش گوتی بەهیچ شێوەیەک و لەهیچ بۆنەیەک ئەم شیعرەم بەدەنگی باوکم نەبیستووە.

**عەبدولواحید ئیدریس**

## وەڵام و ڕاستکردنەوە

لە ژمارە (٢٨)ی گۆڤاری سەنگینی دیواندا بابەتێک بە ناوی (ئەو شیعرەی لە دیوانەکەیدا نییە) بەپێنووسی (نەوزاد) بڵاوکراوەتەوە. نووسەری وتارەکە پشتی لەوە دەکات کە ئەو شیعرەی ئەو لە گۆڤارەکە بڵاویکردۆتەوە، لە دیوانەکەی شاعیری دیار، جەلالی میرزا کەریم نییە، بە پێچەوانەوەی بۆچوونەکەی ئەو، لە لاپەڕە (٢١٤) ی دیوانەکەدا بڵاوکراوەتەوە و بەشێکە لە شیعرێکی درێژ بە ناوی (ئەڵاویست).

**سەدیق سەعید ڕواندزی**

## ڕوونکردنەوەیەکی پێویست

لە لاپەڕە ١٦ای ژمارە ٣٠ی گۆڤاری دیوان لە بابەتەکەی

عەبدولڕەقیب یووسف لە دۆسیەی دیوان، سەبارەت بە ئیسماعیل سەرهەنگ، لەسەرەتای بابەتکە، بە هەڵە کۆپلە شیعرێک بە ناوی عەبدولڕەقیب یووسف بڵاوکراوەتەوە، کە هی ئەو نییە، بەڵکوو هیوا سەرهەنگ-ە

**گۆڤاری دیوان**

# شیعر چییە؟

گەر بپرسن وەزیفەی شیعر چییە؟ دەکرێ بڵێین، دۆزینە و کەشفکردنی نهێنییە شاراوەکانی ژیان و گەردوونە، ئەرکێکی سەرەکی شیعرە، لە بۆتەی زمانێکی تایبەت کە پێیدەگوترێ زمانی شیعریی، زمانێک کە هەر شاعیر پێی ئاشنایە و دەیزانێ.

جا دۆزینەوەی نهێنییەکانی ژیان و گەردوون، کە ئەمەش بەبێ نغرۆبوون لە جیهانی عیرفانی شیعر، بەبێ گەیشتن بە تۆقەڵەی زمانی پاکی شیعر، زمانێک کە فەرهەنگی نییە؛ بەبێ جیاکردنەوی حەقیقەت لە خەیاڵ؛ بەبێ خوێندوەی سۆفیگەرانەی سرووشت بەهەموو پێکهاتەکانییەوە لەنێویاندا پێکهاتە رۆحییەکان، زەحمەتە

بۆیە ناسینەوە و پێناسەکردنی دەقی شیعری رەسەن و شاکار زۆر لەوە زەحمەتترە بە چەند پەیڤێک بکرێ چ لە دارشتنی دەقەکە و چ لە رەخنەلێگرتندا.

ئەم خاڵانەی سەرەوە هەموویان کلیلی داهێان و ئەفراندنن لە شیعردا، داهێنانێک کە هەزار و یەک دەرگا و هەزار و یەک کلیلی هەیە و قەت هیچ سنوور و تخوبێکی نییە و نەبووە، بەقەد والایی و فراوانیی گەردوون والا و فراوانە.




جا گۆرینی ئەو واقیعە بۆ شێوە و روخسارێک، کە پێشر بوونی نەبووە، بە هەموو وێنەکانییەوە، هەر بە هونەر دەکرێت، بۆیە جائیزە، ئەگەر بڵێین، پەیامی شاعیر، پەیامێکی پێغەمبەرانەیە، چونکە گرنگیی بە ژیان و ئایندەی مرۆڤ و بوونەوەر و گەردوون دەدا.

لەپال ئۆرگانە بنەرەتییەکانی دیکەی شیعریش ئەم سێ ئەستوونگە بەهێزە، بونیادنەر و ئامرازی داهێنانی دەقی شاکارانەن: سۆز، هزر و سرووشت. لێرەدا هەست، سۆز و سرووشت لەنێوان دەقنووس و پەیامگردا هاوبەشن (خوێنەر، بیسەر، بینەر) چونکە هەردوولا هەمان کۆئەندامی هەستەوەریان هەیە و لەهەمان سرووشتیدا دەژین، جوانیی و دلگیری، یان تەڵخیی و رەزاقورسییەکەی (ئەو سرووشتە) دەبینن.

کەواتە جیاوازییەکە لە هزر، شێوازی بیرکردنەوە و خوێندنەوەی شتەکانە بە گوێرەی ئاستی ژیریی و رۆشنبیریی و ئەقڵەمەندیی دەقنووسەکە.

لە جێی خۆیەتی، ئەگەر بڵێین، هەر شاعیر و ئەدیبێک، سرووشت وەلاوە بنێ، یان بایەخی پێنەدا، بەرهەمەکەی نەزۆک و زڕ و پووچ دەبێ.

بۆ نموونە لە شیتەلکاریی رەخنەکارانەی دەقە شیعرەکانی ئەدۆنیس تێدەگەین، کە بەرهەمەکانی ئەو لە بەرهەمی کەسییەوە تخوبی رووداوەکانی بەزاندوە و گەیشتووەتە جیهانی ئاشکراکردنی نهێنییەکان و هەستکردن بە قووڵایی لایەنە شاراوەاکانی، بەپێی دیدگای کەسیی پاکی خۆی، بە زمانی شیعریی خۆیەوە بە سەرچاوەگرتن لە گەردوونەوە.

جا سرووشتیش ئەو سرووشتەی هەستی پێدەکەین، تەلەسمێکی ئەو گەردوونە بێ سنوورەیە. دەبێ ئەوەش بگوترێ، کە دەقی شیعریی، لە تایبەتمەندییەکی دینامیکی کارلێککارانە لەنێو خەیاڵدانی دەقنووسدا سەرهەڵدەدات، شیعرییەتێک، کە بە یەک توخم لە دەقدا رازی نییە بۆ ئەوەی تیشک بخاتە سەر تایبەتمەندییەکانی، بەڵکوو لە رێگەی پێکهاتەکانەوە، کە کۆی پێکهاتەکانی جیهانی شیعر و گەردوونن، پابەند دەبێت، چونکە شیعر بەشێکە لەم گەردوونە.

فازیل شەوڕۆ

# فۆتۆسکان




- هەنگاویکی بەرز -

عارەب عبدالقهار گەلالی

لەناو تاریکی سەختی شەو
هیوای مرۆڤ بزووت لەخەو
بلێسەی سەندو کەوتە گڕ
تیشکی پەقوا ناکاو لەبڕ.
فرشتەی زانین بوو بەنیازی
گلپەی بەرزی و سەرفرازی
چرای گەشی وەکوو مەشخەڵ
ڕەونەقی کرد ئەستۆی کۆمەڵ
بچڕی پەردەی گێژاوی خەم
بڕی ڕێگای جەور و ستەم
هەر ئەو دەمەی مانگی دەستکرد
شاڵاوی بۆ ئاسمان دەبرد
بەزانستا هاتە جیهان
گەردوون هەڵچوو تەقی بەژان
ئەو مانگی هاوسەری زەوی
گشت شەوێ دەهاتە خەوی
ئەوسا ئەویش بەناچاری
تەکانی دا بەیەك جاری

— ٤٢ —

رەهێلە: گۆڤارێکی رۆشنبیری و پەروەردەیی ساڵانە بووە، خوێندنگەی دواناوەندی کورانی هەولێر دەریکردووە.

دەستەی نووسەرانی بریتی بووە لە: عەبدولڕەحمان ئەلسەعدی مامۆستای زمانی کوردی. عوسمان حەمەد دەشتی، سکرتێری لێژنە.

ئەندامانی لێژنەش بریتی بوونە لە: دڵشاد عەبدوڵلا. تارق حوسێن. ڕەهبەر جەلال مامش.

ژمارە ١، ساڵی ١٩٧١ دەرچووە و بریتییە لە ٥٦ لاپەڕە. لە چاپخانەی کوردستان لە هەولێر چاپکراوە، هەر تەنیا ئەم ژمارەیە لە رەهێلە دەرچووە.

* عارەب عەبدولقەهار گەلالی، کاردۆ گەلالی-یە

